منتدى إقرأ الثقافي

# ئینسایکلۆپیدیای کەرکوک

www.iqra.ahlamontada.com

## هونەر لە دەڤەری کەرکوک

سەرپەرشتیاری گشتی نووسین و پێداچوونەوە

سمکۆ بەهرۆز (ئەژی)

بەرگی پێنجەم

# ئینسایکلۆپیدیای کەرکوك

بەرگی پێنجەم

## هونەر لە دەڤەری کەرکوك

سەرپەرشتیاری نووسین و پێداچوونەوە
سمکۆ بەهرۆز (ئەژی)

٢٠٢٣

دەزگای رۆشنبیریی جەمال عیرفان

بڵاوکراوەکانی دەزگای رۆشنبیریی
جەمال عیرفان ٢٠٢٣
زنجیرە: (١٤٢)

بەڕێوەبەری دەزگا:
سیروان حەمەسەعید حەمەخورشید

**ناوی کتێب: ئینسایکلۆپیدیای کەرکوك- بەرگی پێنجەم: هونەر لە دەڤەری کەرکوك**
**بەشداران: سمکۆ بەهرۆز (ئەژی)- تاریق کارێزی - سەلاح شوکر - زاهیر شکور - چالاك سدیق - ئومێد نەجم**
**پێداچوونەوەو پێشەکی بەشی شێوەکاری: بەختیار سەعید.**
**سەرپەرشتیاری نووسین و پێداچوونەوە: سمکۆ بەهرۆز (ئەژی)**
**سەرپەرشتیاری زانستی و ئەکادیمی: د. یوسف گۆران**
**سەرپەشتیاری کارگێڕی: زاهیر شکور**
**دیزاینی ناوەوە: بورهان عەبدولکەریم عەلی - ئەنجام سەعید**
**دیزاینی بەرگ: ئارام عەلی**
**تایپ: بێریڤان پیشتیوان - زەینەب حەمید**
**نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم: ٢٠٢٣**
**تیراژ: ٥٠٠ دانە**
**چاپ: چاپخانەی تاران**

**لە بەڕێوەبەرێتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارە سپاردنی**
**(٢٠٠٧)ی ساڵی ٢٠٢٠ پێ دراوە**

Tel: 0533202936 07736959302
email: jamalerfan99@gmail.com
jamal erfan cultural foundation
www. jamalerfan.com

ناونیشان: سلێمانی، شەقامی سالم، بەرامبەر قەیوان تاوەر

# ئینسایکلۆپیدیای کەرکوک

## بەرگی پێنجەم

# هونەر لە دەڤەری کەرکوک


بەشداران:

سمکۆ بەهرۆز (ئەژی)

چالاک سدیق

تاریق کارێزی

سەلاح شکور

زاهیر شکور

پێداچوونەوەو پێشەکی بەشی شێوەکاری:

بەختیار سەعید



٢٠٢٣

## بەشی یەکەم

# مێژووی گۆرانی و مۆسیقا لە کەرکوك

سمکۆ بەهرۆز
چالاك سدیق
زاهیر شوکر

کەرکوکیش وەکو هەموو ناوچەکانی تری کوردستان خاوەنی مێژوویەکی دوورو درێژە لەگۆرانیو مۆسیقاداو، تاڕادەیەك کەلەپورێکی فراوانی هەیە لەم بوارەداو تواناکانی لەبەر چاوە لەسەر هەموو ئاستەکانیدا.

هەموو سەرچاوەکان پا دادەگرن لەسەر ئەو ڕاستییە کە کوردستان شوێنێکی دەوڵەمەندە لەگۆرانیو مۆسیقاو جێ پەنجەی دیارە لەمێژووی گۆرانیو موسیقای سەرتاپای مرۆڤایەتیدا.

کەلەپووری گۆرانیو مۆسیقای ناوچەی کەرکوك خاوەنی خاسیەتێکی دیاری کراوە لەکەرەستەو ئامرازە مۆسیقییەکانو گۆرانییەکانی خاوەنی زمانو توانایەکی چاکی هەیە بۆ پێگەیاندنی گۆرانیو مۆسیقا لەو ناوچەیەدا.

قۆناغەکانی گۆرانیو مۆسیقا لەناوچەی کەرکوکدا دابەش بۆتە سەر گۆڕانە مێژووییەکانو کاریگەری ئایینەکانیش جێ پەنجەی بەدیارە لەسەر دەوڵەمەند کردنی گۆرانیو مۆسیقا ئەو کاریگەرییە بەدەردەکەوێت لەسەر بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیجیو ئایینی زەردەشتیو ئایینی ئیسلامو بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕە ئایینیەکانی کاکەییەکان.

### * بڵاوبوونەوەی مۆسیقا لەسەردەمی گۆتیو هوری - میتانییەکان لە ناوچەی کەرکوکدا:

گەلێك بەلگەی مێژوویی ئەوە دەخەنە ڕوو کە کوردستان جێگەی بڵاوبوونەوەی کەرەستەو ئامرازە مۆسیقییەکانەو لەوێوە بەرەو ناوچەکانی تر گەشەی کردووە.

((... لەم ڕووەشەوە دەزانین کە هوری - میتانیو گوتییەکان، دانیشتووانی مێژینەی پێش میدییەکان بوونو ئەمانیش خاوەنی هونەری بەرزی مۆسیقا بوون، بەتایبەتیش هورییەکان، بۆیە لەم بوارەدا شوێنەوارناسی ناسراوی ئەڵمانی شتاوەرد، کە پسپۆڕێکی دێرینزانە، لەبنەچەی ئامێرەکانی مۆسیقادا، لە نەخشو نیگارە کۆنو گلێنەو بەردینەکاندا، بەلێکۆڵینەوە سەلماندوویەتی کە عود، یەکێکە لەو ئامێرە مۆسیقاییانەی تایبەتمەندە بەخەڵکی کوێستانو چیانشینەکانو بەتایبەتیش هورییەکان، کە هۆزێك بوون (١٥٠٠) ساڵ بەر لە بڵاوبوونەوەی ئایینی عیسایی لەدەوروبەری زەریاچەی وانو دامێنی ئەو زەریاچەیەدا نیشتەجێبوون، تادەگاتە باکووری ئێستای عێراق (کوردستانی ئەمڕۆ) و دراوسێی نزیکی شوێنی دواتری میدییەکانو ئەوان ئەو ئامێری مۆسیقایەیان داهێناوەو هەر ئەوانیش لەدامێنی کوردستانی باشووردا بڵاویان کردۆتەوە.

ئەم قسەیەشمان لەئەنجامی دۆزینەوەی شوێنەواری ئەو ئامێری عودەدا هاتووە، کە لەناوچەی (نوزی) نزیك کەرکوك دۆزراوەتەوە، کە دەکەوێتە ٤-٥ کیلۆمەتری خۆرئاوای شاری کەرکوکەوە.

شوێنەواری عودەکەش کە لەسەر پارچە گلێکە، وێنەی عودژەنێکە، عودەکەی بەشێوەیەکی ئاسۆیی بەدەستەوە گرتووەو خەریکی عود ژەنینە.

بۆیە لێرەدا بەڕاشکاوی دەڵێین کە کەرکوك مادام کەرەستەی مۆسیقای لێ دۆزرابێتەوە، گۆرانیش ڕۆڵی کاریگەری خۆی هەبووە چ لەسەر ئاستی خەڵکەکە یان لەسەر ئاستی پەرستگاکانی ئەو کاتەدا لە پەرستگاکانی کەرکوك لە (نوزی)و کوڕوخانیدا، بەبێ سێو دوو مۆسیقاش لەگەڵ سرووتە ئایینیەکاندا برەوی هەبووە، بەتایبەتیش ئایین لەسەردەمی هوری - میتانیدا گەیشتبووە ئاستێکی بەرز لەکەلەپووری هوری - میتانی.

کەرکوك بەهۆی تایبەتمەندی شوێنەکەی لەڕووداوە مێژووییەکاندا لەگەڵ خۆیدا کاریگەرییەکی گەورەی دروست کردووە لەگەشەکردنی شێوە جۆربەجۆرەکانی شارستانیو کەلەپوورو هەمەڕەنگی هەموو لایەنەکانی لەبۆتەی ئەو کەلەپورانەدا.

گۆرانی ڕابردوویەکی دێرینی هەیە کە شان بەشان مۆسیقا مرۆڤ لەم شارەدا چڕیوێتیو لەگەڵ پێشکەوتنی کەلەپوری مۆسیقا گۆرانیش گۆڕانو پێشکەوتنی بەسەردا هاتووە، زەمانەکانی گۆرانیو مۆسیقایش لەگەڵ ئەو گۆڕانانەدا هەنگاوی ناوە.

سەردەمەکانی ئاشووری، کاشی، (ماد - میدییەکان)، ساسانیەکان هەریەکەی هەڵگری مێژوویەکی دووروودرێژ بووە لەگەشەکردنی گۆرانیو مۆسیقادا هەر سەردەمێکی تایبەتمەندییەکی خۆی

**عودژەتێکی سەردەمی هوری میتانییەکان کە لە ناوچەی نوزی دۆزرایەوە لە دەروبەری ١٥٠٠ پێش زاین**

هەبووە کە تاڕادەیەك جیاواز بووە لەوی تر، بەتایبەتیش بڵاوبوونەوەی کەلەپوری میدییەکان و بڵاو بوونەوەی ئایینی زەردەشت و سەر هەڵدانی ئاتشکەو تەراتیلەکانی زەردەشت و سرووتەکانیان بەکار هێنانی مۆسیقا لە دوعاو تەراتیلەکاندا.

بڵاوبوونەوەی ئاتەشکەیەکی زۆری زەردەشتی لە کەرکوك و دەوروبەری کەرکوك بەڵگەیەکی بەهێزە بۆ بڵاوبوونەوەی کەلەپوری زەردەشتی لەو ناوچانەدا کە لەگەڵ خۆیدا تەراتیل و مۆسیقاو گۆرانی بەکار هاتووەو لقێکی هاو پەیوەستی ئایینەکە بووە. هەروەها بەڵگەیەکی زۆرمان هەیە لەبڵاوبوونەوەی ئاتشکەکان و تەلارسازی ئاتشگەکان لەکەرکوك و کفری و خورماتوودا. کە هەمووی بەڵگەی سەلمێنراوی هەیە کەلەو ناوچانەدا هەبووە.

((ئەوەندەش پێوەندی بەهونەری مۆسیقای ڕۆژگاری دەسەڵاتی (ماد)ەوە هەبێت، وەك مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە، مۆسیقا جێگەیەکی بەڕێزو هێژای هەبووەو لەزۆر بۆنەی ڕەسمیی و میللیدا بەکار براوە... ئەو کاتەش کە دیاکۆی یەکەمین پاشای ماد چووەتە سەر تەختی شاهی، لەلایەن جەماوەرو مۆسیقاژەنانەوە کراوەتە جەژن و شادی و کوس و شەیپووریان ژەندووە.

یان کاتێ کە (فرەوەرتیش) ی پادشای ماد، لەجەنگێکی نابەرامبەردا، بووە بەژێر گالسیکەی ئاشوورەکانەوە، لەئێراندا کراوە بەپرسەو ئامێرەکانی (کوس)و (شەیپوور)، مۆسیقای خەمینیان ژەندووە... ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، کە لەو ڕۆژگارەدا، زمانگۆی پرسەو خەم و شادی، هەر بەمۆسیقا هێمای پێکراوە)).

بڵاوبوونەوەی ئایینی زەردەشت لەسەرووبەندی دەوڵەتی مادەکانداو بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕەکانی لە گاتا و ئاڤێستاداو بەکار هێنانی سروودو مۆسیقا لەچراندنی (گاتا)کاندا دەورێکی کاریگەرییان بینیووە لەبەکار هێنانی کەرەستەی مۆسیقی لەئاتشگەکاندا.

((... ئەو ئاتەشگەوانەی کە لەکوردستاندا، دامەزرێنران و تا ئێستاش شوێنەواریان ماوە، ئەمانەن:- ئاتەشگەدەی پاوەی هەورامان کە لەسەر بڵندترین کێوی باشووری خۆرهەڵاتی پاوەیەو ئاتەشگەدەی ناوچەی ڕێژاو حەلوان و قەسری شیرین، ئاتەشگەدەی مەزنی (ئازەرگشنسب)ی ناوچەی تەختی سلێمان و ئاتەشگەدەی بیارەی هەورامان و لەم دوو ساڵەی دواییشدا لەنزیك (سورداش)ی لای سلێمانی، لەجاسەنەو ویسان لەنێوان سلێمانی و کەرکوکدا، لەبناری کێوەکانی دەربەند بازیان..)).

هەروەها بەڵگەکان ئەوە دەخەنە ڕوو کە ئەو کۆمەڵە ئەشکەوتەی لای چیایەکانی دەوروبەری کفری بەڵگەی بەهێزن بۆ بوونی ئاتەشگەردە لەو ناوچەیەدا، هەروەکو ئەگەر لەدوا ڕۆژدا هەڵکۆڵینی تر بکرێت لەناوڕۆژچەکانی کەرکوکدا ئەوە پاشماوەی تریش دەدۆزرێتەوە.

لەدوای ماوەی مادەکان و فەرمانڕەوایەکانی لەوەو دوای قۆناغە مێژووییەکان دوورونزیك بایەخ بەمۆسیقا دراوەو زیاتر لەگەڵ سرووتە ئاینییەکاندا بەکارهێنراوەو لەو سەردەمەدا گەلێك کەرەستەی مۆسیقی جۆربەجۆر بەکار هێنراوە.

### * مۆسیقاو گۆرانی دوای هاتنی ئایینی ئیسلام:

((... لە سەرەتادا، ئایینی ئیسلام بەئاسانی نەیتوانی جێگەی خۆی لەنێوان کورداندا بکاتەوە، چونکە کوردەکان لەوەرگرتنی ئەم ئایینە تازەیەدا، خۆیان لێ دەپاراست و دوورە پەرێز بوون، چونکە لەبەر ئەوەی کوردان گەورەترین پشتیوانی شاهەکانی ساسانی و دامودەزگاکانی دەوڵەتی ساسانی بوون.. هەر بۆیە پاشای ساسانیەکانیش بۆ ناوچە کوردنشینەکان هەڵدەهاتن.

هەر بەو جۆرەش لەسەردەمی عومەری کوڕی خەتابی خەلیفەی دووەمی ئیسلام، ترس و سڵی ئەوەی هەبوو نەتوانرێ کێوە سەختەکانی کوردستان داگیر بکرێ، یان لە ڕێگەی سوریەو

جەزیرەوە هێزو یارمەتی بۆ پشتیوانی لەشکری ساسانی بگات.

بۆیە لەساڵی هەژدەی کۆچیدا (عەیاز کوڕی غانم) بەفەرمانی سەعد کوڕی وەقاس، بەسێ لەشکرەوە بۆ سەر سێ قۆڵی ناوچەکانی جەزیرە نێردرا.

هەر لەهەمان ساڵداو لە قۆڵێکی ترەوە، لەشکری ئیسلام بەسەرکردایەتی (عەزرە کوڕی قەیس) بەرەو شارەزوور نێردرا، بەڵام بەرەنگاری سەختی کوردان، لەشکری ئیسلامی ناچار کرد پاشەکشێ بکەن، عومەریش ناچار بوو دووبارە لەشکری تر بەسەرکردایەتی (عەقبە فەرقەد ئەلسلمی) بۆ شارەزوورو سامگان بنێرێتەوە، کە لەم جارەیاندا دوای شەڕێ سەختو خوێنینو قەڵاچۆی کوردان، شارەزوور داگیرکرا)).

بۆیە هەر لەدوای ئەو سەردەمەوە وردە.. وردە هەموو ناوچەکانی کوردستان بەکەرکوکیشەوە کەوتە ژێر رکێفی سوپای ئیسلام لەلایەن فەرمانڕەواکانی دەوڵەتە ئیسلامیەکانەوە بەرێوە دەبرا، هەروەها بەپێی سەردەمو قۆناغە مێژووییەکان بەربەرەکانی کوردانو تاڵانکردنی وڵاتی کوردان لەلایەن فەرمانڕەوایانی ئیسلامەوە بەردەوام بوو.

((پێش ئایینی ئیسلام، کە ئایینی زەردەشت بووەو ئەمیش چونکە رێزو گرنگی زۆری بۆ مۆسیقا داناوە، بۆیە رەگو ریشەی مۆسیقا، لەهەندێ لەم ناوچانەداو بەتایبەتی لە ناوچەکانی هەورامانو ئازەربایجانو لورستاندا، شوێنی پێ لەق نەکراو دواتریش هەر ئەم مۆسیقایە، واتا ئەو مۆسیقایەی لەدێرزەمانەوە لەو ناوچانەدا رێزلێگیراو بووە، بەجۆرێکی تر، کە ئایینی ئیسلام پەسەندی بکات، گەیشتە ناو ئیسلامیش، یان بەواتایەکی تر، مۆسیقای کۆنی ئێران، زەبرو جێ پەنجەی خۆی، لەناو ئیسلامیشدا رەنگی دایەوە، بەڵام نەك بەو جۆرەی لای پەیڕەوانی ئایینی زەردەشتو دواتریش لای ئەهلی هەق هەبووە، کە لە ئاتەشگەدەو جەمخانەکاندا بەکاریان هێناوە، بەڵکو هەر لەکۆڕی زیکرو مەولود نامەو میعراجنامەدا، کەڵکیان لێوەرگرت، کە لەسەرەتادا تەنیا تەپڵو دەفیان لەو ئامێرانەی مۆسیقای پێش خۆیان وەرگرت، کە لەمزگەوتو خانەقاکاندا کەڵکیان لێ وەرگرتو بەکاریان هێناوەو دواتریش وردە وردە ئامێرەکانی تری وەك (عوودو تەنبووری) یشیان تێکەڵ مناجاتو (تواشیح)ی ئایینی کرد، کە دەتوانین بڵێین ئەو مۆسیقایەی ئایینی ئیسلام پەسەندی کرد، شەقڵو مۆرکی مۆسیقایەکی ماتو خەماوی بوو، لەکاتێکدا مۆسیقای پەیڕەوانی ئایینی زەردەشت، شادی هێنەرو خەمرەوێن بوو، کە تا ئێستاش هەوێنو ڕوحی ئەو شادیو بەزمو خۆشییە لە هەڵپەرکێو زەماوەندو گۆرانیو بەستەو جلوبەرگی ئاڵو واڵای ئافرەتو پیاوی کوردو زەوقی کورد، لە ڕەنگە زەقەکاندا، وەك خۆی ماوە.

ئایینی زەردەشتیش چونکە وەکو وتمان، هەوێنەکەی مۆسیقا بوو، بۆیە بێ سێو دوو، لە (٤٥٠) ساڵەی ماوەی حوکمڕانی شایەکانی ساسانیدا مۆسیقای ساسانییش، یان ڕوونتر مۆسیقای زەردەشتیش، زەبرو جێ پەنجەی خۆی، لەسەر دەورووپشتی خۆی کردووە، بەتایبەتیش لەسەر مۆسیقای عەرەبیو ئیسلامی، چونکە لەکاتێکدا پایتەختێکی ساسانی لەتەیسفوێن بوو.

بەڵام لەسەرەتای بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلامدا، عەرەبەکان خۆیان بەو هۆیەوە کە سەرگەرمی بڵاوکردنەوەی ئایینی ئیسلامو کاروباری جەنگو داگیر کردنی وڵاتانی دراوسێو هەرێم گەلی فراوان بوون، بۆیە کاری مۆسیقایان، لەخوار پلەی کاری جەنگەوە داناوەو مۆسیقاو زانایانیان بەدەستەیەکی تایبەت زانیوەو بەپێچەوانەی پلەی گۆرانی بێژو مۆسیقازانانی ساسانییەوە، کە بەشێوەیەکی ڕەسمی، پلەی باڵایان دراوەتێ، کە چی گۆرانیبێژانو مۆسیقازانانی ناو کۆمەڵگای سەرەتای ئیسلام، بەچاوی رێزلێناوە سەیریان نەکراوە، کە ئەم ماوەیە نزیکەی ١٢٠ ساڵێکی خایاندووەو ئەو ماوەیە بووە، کە وتمان پێشەوایانی عەرەب، سەرقاڵی پیادە کردنی ئایینی ئیسلامو لەشکرکێشیو کاروباری جەنگ بوون.

لەسەرەتای بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلامدا، ئامێرەکانی مۆسیقای وەکو تەپڵو دەفو عوود (بەربەت)و تەنبوور بوون، ئینجا لەدوایدا (شمشاڵ)یش لای ئرادەیسلام حەرام نەکراو بووە ئامێرێکی وا، کە لەسەرتا سەری هەرێمە گەلی ئیسلامدا بەکار براوە.

"هەر لە سەرەتای سەدەی یەکەمی ئیسلامەوە موزیك جێگای مشتومڕ بووە لە بەینی زانایانی ئایینیدا لەسەر حەڵاڵو حەرام کردنی، ئەم بڕیارە پێچەوانەو دژ بە یەکە هەتا ئەمڕۆش بەردەوامەو بۆتە هۆی ئەوەی مەرەکەبێکی زۆر برژێتە سەر کاغەز بۆ بە گژداچوونەوەی یەکتری".

هەر بۆیە لەگەڵ فراوان بوونی ئیسلامدا تارادەیەك بایەخدان بەمۆسیقا دراوەو هەوڵ دراوە رێگای جۆر بەجۆر بەکار هێنراوە بۆ لێکۆڵینەوە لەمۆسیقا بەڵام لەو ئاستە نەبووەو بیروباوەڕی ئایینی ئیسلامیش رێگر بووە لەتەفسیرکردنی ،حەرام بوونی مۆسیقاو رێگەنەدان بەبەکار هێنانی لەسەر ئاستێکی فراوان.

### * بوونی موزیك لە ژیانی موسڵمانانو رۆڵی کورد لەم بوارەدا :

گەلێك لێکۆڵینەوەو بۆچوونی جۆراوجۆر دەگێردرێتەوە دەربارەی بوونی مۆسیقاو گرنگیو حەرامکردنی لە سەرەتاکانی بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلامدا، هەندێك لەو لێکدانەوانە لەو چوارچێوەیەدا خوول دەخۆنەوە کە پێویستی ڕۆژگار وای کردووە کە قەدەغەکردنی مۆسیقا لە پێناو چوارچێوەی بڵاوبوونەوەی ئایینەکە بووە، بەڵام لە دوایدا بایەخدان پێی خۆی دەبینییەوە لە پێویستی پێداگری دەوڵەتە ئیسلامییەکان بۆ پێویستی ئەو ڕۆژگارە، هەر وەکو ئەوەی (بوخاری)و (موسلم) باسی دەکەن:

"رواه البخاري ومسلم:

عن عائشة ان ابا بكر دخل عليها والنبي (صل الله عليه وسلم) عندها يوم فطر او اضحى وعندها قينتان تغنيان بما تقاذفت الانصار يوم بعاث فقال ابو بكر: مزمار الشيطان، مرتين، فقال النبي (صل اله عليه وسلم): (دعهما يا ابا بكر، ان لكل قوم عيدا، وان عيدنا هذا اليوم).

قال رسول الله (صل الله عليه وسلم): (يا ابا موسى لقد اوتيت مزماراً من مزامير آل داود).

پێدەچێت هەر لەبەر ئەم هۆکارانەش لە کاتی خەلیفەی سێهەمی ئیسلامدا (عوسمان)و هەروەها لە کاتی ئومەوییەکاندا بایەخێکی تایبەت بە هونەری موزیك دراوەو موزیكو گۆرانی بەڕاشکاوانە لە ژیانی موسڵمانان بوونی هەبووەو بەرجەستەکراوە.

بەڵام لە سەرچاوەکانیشدا هاتووە کە لە سەردەمی هەردوو خەلیفە (عوسمانو ئەبو بەکر) موزیك قەدەغە بووە، هۆکارەکانی ئەم قەدەغەکردنەشیان لەو سەردەمەدا بۆ دوو خاڵ گەڕاندۆتەوە:

١. ئەگەری سەقاڵ كردنی موسڵمانانو دوورخستنەوەیان لە عیبادەت.

٢. سەرقاڵبونی دەسەڵاتی ئەوكات بە فتوحاتی ئیسلامییەوە، هەروەها تەرخان نەكردنی توانای ئابووری بۆ پشتگیریكردنی هونەری موزیكو گۆرانی، بەڵام نیشانەكانی خەریكبوونی هەندێك لە موسڵمانان بە هونەری موزیكەوە هەر هەبوون، دیارترین نموونە لە مێژووی ئیسلامدا پێشوازی كردنی پێغەمبەرە لەلایەن دانیشتوانی مەدینەوە كە چۆن بە گۆرانی (طلع البدر علینا)و ژەنینی دەف پێشوازی لێدەكرێت.

لە سەردەمی ئەمەوییەكاندا (٦٦١-٧٥٠) دەسەڵاتی ئیسلام باڵی كێشا بەسەر ناوچەیەكی پانوبەریندا لە ئیسپانیاوە تا سنووری چین، ئەمە بارێكی گونجاوی خولقاند بۆ گەشەسەندینی هونەری ئیسلامی بە تایبەتی هونەری موزیك لە سەردەكانی هەشتو نۆی زاینیی، لەم سەردەمەدا هونەری موزیك گەشەسەندنێكی بەرچاوی بە خۆوە بینی لە ناوچەی حیجاز بە تایبەتی لە شاری مەدینە، چەندین شێوازی گۆرانیگوتنو موزیك ژەنینی نوێ هاتنە نێو خەڵكەوەو زوربەی ئامێرە موزیكییە نوێییەكانیش ناوی عەرەبییان لێنرا.

سەردەی عەباسییەكان (٧٥٠-١٢٥٨) بە سەردەمی زێرینی هونەری ئەو ناوچەیە دادەنرێتو هونەری موزیك زۆر بە خێرایی گەشەی سەند، سوودێكی زۆر لە هونەری موزیكی گەلانی تری دراوسێ وەرگیرا، چاوگەكان باسی خەلیفە مەهدی دەكەن كە گوایە تەنانەت گروپێكی موزیكی تایبەت بە خۆی هەبووە كە ژمارەی ئەندامەكانی گەیشتوونەتە ٢٠٠ موزیسییۆنو لە كۆشەكەیدا خەریكی كاری موزیك بوون.

جێی سەرنجە كە لە سەردەمی عەباسییەكاندا ژمارەیەكی زۆر نووسینو كتێب دەربارەی موزیك بە ئەنجام گەیەنراون. شارەزایان ئەمە دەگەرێننەوە بۆ ئەو سیستەمە سیاسییەی ئەو كاتەی عەباسییەكان كە ناسراو بوو بە لێبوردەیی و هەوڵی پێكەوەژیان لەگەڵ ئەو میللەتانەی تازە هاتبونە نێو ئیسلامەوە. هەروەها پشتگیری دەسەڵاتو حوكمی ئەو كاتە لە زانستو هونەرو هەرواش پشتگیریو هاندانی ژمارەیەكی زۆری زاناو شارەزا كە بە رەچەڵەك عەرەب نەبوونو خەڵكی ئەو ناوچانە بوون كە دانیشتوانەكەی تازە ببون بە موسوڵمان.

بەم شێوەیە دەبینین كە هەوڵەكانی ونكردنی راستییەكانو شاردنەوەیان هەبووەو بەردەوامیشە بە ئامانجی شاردنەوەی ئەو راستیانەی كە دەیسەلمێنێت بەشی هەرەزۆری ئەو موزیكەی ئێستا لە ناوچەكەدا بەرجەستە دەكرێت لە رەچەڵەكەوە سەرچاوەكەی موزیكو كەلەپورو كەلتوری چەندین میللەتی جیاوازن بە تایبەتی گەلانی فارسو كورد.

زۆری ژمارەی زانا كوردەكانیش كە لەو سەردەمانەدا شارەزای ئەم بوارە بوونو جێدەستیان لە بواری پراكتیكو تیۆریدا دیارە خۆی لە خۆیدا بەڵگەیەكی ئاشكرای سەلماندنی ئەم راستییانەیە".

سەردەمی سەلجوقیو تەیموریو عوسمانیەكانو قەرەقۆینلوو ئاق قۆینلو، بایەخێكی ئەوتۆ نەدراوە بەگۆرانیو مۆسیقاو ئەم كاریگەرییەش رەنگدانەوەی خۆی هەبووە لەسەر گۆرانیو مۆسیقا لەكەركوكو كوردستاندا.

بەڵام ئەگەر سەیری سروشتی كوردستان بكەینو بڵاوبوونەوەی ئیمارەتە كوردییەكان تا رادەیەك سەربەخۆییەكیان وەرگرتبوو لەبایەخدان بەگۆرانیو مۆسیقاو ژیاندنەوەی دیوەخانی ئیمارەتەكان بەژیانەوەی ئەو گۆرانیو مۆسیقا رەسەنانەی كوردستان.

"بە گشتی موزیكی كوردی ئەم سەردەمە، هونەرێكی میلليو سادەو ساكاری خەڵكە هەژارەكە بووە، بۆیە لە ژێر ركێفی میرە كوردەكانیشدا هەر ئەم جۆرە هونەرە باو و لە بار بووە، ئامێرە

موزیکییەکانی بەکاریان دەهێنا زیاتر ئامێرە هەواییە سادەو ساکارەکان بووە وەکو: شمشاڵ، دووزەلە، باڵەبان، تەنبور".

هەروەکو ئەوەی ڕوونە گەلێك گۆرانی و مۆسیقاو هونەری مەقامات لەکوردستاندا برەوی سەندووە پەل و پۆیان بەهەموو ناوچەکاندا ڕۆیوە.

ئەگەر سەیری کەرکوك بکەین لە ماوەی بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام دەبینین کە لەگەڵ ئەو پێگەو سروشتەی تێدا هەڵکەوتووە، خاوەنی تایبەتمەندی خۆیەتی لەگۆرانی و مۆسیقاو هونەری مەقاماتدا.

کە هەریەکەی قۆناغێکی باشی بڕیوە لەپێگەیاندنی ژمارەیەکی زۆر لەکەسانی بەتوانا بۆ خزمەت کردن لەبوارەکانیاندا.

ئەگەر چاوێك بەو ماوەیەدا بخشێنین دەبینین گەلێك کەرەستە بەکار هاتووەو گەلێك ئامێر داهێنراوە لەخزمەت گۆرانی و مۆسیقادا لەوانە:-

دەف، قانون، چەنگ، روباب، کەمانچە، عود، تەنبور، (سور - کەرەنا)، ناتوور، سەنتور، نای، ساز، کوس، سورنا، نەفیرمێر، تەپڵ، خان و سازان، جەرەس، شمشاڵ، زوڕنا، بلوێر، باڵەبان، تۆلم.

"لە سەردەمی ئەم ئیمپراتۆرانەدا موزیك لەلای میرنشینە کوردەکان بە دوو شێوە بووە، یەکەمیان موزیکێکی سەربازی بۆ بۆنەکانی میرنشین کە ئامادە دەکرا لەسەر مۆدێلی سوڵتانەکانی عوسمان و شاکانی ئێران، دووەمیان موزیکی میللی و فلکلۆری بووە کە میرەکان دیوەخانەکانیان پێ دەڕازاندەوە.

لە ناویاندا فۆرمی لاوك لەم سەردەمانەدا گەشەی گەورە بە خۆوە دەبینێت، بە شێوەیەکی گشتی هەموو میرە کوردەکان گرنگییەکی زۆریان ئەدا بە ئەدەبی کوردی و فارسی و موزیکی میللیی کوردی، هەر لەبەر بەربڵاوی فۆرمی لاوك و چیرۆکەکان کە پێی دەگێڕێتەوە".

* دەف:

ئامێری دەف مێژوویەکی دووروودرێژی لەگەڵ کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتی هەیە بە تایبەت لەگەڵ مرۆڤی ڕۆژهەڵاتی و لە ناویشیاندا کورد.

دەف ئامێرێکی (ڕیتم) کوتانە، ژەنین و کوتان و لێدانەکەی بە هۆی دەست و سەرپەنجەکانەوەیە، کە هەر یەکەیان لە چۆنیەتی بەکارهێنانیدا دەنگی جیا جیا دەردەکات، بە تایبەت لە نێوان (دم، تەك)ەکاندا، واتە بەکارهێنانی شێوازەکانی دەبێتە هۆی دروست بوونی چەندین (دم و تەك و تەکنیکی جیاواز).

کۆنترین پارچە شوێنەواریی کە وێنەی ئامێری (دەفی بازنەیی) تێدا بینرابێت لە باشووری عێراقدا دۆزراوەتەوە، کە دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی (٢٦٥٠ پ. ز.)، کە وێنەی گۆزەیەکی سوورە، نیگاری سێ ئافرەتی ڕووتی تێدا کێشراوە بەدار لە دەفێکی بازنەیی دەدەن، ئەم پارچەیە لە هۆڵی سۆمەری لەمۆزەخانەی عێراقدا نیشان دراوە ئەمەیان گفتوگۆو ڕای جیاوازی زۆر لەسەرەو بەشێکیان باس لەوە دەکەن کە ئەو ئامێرە لە کوردستانەوە لە ڕێگەی بازرگانەکانەوە یاخود پاشاو دەسەڵاتدارەکانی ئەو کاتە گەیشتۆتە باشووری عێراق چونکە نەخش و نیگارو پێکهاتەی دفەکە لە نەخش و نیگارو ئەو شێوانەیە کە لە کوردستاندا باویان هەبوە.

پارچە شوێنەوارێکی تر کە لە کوردستان دۆزراوەتەوە لە ناوچەی (قەرەتەپە) لە خوارووی کەرکوك بووە کە تیایدا کنارە ژەنان و دوو کەس بەدی دەکرێن خەریکی دەف ژەنینن، مێژووی ئەم پارچەیە دەگەڕێتەوە بۆ دەورووبەری (٧٠٠) پێش زایین.

مێژووی بەکارهێنانی ئامێری دەف پێش هاتنی ئایینی زەردەشت لە زۆر ناوچەی دەورووبەری هەردوو زێی دیجلەو فوراتدا واتە (میسۆپۆتامیا) هەبووە، لەسەر دەستی سۆمەریەکانیشەوە گەیشتۆتە ناو ئەکەدییەکان، کە ئەوان پێیان وتووە (دوو پوو)، مەبەستیان لەم واژەیە تابلۆو لاپەڕە بووە، وشەی (دوپ)یش وردە وردە لە ئەنجامی هاتووچۆی عەرەبە بۆ سەرزەمینی ئێرانی کۆن و کوردستان گۆڕدراوەو بووە بە (دەف) و ماناکەشی هەر تابلۆو نووسینی گەیاندووە.

ئامێری (دەف) لە وڵاتی کورداندا و ناوچەکەش بە گشتی لە تەواوی ئاینیەکاندا بەکارهاتووە تا گەیشتوەتە ئایینی ئیسلام بە تایبەتی لە لای ئەهلی هەق و ئێزیدی و زەرەشتییەکاندا پێگەیەکی باڵاو گرنگی خۆی هەبورە، لە گشت سەردەم و ئاینەکاندا موزیك لە ناوچەکانی هەورامان و ئازربایجان و کوردستان بە گشتی هونەرێکی پارێزراو بووەو شوێن و مەقامی پێ لەق نەکراوە.

پەیڕەوانی ئایینی زەردەشت و دواتریش لای ئەهلی هەق هەبووە کە لە ئاتەشگەو جەمخانەکاندا بەکاریان هێناوە، بە شێوەیەکی گشتی موزیك لای پەیڕەوانی ئایینی زەردەشت شادی هێنەر خەمڕەوێن بوو کە ئێستا هەوێنی ڕوحی ئەو شادی و بەزم و

خۆشییە لە هەڵپەڕکێو زەماوەندو گۆرانیو بەستەکاندا وەك خۆی ماوەتەوە.

لە تەکیەو خانەقا کوردیەکاندا کە مەڵبەندو بنکەی سەرەکیی بڵاوکردنەوەی ئایینی ئیسلام بوون، دەف کەسایەتییەکی باڵای هەبووەو هۆیەکیش بووە بۆ جێبەجێکردنی مەراسیمەکانی بە تایبەتی زیکری دەروێشان، ئەم بەڕێوەچوونەش لە سەرەتادا بە ڕیتمو خێراییە خاوەکان دەست پێدەکات لەگەڵ جوولەی سەرو لەشو لاری دەروێشەکانو بەرە بەرە چوونە ناو دونیای لە هۆش چوونو سڕبوونو بێ ئاگابوونو خەلوەتەوە، جووڵەو ڕیتمەکان بە یەکەوە خێرا دەبنو دەگەنە ترۆپکی خێرایی، هاوکارو هۆکارێکی گرنگی ئەو چوونە ناو دوونیای خەلوەتەوە ئامێری دەفەکەیە".

*** هەندێك لەو گۆرانی بێژو مەقام زانو مۆسیقازانەکانی کەرکوك:**

لێرەدا ژمارەیەك لەو کەسانەتان ئاشنا دەکەین کە دەوریان هەبووە لەخزمەت گۆرانیو مۆسیقا لە کەرکوکدا، هەر لە سەردەمانێکی زووداو جێ پەنجەیان بەدیارە لەو بوارەدا:-

مەلا تاها کەرکوکی، فەتاح مەحمود مەللاك چۆڵمەکی، شێخ حەسیب کوڕی شێخ عەلی تاڵەبانی، خدر بارام چاوەش، خولەی نۆمەری، مەلا حوسێن مەلا غولام، سالح ڕەزا فەتاحی دەلۆ، محەمەدی خولەی بارام چاوەش، بارام چاوەش، سالح بارام چاوەش، خەسرەو سالح، شوکر جەیران، محەمەد ڕەئوف، حاجی عومەر عەبدوڵلا، سەعید عەبدوڵلا، حەمە درێژ، عومەرە درێژ، عەبدوڵلا سەعید عەربەتی، حەمەی کۆترەمل، شەوکەت ڕەشید، نەجات خەیات، حاجی ئەحمەد سەعاتچی، مام عەبدوڵلای مەلا حوسێن، نادر دەمگێڕ، دەروێش غەیبوڵلا، محەمەد مەلا فاتیح، کامیل شوکر نادر، عارف دەلۆی کاکەیی، کەرەم قادر عەزیز، کوێستانی، نوری فەقێ، عەلی مەردان، حوسێن عەلی، شێخ قابیل تاڵەبانی، مەلا ئەحمەدی بەرزاوی، جەبار تاخورما، سەعید ئەحمەد شیرین، مام عەبدوڵلای مەلا حوسێن، عەلی محەمەد ئەحمەد، ڕەشید چاوەش، شێخ ئەدیب شێخ حەسیب تاڵەبانی، ڕەشید کولە ڕەزا، مەلا سدیق تۆفیق، خدر زەنگەنە، بسەلاح داودە، شێخ مەجید نەجمەدین، نەجیب تاڵەبانی، سەیید مەحمود (ئەحە عاسم)، سەیید ئەحمەد سەیید کەریم بەرزنجی، شێخ عەبدولعەزیز شێخ ئیسماعیل بەرزنجی، گەرمیانی، قەمەر بەگلەر ئەلماس، ڕەحمەتوڵلا شلتاخ، حەسەن گەرمیانی، شێخ مەحمود ئیسماعیل عەبدولکەریم بەرزنجی گەرمیانی، مستەفا عەلە قۆجە، محەمەد سالح (حەمە غەزال)، ئەحمەد فەرەج، سابیر کوردستانی، ئەمین باغەوان، سدیق بەندە غەفور، ئەحمەد داودە، مستەفا قەلایی، مەلا جومعە، عەبدولواحید گۆزەچی، مەلا عەبود سدر، مەلا مەحمود، مەلا حەسەن، مەلا حەسەن تکەچی، کوێر عیزەت، حەبیب هرمزلی، تۆپاڵ حەمە، عوسمان تەپلە سەر، عیزەدین نعمەت، مستەفا نیعمەت، ئەحمەد بەرزاوی، مستەفا عەلەك، ئیسماعیل بەربەر، محەمەد جامچی، بەزوانە، سەید جەمیل، مەلا محەمەد تۆپاڵ، عەبدولڕەحمان قزیلئایی، سامی جەلالی، عەلی قەلایی، ئیسماعیل تەرزی (ئیسماعیل ئیبراهیم غەفور)، ئیبراهیم ڕەئوف، ئەکرەم عوسمان، سەعەی حەمە گوڵە، سەیید ئەحمەد قاسم پۆستەچی، ئەحمەد کەبابچی، ئەکرەم دووزلوو، ئیلهام مەردان، بورهان

ئامێری (دەف) لە شارستانیەتییە کۆنەکانی کوردستان

کاکی، مەلا حەقی، حەمە سەعید ئەحمەد، ڕەحمەتوڵڵا شەلتاغ، مام ڕەفیق (ڕەفیق ئەمین عومەر ئەحمەد)، زەینەلْ سابونچی، زەینەلْ نەعلبندی کوردی، مەلا سەباح هورمزی، مام سەعا، سەلیمە ئەحمەد کەرکوکی (کەرکوك قیزی)، مەلا سابیر عەبدولقادر کەرکوکی، مەلا شاکیر، عەبدوڵڵا خەتیب، مەلا عەبدوڵڵا لۆبیاچی، مەلا عەبدولواحید ترکەڵانی، مەلا عەبود بوستانچی، مەلا عەلی سۆرانی، عەول دورسە، عیزەددین فارس، فانی (عەبدولڕەحمان کەرکوکی)، فایق نەجار، شێخ قابیل تاڵەبانی، کوێخا ئەلیاس، محەمەد دوزلی، محەمەد ڕەئوف، محەمەد قەڵایی، مستەفا ئەحمەد مستەفا، مستەفا نەجار، موئەیەد حەسەن، مام محێدین، مام نەزەر، مام نەسرەددین، شێخ نەسرەددین تاڵەبانی، هابە (عەبدولوەهاب مەلا بەرغەش حوسێن)، وەجدی حاجی کەمالْ، وەجدی مستەفا، وەحید قایەچی، مەلا وەلی.

*** مێژووی هونەری قۆریات لە کەرکوکدا :**

(خوریات) یان (خوێرات) بریتیە لەچواریەکی شیعری جوان کە هونەری مەقام دەڕازێنێتەوە، کە لەنێو خەڵکیدا بڵاوبووەتەوە بەناوی (خوێرات)، هەروەها ئەوەی لەبەر چاو ڕوونە کە بێژەری قۆریات ئەوەی کە لەلای تورکمان هەیە جیاوازە لەگەڵْ ئەوەی کە لەنەتەوەکانی تردا هەیە.

کۆمەڵێك ئامرازی مۆسیقی ناوچەی کەرکوك

لێرەدا دەتوانین بڵێین کە قۆریات یەکێکە لەکەلەپورەکانی ناوچەی کەرکوك، یەکێکە لە لقەکانی مەقامە لەناوچەکەدا، هەر بۆیە بنەڕەتی ئەم وشەیە کە گەلێك بەلگەی کەلەپوری و مێژوویمان هەیە بۆ گەڕانەوەی ئەم بێژەیە، هەر لەم رووەوە گەلێك ڕای جۆربەجۆر هەیە بۆ بنەڕەتی وشەکەو ئەو ئەلقانەی کە لێی جیا بووەتەوە.

((خوریات لەهەموو دەرگاکانی بابەتی شیعری داوە لەپیاهەڵدان و خۆشەویستی و گریان و وەسپ و گازندەو خۆشەویستی بۆ جێگەی یارو خۆشەویستان، تابەوەی فەلسەفەو ڕەوشتیش بەکار هێنراوە، کە ئەمە سادەترین جۆرەکانی شیعرە بۆ هۆنینەوەو هەریەکەی جێگەی خۆی هەیە بۆ هۆنینەوەی شیعر)).

((لێکۆڵینەوەو شرۆڤە کردنێکی زۆر هەیە لەنێوان لایەنگرانی ئەدەب و لێکۆڵەرەوان دەربارەی شێوازی بێژەتی ئەو وشەیەو بنەڕەتی زمانەوانی، کە ئەمە وای کردووە گەلێك بۆچوونی جۆراو جۆر بڵاو بێتەوە کە زمانەو زمان گۆڕانی بەسەردا دێت، لەوانەی کە بۆی دەچن کە گوایە (قوریاد) بێژەرێکی ئاوێتەیە کە پێك هاتووە لەوشەی (قورو) بەمانای (قاس) یان (الصلب) و (یاد) بەمانای (ذکری)، بەمانای ئەمە بێژەتێکی ئاوێتەیە بەمانای یادێکی بەئازار – ذکری مؤلمة).

ئەم بۆچوونە تا ئەو ڕادەیە بڕست دەکات کە تەنها یاری کردنێکە بەبێژەتی وشەکان، بۆیە هەندێکی بەهەڵەدا چوونە کە (خوریات) بەوە دەگەڕێننەوە، گوایە لە (خواردە) وە هاتووە بەمانای دەست و دڵ تێر. هەندێکی تر دەگەڕێننەوە سەر (خوری یادی))، یان (قوریات))،

بەڵام ئەگەر لەبۆچوونێکی مێژووییانەوە سەیری بنەڕەتی وشەکە بکەین، دەگەڕێینەوە سەر ئەو ڕاستیە کە وشەکە زۆر لەوە کۆنترەو دەتوانین بنەڕەتی بۆ سەردەمەکانی هوری – میتانیەکان و ئەم شێوازی مەقامە مێژوویەکی درێژی ئەو سەردەمەیە.

هوری – میتانیەکان شارستانیەتیەکی دووروودرێژیان هەیە لەکەرکوکدا گەلێك کەلەپوریان بەجێماوە کە تاکو ئێستاکە پاشماوەی لەم شارەدا ڕوونە، ئەویش لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە ئەو مەقام و گۆرانیانەی بەجێماون، ڕەگێکی زۆر قوڵیان هەیە پێویست بەوە دەکات لێکۆڵینەوەی فراوان و گەورەی لەسەر بکرێت.

(قۆریە) یەکێکە لەو گەڕەك و ناوچە گرنگانەی کە لەسەردەمانێکدا سەر بەئاقاری (هوری – میتانی)یەکان بووەو خاوەنی شارستانییەتێکی بەر فراوان بووە، بۆیە زۆر بەڕاشکاوییەوە ئەوە دەخەمە ڕوو کە بنەڕەتی ناوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمەو ناوەکەشی لێوە سەرچاوەی گرتووە، هەر بۆیە قۆریات لەبنەڕەتی (خوری – هوری) و سەقام گیر بووەو تایبەتمەندی جۆرێك مەقام گەشەی کردووە کە تایبەت بووە بەو ناوچەیە، زۆربەی ئەو قۆریاتچیانەی کەرکوك لەو ناوچەیەدا سەریان هەڵداوە، ئەوەی زیاتر ئەم بەلگەیە پشت ڕاست دەکاتەوە کە گەلێك لەم جۆرە بێژەتانە هاوشێوەی (هوری – میتانی) یە.

ڕای مامۆستا (میقداد محەمەد) دەربارەی قۆریات:-

قۆریات ئاوازێکە لەمەقام، ناتوانین بڵێین کە قۆریات مەقامە چونکە لەبەر ئەوەی (مەقام) (تحرین) و (تەسلیم)ی هەیەو لەنێوان ئەمانەشدا چەند پارچەیەکی مەیانەو پێکەوە بەستن هەیە، هەر بۆیە ئەمە لەقۆریات نابینین، چونکە قۆریات لە (١٢-١٤) وشە تێپەڕ ناکات لە کاتێکدا مەقام لە چەند ڕستەیەك پێك دێت، بۆیە دەتوانین بڵێین کە قۆریات رووحی مەقامە.

بۆ نموونە کاتێك گوێ لەقۆریاتی جۆری (المخالف) بگرین، هەست دەکەین کە گوێ لە (سێگا) دەگرین، یان کە گوێ لەقۆریات جۆری (البشیری) لە (سێگا) بگرین وا هەست دەکەی کە گوێ لەمەقامی (رست) دەگریت، لەبەر ئەوە هەر قۆریاتێك دەگەڕێتەوە سەر مەقامێك، ئەم بۆچوونەی مامۆستا (میقداد محەمەد)یش مامۆستا (عەباس جەمیل)یش هەمان ڕای هەیە.

((قۆریات و مەقام لە مەرگەساتەکانی ئینسانی شارستانەوە هەڵقووڵاون، لە قوڕگی ئینسانی شارنشینەوە دێنە دەر. لەم پانتاییە حەسرەتاوییەی نێوان ژیان و مردندا تاکە کەس، واتە قۆریاتبێژی شارنشین، هەموو ناخۆشی و قەرەباڵغییەکانی ژیانی تاقی کردووە کە بریتییە لە ژیانی ناو شارو جیاوزە لە ژیانی سادەو خەیاڵ ئاسوودەی گوند. ئەوەی باسی لێ دەکرێ، گرفتارییەکانی ژیانی مەدەنی و کێشەی ئینسانی شارستانن نەك هی گوند؟

دەبینێ خیانەتی ئینسان و سەرگەردانییە مرۆڤایەتییەکان، هاواری بێ فریادڕەسی تاکە کەس لە دەست دەوروبەری خۆی! نامۆیی و شکستهێنانی مرۆڤ لە ناو ژیانی ناو شارو جەنجاڵییە ئەخلاقی و کۆمەڵایەتییەکان.

ئەمانە هەمووی بوونەتە ئەوقەهرو وشەو هاوار هاوارە نەبڕاوەیەی کە لە کانگای مرۆڤی شانشینەوە، لە قۆریاتەکانەوە هەڵدەقووڵێ. قۆریات وات لێ دەکا هەست بە تراجیدیای ژیان بکەیت و بیر بکەیتەوە. کەواتە قۆریات هونەرێکی کوردییە بەڵام بە تورکمانی.))

*** جۆری قۆریات:**

١. بەشیری.

٢. قزل.

٣. ماشەڵڵا.

٤. کردە.

٥. موخالف.

٦. تێر موخالف.

٧. عومەر گەلە.

٨. محەمەد ئەسکەندەر.

٩. کاسوك.

١٠. مچەلە.

*** مامۆستایانی قۆریات لەکەرکوك:-**

١) ڕەشەی کولە ڕەزا.

٢) مستەفا قەڵایی.

٣) عوسمان تەپلە سەر.

٤) عەلی مەردان.

٥) عیزەدین نیعمەت.

٦) مستەفا نیعمەت.

٧) ئەمین باغەوان.

٨) یاسین باغەوان.

٩) حوسێن جەلاو.

١٠) ئەحمەد بەرزاوی.

١١) مستەفا عەلك.

١٢) ئیسماعیل بەربەر.

١٣) محەمەد جامچی.

١٤) بەزوانە.

١٥) سەید جەمیل.

١٦) سەید ئەحمەد.

١٧) محەمەد تۆپاڵ.

١٨) عەبدولواحید ئەحمەد.

١٩) حەمە درێژ.

٢٠) عەبدولڕەحمان قزلّایی.

٢١) سامی جەلالی.

٢٢) عەلی قەلّایی.

٢٣) مەلا حەسەن.

٢٤) ئەکرەم دوزلی.

٢٥) مشکۆ.

٢٦) هابە.

٢٧) محەمەد ئەحمەد ئەربیلی.

٢٨) جەبار ئەحمەد ئەربیلی.

٢٩) کەریم عوسمان.

٣٠) محەمەد ڕەئوف.

٣١) ئیسماعیل تەرزی.

٣٢) ئیبراهیم ڕەئوف.

٣٣) هیشام.

٣٤) مەلا شا کەرکوکلی.

*** تەکیەی تاڵەبانی و دەوری لە پێگەیاندنی مەقام لەکەرکوکدا :**

تەکیەی تاڵەبانی هەر لەڕۆژی بنیات نانیەوە تاکو سەردەمانێکی دوور جێگەیەکی بەرچاوی هەبووە، لە بوارەکانی ئایینی و سیاسی و کەلەپوری و هەردەم جێگەیەکی بەرچاوی پێگەیاندنی کۆمەڵێك زاناو نووسەرو مەقام زان بووە لەم تەکیەدا.

تەکیەی تاڵەبانی شوێنی هەڵکەوتن و پێگەی دروست بوونەکەی وایکردووە تایبەت مەندییەکی دیار لەناوچەکەدا دروست بکات کە هەوڵدان بووە بۆ گەشە کردنی بوارەکانی و بایەخدانی ئەوانەی تەکیەکەیان بەڕێوە بردووە دەستیان هەبووە لەبەردەوامی جوانکاری لەو تەکیەیەداو لەخزمەت ئەو شارەدا کاری کردووە.

یەکێك لەو بوارانەی خزمەتی کردووە بایەخدان بووە بەخوێندنی مەقام و مەقام خوێندن و زیکر کردن بووە لەو تەکیەیەدا لەگەڵ ڕۆژگاریش وا گۆڕانی بەسەردا هاتووەو قۆناغ لەدوای قۆناغ جوانکاری تێدا ڕووی داوە.

ئەوەی بەرچاو دەکەوێت لەم تەکیەدا بایەخدان بەجۆری مەقامەکان زمانی مەقامەکان و گەشەکردن و وەرگرتنی مەقام بووە لەناوچەکانی تر ئەویش لە چوارچێوەی بەرنامەکانی خوێندنی مەقام و بەرنامەکانی فێربوونی جۆری مەقامەکان.

ئەو هۆکارانەی کە دەوریان بینیوە لەگەشەکردنی مەقام لەم تەکیەدا، یەکێك لەو هۆیانە پێگە سیاسییەکەی دروست بوونی تەکیەکە هەر لەسەردەمی عوسمانیەکانەوەو سەیر کردنی بەچاوێکی تایبەت لەبارودۆخەکە.

پێگە ئاینییەکەی هەر لەسەرەتای دروست بوونیەوە بەدیارکەوتووە ئەویش لەخزمەت ئایینی ئیسلام و تەریقەتی ئاینیەکەداو گەشەکردنی لەخزمەت پێگەیاندنی بەشێکی زۆری قوتابی لەو تەکیەیەدا.

هەروەها هاتنی خەڵکێکی زۆر لەناوچەکانی تری کوردستان بەتایبەتی لەکوردستانی ڕۆژهەلات (ئێران) بۆ کار کردن لەکەرکوك و مانەوەیان لەتەکیە دەورێکی گەورەیان بینی لەپێگەیاندنی هونەری مەقامات و ئاشنا کردنی کەرکوك بەجۆرەکانی مەقاماتی تازە بابەت.

بەڕێز مامۆستای مەقام (حەمە درێژ) ئاوا باسی تەکیەی تاڵەبانی دەکات:-

((... جاران مەقام خوێنان و مەقام دۆستانی ئەم شارە گشتیان، لەم شوێنەدا کۆ دەبوونەوە، چونکە لەوێ کۆڕی مەقام خوێندن دەبەستراو جا بووە، ئەم کۆڕانەی بەرتەکیە زیاد لەشەوو ڕۆژێکیان خایاندووە... هەروەها لە باوکم (سەعید عەبدوللّا) و لەمامم (حاجی عومەر عەبدوللّا) فێری هونەری مەقام ناسین و مەقام خوێندن بوومە،

خوالێخۆشبووی باوکم بەیانیان بۆ ماوەی نیو سەعاتێك لەبن منارەی بەرتەکیەدا، مەقامێکی (مەنسووری) دەخوێندو، دوای دەیکردە مەقامی (قەزان) و مەقام خوێنان و مەقام دۆستانی ئەو شارە، بەیانیان چاوەنۆڕی ئەو گوتنەی باوکمیان دەکرد، حاجی عومەری مامیشم لەتەمەنی (١٠٥) ساڵیدا کۆچی دوایی کرد، ناوبراو نزیکەی (٥٠) ساڵ لەم بەرتەکیەیە مەقام خوێن بووە، لێرە مەقامی خوێندووە لەگەڕەکی (تسعین)ەوە گوێیان لەگوتنەکەی بووە.

(شڵتاغ) لەبەغدا چاکترین ئوستادی (مەقام) بووە، ئەمە قسەی باوكو باپیرانە، دەڵێن کە لە ڕەچەڵەکدا خەڵکی ناوچەی (کفری) بووە، شڵتاغ ناونیشانی (کوڕی سوڵتان) بووە.

جارێکیان بۆ بەرتەکیەی کەرکوك دێت، ئەو کاتە شێخ عەبدولڕەحمان لێپرسراوی تەکیەی تاڵەبانی دەبێت، کە چاوی بە (شڵتاغ) دەکەوێ، بەدوای (وەلی مەقام خوێن)دا دەنێرێ، پێی دەڵێن "یا شێخ ئێستا وەلی سەر خۆشە...".

شێخ لە وەڵامدا دەڵێت: "قەی ناکا بڕۆ بیهێنن.." دوای ئەوەی (وەلی) دێت لەتەکیەدا لەگەڵ (شڵتاغ) دادەنیشن، چی مەقام زانو دەنگخۆشو مەقام دۆستی شاریش هەیە، کە بەمە دەزانن، لەو شوێنەدا ئامادە دەبن، (شڵتاغ)و (وەلی) شەوێكو ڕۆژێك بەردەوام مەقام دەخوێننو مەقام دەگۆڕن (لەگوتنی مەقامەکاندا دەستووری مەقام ڕەچاو دەکەن) چونکە هەریەکەیان، دەیەوێت بۆ ئامادەبووانی بسەلمێنێ کە لەدەنگو مەقام گۆڕینو چینە جۆر بەجۆرەکانی دەنگو.. تاد، لەوی دیکە شارەزاو بلیمەتو ئوستاد ترە لەئەنجامدا (شڵتاغ) پەکی دەکەوێ، هەڵدەستی ئەملاو ئەولای (وەلی) ماچ دەکاتو ڕوو دەکاتە شێخو دەڵێت:-

"یاشێخ ئەم پیاوە (واتە وەلی) ئوستادی منە ؟ !".

وەك لەباوكو باپیرانەوە گوێمان لێبووە، مەقام لەم ناوچەیەدا بڵاوبووەتەوە، بەڵام بۆ مەقامە ڕەسەنەکانو تایبەتییەکانی وەکو (قەتار، ئەڵڵاوەیسی، خورشیدی.. تاد)، لەناو هۆزەکانی دەشتی (گەرمیان) وەك داوودە، تاڵەبانی، جەباری، زەنگەنە، شێخان) بڵاوبووەو هەر لەکۆنەوە هەبووە، واتە هەر لەبەرتەکیەی ئەو شارەوە تا دەگاتە چەمچەماڵ، بەپانایی ناوچەی گەرمیانو پەرتوبڵاوی هۆزە ناوبراوەکان)).

*** مامۆستا میقداد محەمەد ئاوا باسی تەکیەی تاڵەبانی دەکات:-**
هەر لەمنداڵییەوە لەتەکیەی تاڵەبانی گەورە بووم، شوێنی مەقام زانێکی زۆر بوو، ئەو مەقام زانانای کە ناسیانم لەوێدا بریتی بوون:-

(حاجی عومەر پاسەوان، سەعید حەمە گوڵ، مەلا محەمەد تۆپاڵ، مەلا قەساب، سەید زەینەڵ، مەلا عەبدوڵڵای لۆبیاچی، مەلا سدیق، مەلا حەسەن، حاجی عومەر جگەرچی، مەلا حوسێن، مەلا حەقی، حەمە درێژ، خالید ئاغا)، ئەمانە لەدوای زکر کردنو نوێژدا لەوێدا بەشدارییان دەکرد لەمەقام خوێندن لەتەکیەی تاڵەبانی.

سەرەتای خۆم لەساڵی (١٩٥٥) ەوە فێری چۆنێتی جیاکردنەوەی مەقامەکان بووم، ئەمیش ئەوەیە کەوا دانی پێدا دەهێنم لەژێر کاریگەری مەقامزان (مەلا محەمەد تۆپاڵ) ئەمە وەستایەکی زۆر بەتواناو کاریگەر بوو لەمەقام خوێندن، دادەنیشتم کە مەقامی دەخوێند، چۆنی دەوت سەرنجم دەدا، زۆری کات لاسایم دەکردەوە، مەرجێکی گرنگی مەقامزان ئەوەیە، کە مەقامەکەی وت وشەکانی کە دەریدەبڕێت بەرامبەرەکەی تێبگەیەنێت، لەگەڵێك شوێندا (تواشیح دینیە) م لەگەڵیدا دەوتەوە.

((... ئەم تەکیەیە لەو ڕۆژگارەدا شەوانی سێ شەممەو هەینی لەپاش زیکر کردن لەو شوێنە دەگوێزرانەوە بۆ کۆشکی شێخ جەمیل تاڵەبانی لەوێ کۆڕی مەقام خوێندنیان دەبەست، مەقامبێژە دەنگ خۆشەکان وەکو مەلا محەمەدی تۆپاڵ، خالید ئاغای کوڕی حاجی حەسەن قەساب، مەلا عەبدوڵڵای لۆبیاچی، مەلا سدیقی تۆفیق خدر، حاجی عومەر حاجی سلێمانو هی تریش مەقامیان خوێندووە.

حاجی عومەر لەهەموو مەقامەکاندا شارەزایی هەبووەو بەجوانیش خوێندویانەتەوە، خاوەنی دەنگێکی بەجۆشو تەبەقەی دەنگیشی بەرز بووە، ئەم نەریتی مەقام خوێندنە لەهەفتەیەکدا دوو جار لەو تەکیەیەدا تا ئەمڕۆ بەردەوامە.

لە ساڵی (١٩٤٤)دا لەچایخانەی سەیگوڵ لەگەڕەکی (ئاخوڕ حوسێن)ی کەرکوك کە لەژووڕووی قەڵاوە بوو، (مەلا ئەحمەد) ناوێك هەبووە خەڵکی بە (بەرزاوی) ناویان بردووە، چونکە مەقامی (بەرزاوی) چاكو جوان خوێندووە، جا ئەم (بەرزاوی) یە بەشەوان لەوێ کتێبی (یوسفو زلێخا) ی بەکوردیو تورکی خوێندووەتەوە جار بەجاریش مەقامی بەعەرەبیو تورکی خوێندووەو قۆریاتیشی وتووە، بەکوردیش مەقامی نیوەشەوی بۆ دانیشتووانی ئەو چایخانە خوێندووە.

*** مەقامو مەقامبێژانی کەرکوك:**
لە هونەرو میوزیکدا کەرکوك سەرچاوەی مەقاماتە، مەقام جۆرێکە لە گۆرانیو خوێندنی شیعرو هۆنراوەی ئاینییو تەنانەت خوێندنی قورئانی پیرۆزیش هەموو ئەمانە بە چەند جۆرێ مەقام دەخوێندرێت، مامۆستا میقداد، مامۆستاو شارەزا لە بواری مەقام، نەوەی دوای هونەرمەند عەلی مەردانو خوێندکاری قوتابخانەی تەکیەی تاڵەبانی، بەمجۆرە باسی مەقام دەکات: ناوی مەقام لە ناوی پیاوانی مەقام بەرز وخانەقا وشوێنە پیرۆزەکانەوە هاتووە، وشەی مەقام بۆ شوێنو مەکانەتی پیاو چاکانو شوێنە پیرۆزکان وتراوە وەك (مەقامی حەزرەتی ئیبراهیم) یان مەقامو مەجلسی شێخ مارفی نۆدێ، یان مەقام ومەجلسی شەوانی تەکیەی تاڵەبانی.

هەر ئەمەیە مەقام لە گۆرانی جیادەکاتەوە، چونکە مەقام لە گەڵ خۆیدا بە کۆڕو زیکری دەروێشان جۆرە سرووتێکی ئاینی دەبەخشێت، سەرەتا تەنها بە دەف وتراوە، بۆ مەقامبێژ وشەی خۆیندن دانراوە کە بە عەرەبی پێدەڵێن (قارئ المقام). هەشت مەقامی سەرەکی هەیە، تێکرای مەقامەکانی تر لەو هەشت مەقامانەوە هاتوون کە ئەمانەن: ڕاست، حیجاز، بەیات، نەهاوەند، سەبا، سێگا، چوارگا، حوسەینی). مەقامە کوردییەکانی کەرکوكو گەرمیان بریتیە لە (ئەڵڵاوەیسی، قەتار، خاوکەر، خورشیدی، ئای ئای، هیجران) لە هەولێر حەیران، لە بادینان لاوك، لە سلێمانی مەقامی سەفەر کە سەر چاوەکەی مەقامی هیجرانی مامۆستا عەلی مەردانە، مەقامی هەمایۆنیش لە هەموو کوردستان دەخوێندرێ.

ئەو هەشت مەقامە سەرەکیە بە کوردی وعەرەبی وفارسی وتورکی وتورکمانی دەخوێندرێت. بەشێك لەو مەقامانەی لەو هەشت مەقامەوە سەرچاوە دەگرێت. (لە ماقامی ڕاست مەقامی پێنج گاە وشەرقی ڕاست. لە سێگا وە مەقامی حەکیمی، ئەوج، حجار. لە حیجازەوە هەمایۆن، نیوە شەوی، حوێزاوی، مەدمی، عەریمون. لە بەیاتەوە ئیبراهیمی، قەتار ئای ئای، بۆ هرزوای، مەحمودی، هجران. لە نەهاوەندەوە نەوا. لە حوسیەنیەوە ئۆرفە، ئەرواح.و -هتد).

مەقام پێك دێت لە چەند ئاوازێك کە بە شێوەیەکی هارمۆنی دیمەنێك لە دەنگو مۆسیقا و شیعر پێك دێنێ چێژێك دەبەخشێت کە گوێگر ناچار دەکات گوێی لێبگرێت چونکە جۆرە هەستێك دەبەخشێت، ژیان ودونیا جوان دەکات، سەرەتای مەقام پێیدەوترێت (تەحریر) و کۆتایەکەشی پێیدەوترێت (تەسلیم) لە نێوان تەحریر وتەسلیمدا چەندین پارچەو هەڵسانەوە هەیە خۆشیو جوانی دەبەخشێتە ئەو شوێنەی مەقامی تیادە خوێندرێت کە شێوە سرووتێك لەخۆ دەگرێت لە گۆرانیدا نیە.

کەرکوك سەرچاوەی سەر هەڵدانی مەقامە، لە کەرکوکەوە مەقام بڵاو بوەوە بەرەو دیالەو بەغداو موسڵ، هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ شوێنو پێگەی کەرکوك کە کەوتووەتە نێوان ئێرانو تورکیاو موسڵو بەغداوە. کەرکوك ناوەندێکی گەورەی بازرگانی بووە، خانی زۆری تێدا بووە، بەشێکی زۆری خانەکان بە دەست جولەکەوە بووە، بۆ ئاڵوگۆڕی بازرگانی کاروان و قافڵەی بەروبومو کەلوپەلی کوردستان، ئێران، تورکیا، موسڵ، بەغدا، دیالە بە تایبەتی دیلێتاوە، هاتووەتە خانەکانی کەرکوك، خان جێگەو عەمباری تێدا بووە بۆ کەل وپەل وبەروبومەکان نهۆمی سەرەوەشی بریتی بووە لە چەندین ژوور بۆ خەوتنی بازرگانو کاروانچیەکان، لە ناو کاروانەکاندا خەڵکی دەنگ خۆش هەبووە، بە ئاوازی جۆراوجۆر هەستو شەوقی خۆیان بۆ زێدی خۆیان دەربڕیوە. بە تێپەڕبونی ڕۆژگار ئەو ئاوازو گۆرانیانە تێکەڵ بە ئاوازو گۆرانی دەنگخۆشانی کەرکوك بووە و دواتر بووەتە سەرەتاو بنەماکانی سەر هەڵدانی مەقام کە بێگومان جولەکە لە خوێندنی مەقامو گەشەکردنو پەرەپێدانی مەقام ڕۆڵی گەوریان هەبووە، تەنانەت خەڵکانێك هەیە مەقام بە داهێنانی جولەکە دادەنێن، لە ناوە دیارەکانی جولەکە لە بواری مەقام (سالح کوێتی، سەلیمە مراد، شعوبی ئیبراهیم، فلفل گورجی کە ناوی ڕاستی ئەلیاس جورجی بوو، لە ساڵی (١٩٥٠) لە ڕێگەی ئێرانەوە بەرە ئیسرائیل کۆچی کرد. فلفل گورجی لە خوێندنی مەقامدا خاوەن قوتابخانەیەکی گەورەی مەقام بوو کە کاریگەری زۆری لە سەر مەقامی عێراقی تا ئێستایش هەر ماوە.

لە کەرکوك مەقام بە زمانی کوردیو تورکمانیو عەرەبی وتراوە، زۆربەی مەلاو هونەرمەندانی کەرکوك، لە یادە ئاینیەکاندا بە تایبەتی لە یادی لەدایکبوونی پێغەمبەر (د. خ) مەقامیان بە کوردیو عەرەبیو تورکمانی خوێندوە. ئێستایش شەوانی دووشەموان لە تەکیەی تاڵەبانی لە کۆڕی زیکری دەروێشاندا مەقامی کوردیو عەرەبی دەخوێندرێت. مەقامو تەکیەی تاڵەبانی دووانەیەکی جاویدانی شاری کەرکوکن کە بەردەوام لە ڕۆژگارە تاڵو شەوە تاریکەکانی کەرکوك چرایەك بوون ڕووناکیو ئاسودەییان دەبەخشییە خەڵکی کەرکوك. تەکیەی تاڵەبانی ئەو ناوەندو کانییە ڕوونو پاکەیە کە لە بەرهەمهێنانی مەقامبێژان تاقە قوتابخانەیە.

مامۆستا میقداد لە بیرەوەرییەکانی خوێدا، چوار نەوەی مەقامبێژی کوردو تورکمانو عەرەبی تۆمار کردوە، مامۆستا میقداد لە ساڵی (١٩٥٥) وە چووتە ناو دنیای مەقامەوە، مەقامی بە کوردی، بە تورکمانی، بە عەرەبی خوێندوە، لە کەرکوكو لە تەکییەی تاڵەبانی کەوتوەتە ژێر کاریگەری مامۆستای مەقامبێژ مامۆستا عەلی مەردانەوە، لە بەغدا، یوسف عومەر کاریگەری بە سەریەوە هەبووە. ساڵی (١٩٦٥)، دەچێتە بەغدا، لە بەغدا ئاشنایەتی لە گەڵ (شعوبی ئیبراهیم، یوسف عومەر، عەبدولڕەحمان عەزاوی، محەمەد عاشق، شەهاب ئەعزەمی، ئیبراهیم خەشالی، کە پسپۆڕی مەقام بوو لە هەمان کاتیشدا حاکم بوو پەیدا دەکات). مامۆستا میقداد لە گەڵ ئەم مەقامبێژانە مەقامی خوێندوە، ماوەیەك یوسف عومەر لە ماڵەکەی خۆی ژوورێکی دەداتێ و دەبنە هاوڕێی یەکتری. یەکەم مەقامی عەرەبی لە بەغداو لە مۆزەخانەی بەغدا خوێندویەتی مەقامی حەکیمی بوو، یەکەم مەقامی کوردیش مەقامی شۆر بوو.

قورسترین مەقام کە هەموو مەقامبێژێك ناتوانێت بیخوێنێ مەقامی (ئەڵلاوەیسییە)و سەر کەوتووانەو زۆر بە جوانی مامۆستا عەلی مەردانو سەلاح داودە خوێندویانە. لە مەقامە عەرەبییەکانیش، مەقامی سێگا، مەقامێکی قورسە. لەناو ژناندا ژنێکی زۆر لە دەرگای مەقامی داوە، سەلیمە موراد کە بە ڕەگەز جولەکە بوو لە کاتی کۆچکردنی جولەکەکان بۆ ئیسرائیل لە کۆتایی پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو سەلیمە موراد کۆچی نەکردو بووە هاوسەری نازم غەزالی، جگە لە سەلیمە موراد، زەکیە جۆرجو عەفیفە ئەسکەندەرو زهور حوسێنو مائیدە نەزهەت، مەقامیان دەخوێند، سەدیقەلمولا لە هەموویان بە تواناتر بووەو توانیوێتی بە دەنگە بەسۆزەکەی هەموو جۆرە مەقامەکان بخوێنێ. لە ئێستایشدا ژنە هونەرمەندی کوردو مەقامبێژی سەرکەوتو دیار فەریدە، ئەستێرەیەکی گەشی ئاسمانی مەقاماتی عێراقیە. لە نەوەی نوێش ئومێد دەکریت چنار کەرکوکی ببێتە مەقامبێژیکی گەورەی کورد.

پێش مامۆستا عەلی مەردانو مامۆستا میقداد، چەند نەوەیەکی دیکەی مەقامبێژان لە کەرکوك هەبووە، لە ڕاستیدا لەوەتەی مەقام لە کەرکوك سەری هەڵداوە هیچ ڕۆژێك لە ڕۆژان مەقامبێژ لە کەرکوكو گەرمیان نەبڕاوە، مەقامبێژ هەبووە بە دوو پشتو سێ پشت مەقامبێژ بوونە، نمونەی عومەرە درێژ، خۆیو باوکیو باپیری مەقامبێژو دەنگ خۆش بوون، هەروەها مامۆستا میقدادو سەلاح داودە خۆیو باوکیو کوڕەکەی.

نەوەی پێش مامۆستا عەلی مەردان ئەمانە بوون (مەلا محەمەد تۆپاڵ "شەل"، مەلا محەمەد تۆپاڵ مەقامبێژو دەنگ خۆشێکی زەمانی خۆی بووە بە ڕەگەز تورکمان بووە، تا پەنجاکانی سەدەی ڕابردووش لە تەکیەی تاڵەبانی مەقامی دەخوێند. حاجی عومەر پاسەوان باپیری مامۆستا میقداد، پاسەوانی قەیسەری کەرکوك بووەو یەکێکە لە مەقامبێژەکانی تەکیەی تاڵەبانی، سەعید حەمە گوڵە، مەلا ڕەزای قەساب، مەلا عەبدوڵای لۆبیاچی، خالید ئاغا، مەلا تەها تورکمان بوەو یەکێکە لە مەقامبێژەکانی تەکیەی تاڵەبانی، مەلا سدیق، ڕەشەی کویلە ڕەزا، تورکمان بوو، لە ساڵی ١٩٥٧ بە کوردی لە تەکیەی تاڵەبانی مەقامی خوێندوەو لە بازاڕی جووت قاوە چایخانەی هەبووە). مامۆستا عەلی مەردان گەیشتە ئەم نەوەیە بەڵام لە سەریان حساب ناکرێت، بەڵکو نەوەی دوای ئەمانە. دوای ئەوەی مەقامو مەقامبێژان کاروانو کاروانچیکانیانو خانەکانیان بەجێهێشت، لە تەکیەو مزگەوتو خانەقاکان خۆیان گرتەوە، لە تەکیەو خانەقاکان بۆ کۆڕی زیکری دەروێشان، دەنگ خۆشەکان ڕوویانکردە دنیای ئاوازو مەقام، تەکیەی تاڵەبانی بووە گەورەترین قوتابخانەی فێربوونو خوێندنی مەقام لە کەرکوكو عێراق، بۆیە مەقامبێژی گەورەی موسڵ ئیسماعیل فەحام دەڵێ: (کەرکوك بۆ مەقام یەکەمە، موسڵ دووەمە، بەغداد سێیەمە).

ئێمە ناکرێت لە باسکردنی مەقام باسی ڕەحمەتوڵا شڵتاغ نەکەین کە بۆ خۆی بە تەنها قوتابخانەیەکی مەقامات بووە، لە سەردەستی ئەمانە مەقام دەستی پێکردو گەشەی کردو بڵاوبوەو بەرەو موسڵو بەغداو دیالەو ئێرانو ئۆزبەگستانو تاجیکستانو ئازەربێجان. لە حاڵی حازردا لقو بەشەکانی مەقام خۆی لە زیاتر لە ٧٠ بەشو لق دەدات.

مەقام لە کەرکوكو گەرمیان بە ئەندازەیەك پەرەی سەند تا گەیشتە ئاست ئەوەی لە وەرزی دروێنەو کنگرکردنو کۆکردنەوەی خەرمانو کاکێشانیش نەك تەنها پیاوان بەڵکو ژنانیش لەوبۆنانەدا جۆرەها مەقامو ئاواز بخوێنن، لەوجۆرە مەقامانەی کە لەوبۆنانەدا دەخوێندرا سەید عەلی ئەسغەرو کامکارەکان و شوکر خەیات تۆماریان کردوەو مەقامی یار غەزالە کە دەڵێ:

ئەوئاوە زۆرەی یار غەزال بەرەو خوار دەچێ

سێوێکی پیادەم یار غەزال بۆ لای یار دەچێ

یان

هەرکێوێك بەرزە یار غەزال دەیکەم بە بێستان

شەمامە بگرێت یار غەزال بۆ دەستی دۆستان

ئەم جۆرە گۆرانیو مەقاماتە لە گەرمیان، لە وەرزی بەهاراندا كاتێك كچان وكوڕانی گوندەكان دەچوون بۆ قارچك ودۆمەلآنو كنگرو پیشۆك دەچوونە هەردەكانی دەوروبەری گوندەكانیان، گۆرانیو مەقامەكانیان بۆ یەكتری دەسەندەوە، یان مەلۆنانەوە یان لە شەوانی كاكێشان جۆرەها گۆرانی دەوترانەوە.

مەقام بە جۆرێك گەشەی كرد تا ئەندازەی ئەوەی چەندین ناوەندو قوتابخانەی بۆ دامەزراوە نمونەی (مدرەسەی مەقامی عێراقی، بەیتولمەقامی عێراقی، تیپی چالغی بەغدادیو مۆزەخانەی بەغدادیو. لە كەركوكیش ناوەندی عەلی مەردان بۆ مەقام). ئەم قوتابخانەو ناوەندانە دەیان مەقامبێژی پێگەیاندوە. مەقام بوارێكی دەولەمەندی دنیای هونەرەو عاشقی زۆری هەیەو ئێستا عێراق گەورەترین ناوەندی مەقامە لە دنیادا.

كۆمپانیای بەیزافۆن، كۆمپانیایەكی ئەلمانی تایبەت بە تۆماركردنی مۆسیقاو گۆرانی لەسەر قەوان، لە ناوەڕاستی بیستەكانی سەدەی ڕابردوو خالێكی گرنگ بوو بۆ تۆمار كردنو بلاوكردنەوەی گۆرانی، دواتریش قەوانەكانی (چەقماقچی) و دامەزراندنی ئێزگەی ڕادیۆی بەغداد، هۆكاری گرنگ بوون بۆ تۆماركردنو بلاوكردنەوەی مۆسیقاو گۆرانی، ئەم ئامڕازو وێستگانە بۆ سەید عەلی ئەسغەری كوردستانیو مامۆستا عەلی مەردان ونەوەی سەردەمی مامۆستا عەلی مەردان ئێجگار گرنگ بوونو ڕۆلی دیارو هەستیاریان گێڕا لە پال شەمەندەفەری كەركوك -بەغداد لە گەشە كردن وپەرە پێدانو بلاوبونەوەو تۆمار كردنی مەقامو گۆرانی كوردیو ناساندنی هونەرمەندان بە خەلك.

لە سەردەمی مامۆستا عەلی مەردان، تەكیەی تالەبانی لە زۆریو چوونایەتی مەقامبێژاندا لە لوتكەدا بوو، سەردەم سەردەمی تەكیەی تالەبانی بوو، نەوەیەك لە مەقامبێژانو شارەزا لە بواری مەقام، كەركوكو تەكیەی تالەبانیان كرد بووە چرای ڕووناكی مەقامی كوردیو توركمانی، تەكیەی تالەبانی جمەی دەهات لە دەروێشو موریدو مەقامبێژان نمونەی (حاجی نوعمان، كوێر محەمەد، حاجی عومەر سلێمان) لە ناو مەقەمام بێژانی عەرەبیش محەمەد گوبانچیو یوسف عومەر نەوەی سەردەمی عەلی مەردان بوون. لە ناو مەقامبێژانی ئەم نەوەیە مامۆستا عەلی مەردان جگە لە خۆیندنی مەقام پسپۆرو شارەزاش بوو لە بواری مۆسیقاو مەقامداو تەنانەت بڕیاردەر وخاوەن بڕیار بوو لە وەرگرتنی هونەرمەندان لە ئێزگەی رادێوی بەغداد (بەشی كوردی).

ئەم نەوەیە بە دوای خۆیدا نەوەیەكی دیكەی مەقامبێژانی هێنا، لە وانە مامۆستا میقداد، سەلاح داودە، حوسێن عەلی، حەمە درێژ، شەوكەت كاكەیی، عارف كاكەیی، شوكر خەیات، شەهید مامۆستا مەلا محێدینی كۆمیتەی ئاگر، لە توركمانیش: عەلی قەلعەلی، ئەكرەم توزلو، ئیسماعیل دەرزی، ئایدن جامچی. لەم نەوەیە ئەوانەی تا ئێستا چالاك و بەردەوامن لە تۆمار كردنی مەقامات: فایق داودە، حەمە ڕەئوف كەركوكی، شەهاب قەساب، وەجدی كەمال، خسرەو، حاجی عەزەدین.

لە ناو ژنانیش كۆمەلێك دەنگ خۆش ومەقامبێژی ژن دەركەوتن كە زیاتر لە مەولودو پرسەو بۆنە ئاینیەكان مەقامیان دەخوێند، لە وانە (مەلا هەیبەت، مەلا شەوكەت كە دوو خوشكی دەنگ خۆشو مەقامبێژ بوون، مەلا فاتیمە، مەلا حەسیبە، مەلا فەریدە) ئەمانە كۆتو بەندو دابو نەریتی كۆمەلایەتی نەبوایە، هیچیان لە سەدیقەلمولایەو زهور حوسێن و سەلیمە موورادو عەفیفە ئەسكەندەر كەمتر نەبوو، بە داخەوە دابو نەریت هونەری لە كەركوك خنكاندووە بە تایبەتی لەناو ژناندا. لە دوای نەوەی عەلی مەردان، سەلاح داودە، بە ناوبانگترین مەقامبێژ بوو.

لە دوای ئەم نەوەیە بۆ ماوەیەك مەقام لە كەركوك ڕووی لە كزی كردو كەركوك دابڕانێكی گەورەی لە بواری مەقامدا بە خۆوە بینی، خۆشبەختانە دوای پڕۆسەی ئازادی، جارێكی تر مەقامو مەقامات ئاوڕی لێدرایەوەو ناوەندی عەلی مەردان بۆ مەقام دامەزرا و، مامۆستا میقدادو كۆمەلێك گەنج ڕوویان لە مەقام كردەوە، لەوانە (ئەحمەد نەجیب) كە بە كوردیو توركمانیو عەرەبی مەقام دەخوێنێو ئومێدی پاشەڕۆژێكی باشی لێدەكرێت (عەباس سەلاح داودە) هەر لە ئێستاوە شوێنی خوالێخۆشبو سەلاح داودەی باوكی گرتووەتەوەو بە كوردیو توركمانیو هەندێك جاریش بە عەرەبی مەقام دەخوێنێ، لێزانانەو سەركەوتوانە دەتوانێت زۆربەی مەقامەكان بخوێنێ، بە تایبەتی مەقامە قورسەكان وەك (قەتار، ئەللاوەیسی، خاوكەرو جۆرەكانی دیكەی مەقام) عەباس سەلاح داودە، هیوای ئەوەی لێدەكرێت مەقام لە سەر دەستی خۆی و هاوڕێیەكانی گەشە بكات.

خاتونی مەقامبێژ، ئەستێرەی ئاسمانی كەركوك، خانمی ڕوح سووك، چنار كەركوكی، لە ناو كەشو هەوای بارودۆخی ئالۆزو گرژی كەركوك، لەناو چڕە دووكەلی تەقینەوەكان، لەناو نائومێدیو فرمێسكو حەسرەتی كەركوكییەكان بۆ ڕۆژێكی ئارامو تەباییو ئاشتی، دەنگێك كە دەمێكە لە دەڤەری كەركوك كەس گوێی لێ نەبووە، دەنگێك بزەی خستە سەر لێوانو شادیو فێنكیو سەمای خستە دلی كەركوكییەكانەوە، ئەو دەنگەش دەنگی هونەرمەندی مەقامبێژ چنار كەركوكییە.

چنار كەركوكی بە دەنگە ناسك و بەسۆزەكەی ڕوحی خستەوە بەر مەقامی هیجران وئای ئای ولە ئاسمانی كەركوكەوە، لە قەلاو باوە گوڕگوڕەوە، لە دامێنی قەلاوە وەك كۆترێكی سپی بێگەرد لە شەقەی بالی داو مەقامی كوردی تێكەل بە شەپۆلەكانی ڕووباری نیل كرد. مەقامی كوردی دوای (٥٥) سال لە داخستنی ئێزگەی كوردی قاهیرە جارێكی تر چنار كەركوكی مەقامی ڕەسەنی كوردی دایەوە بە گوێی خەلكی میسرو (دار ئۆپێڕای قاهیرەی) لێوان لێو كرد لە جوانیو مەقامی كوردیی. چنار كەركوكی یەكێكە لە مەقامبێژەكانی نەوەی نوێ، كە پێویستە ئاوڕی لێبدرێتەوە، پشتیوانی لێبكرێت، دەستی هاوكاری بۆ درێژ بكرێت، هەروەها بۆ ناوەندی عەلی مەردانیش، چونكە ناوەندی عەلی مەردان ئەو شوێنەیە گەر هاوكاری بكرێت دەتوانێ گەشە بە مەقاماتی كوردی بداتو نەیەلێت چرای ڕووناكی مەقام لە كەركوك بكوژێتەوە.

لایەنێكی تر ئەوەی پێویستە گرنگی پێبدرێت تەكیەی تالەبانیە كە تا ئێستایش شەوانی دووشەممە زیكری دەروێشان ودەنگی دەفو مەقامبێژان تا درەنگانی شەو، كەركوك دەبەنەوە بۆ ناو سیحرو ئەفسونی مەقامو دنیای مەقاماتو روحی مرۆڤەكان پاك دەكەنەوە.

گەرمیانو كفری دوو ناوچەی زیندو ودانەبڕاوی كەركوكە، ئەم دوو ناوچەیە گەرمیان بە ناوچەی داوییەوە، كفریش بە قوولای گەرمیانەوە، مەلبەندی سەرهەلدانی مەقام بووە. مەلا وەلی باوكی مەقامی عێراقو كوردستانە، هەروەها ڕەحمەتولا شلتاغ، لە گەرمیانو كەركوكیش حوسێن عەلیو سەلاح داودە دوو دەنگ خۆشو مەقامبێژی گەورەی كوردبوون، دەربارەی مەلا وەلیو شلتاغ، مامۆستا سەلاحەدین عەبدولحەمید لە كتێبی شاری كفری لە تەرازووی ڕەسەنایەتیو شارستانیەتدا لە لاپەڕە (١١٧) باسی مەقامات لە شاری كفریو باسی مەلا وەلی وشلتاغ بەم شێوەیە دەكات: (شاری كفری جگە لەوەی مەلبەندێكی گەورەی مەقامە ڕەسەنە كوردییەكان بووە، مێژوویەكی درەوشاوەو پرشنگداری هەبووە، لە بواری مەقاماتی عێراقیشدا چەندین مامۆستاو مەقامبێژی بلیمەتو بەهرەمەندی بە توانای تێدا هەلكەوتووە، بە پێشەنگو مامۆستای مەقاماتی عێراقی دەژمێردرێن، كە دواتر

بوونەتە جێگەی شانازی نەك هەر بۆ شاری کفری، بەڵکو بۆ هەموو کورد بۆ مێژووی مەقاماتی عێراقیش لەوانە مەلا وەلی: ناوی تەواوی (مەلا عەبدولرەحمان کوڕی مەلا رەحیم) بووە، ساڵی ١١٦٥ی کۆچی لە کفری لەدایکبووەو ساڵی ١٢٤٦ی کۆچی لە کفری مردوە.

هونەرمەندێکی دیکەی دنیای مەقام هونەرمەند سەلاح داودە بوو، سەلاح داودە ئەوەی سەردەمی عەلی مەردانو دوای عەلی مەردان بوو، سەلاح داودە دەنگێك بوو، زیاتر لە (٥٠) ساڵ خزمەتی هونەرو مەقامی کوردی کرد، وەك مۆمێك رۆشنایی دونیای مەقام بو. بە درێژای (٥٠) ساڵ جەژنەکانی کەرکوك، سەیرانگاکانی بەردەم سینەما خەیامو ئەتڵەس، سی شەوی مانگی رەمەزانو سینیو زەرفی چاخانەکانی جووت قاوەو حەمە گوڵناز، پارشێوەکانی رەمەزان، سەلاح داودەیان لە خۆیان ئالان بوو، بە گۆرانیو مەقامو دەهۆڵو زورنا و ئەڵلاوەیسیو نای نایو خاوکەر تا ئێستاش سەیرانگاکانی کەرکوكو شەوانی رەمەزان جەژنەکانی کەرکوك (سەدای راوستاوە لەوبانە)و (ئامینێ نازەنینێ)و (حەبێ خان)ی تێدا دەنگدەداتەوە.

سەلاح داودە لە دەسپێکردنی بەرنامەی کوردیەوە لە ئێزگەی بەغدا، مانگانە لەرێگەی شەمەندەفەرەکەی کەرکوکەوە بەرێدەکەوت بۆ بەغداو بۆ تۆمارکردنی مەقامو گۆرانی تازە، (١٢) کاتژمێر لە ناو شەمەندەفەرو دابەزین لە سنووری (باب الشیخ)و سەرچاککردنی لای مامۆستا عەلی زەنگەنە ئەندامی مەکتەبی سیاسی حیزبی شیوعی کە ئەو عەیامە لەلای یەکێك لە دەلاکەکانی باب الشیخ شاگرد بوو، سەلاحو فایق بۆ سەرچاککردن دەچوونە لایو سەریان چاك دەکرد، لە باب الشیخ لە چایخانەکانی نزیك عەبدولقادری گەیلانی، کوردانی کوردستانەکەی خۆمانو رۆژهەلات لەوێ بوون، سەلاح داودە تێکەڵ بەو دونیایە دەبوو گوێی لە کوردەکانی رۆژهەلات دەگرتو هەواڵی گۆرانییەکانی خۆیو کاریگەری لەسەر ئەودیو دەزانی.

لەلای مامۆستا عەلییەوە بۆ ئێزگەی کوردی و دیدەنی مامۆستا عەلی مەردان و باسوخواسی مەقام و گۆرانی کوردی بەدرێژایی مێژووی ئێزگەی کوردی بەغدا، سەلاح داودە میوانی بەردەوامی ئێزگە بوو. سەلاح داودە بە بنەماڵە هونەرمەند و مەقامبێژ بوون، خۆی، باوکی، باپیری، تەنانەت کورەکانی سەلاح داودەش عەباس و براکانی، هەر هەموو دەنگخۆش و مەقامبێژ و شارەزا لە مەقام.

سەلاح لە خوێندنی هەر حەوت مەقامە سەرەکییەکە و زیاتر لە حەفتا لقی مەقام شارەزا و لێهاتوو بوو، لە خوێندنی مەقامە قورسەکان (قەتار و ئەڵلاوەیسی) پسپۆر و لێزان بوو. عەلی مەردانو سەلاح داودە و حوسێن عەلی لە ٦٠ ساڵی رابردوودا کۆڵەکە سەرەکییەکانی مەقام بوون و تەکیەی تاڵەبانیش لە پۆژی دروستبوونییەوە تا ئەمرۆ بە گەورەترین ناوەند بۆ پێگەیاندنی مەقامبێژان ئەژمار دەکرێ. ئەم سێ کۆڵەکەیە و تەکیەی تاڵەبانی قوتابخانەیەك بوون بۆ ئەوەکانی دوای خۆیان کە ناوەندی عەلی مەردانیش درێژکەرەوەی ئەم قوتابخانەیەیە، تەکیە تاڵەبانیش ج وەك مەڵبەندێکی گەورەی رێبازی قادری ج وەك مەڵبەندێکیش بۆ پێگەیاندنی مەقامبێژان دەمێنیتەوە ونەوە دوای نەوە پەرە بەمەقام دەدات، مەقام و ئایندەی مەقام، بۆیە مەترسی لەسەر نییە، چونکە تەکیەی تاڵەبانی وەك ناوەندێکی گەورە تا ئێستا ماوە و هەر دەمێنێ.

سەلاح داودە نەك هەر لە مەقام و گۆرانیدا کەم وێنە بوو؟ لە بواری کۆمەڵایەتیشدا کەسایەتییەکی نەفس بەرز و خۆشەویست بوو، هەموو ژیانی و خێزانە نۆ کەسەکەی لە ژوورێکی کرێچیدا بەسەر برد، ماوەی (٣٥) ساڵ لە بەرامبەر هەرەشەو گوشارەکانی بەعس خۆراگربوو، تاقە گۆرانییەکی بۆ سەدام و بۆ بەعس نەوت، برسێتی و هەژاری و ژیانی کولەمەرگی و بێ بەرگی و دەربەدەری پێباشتر بوو لە پارە و پولی بەعس. هەڵوێستی مەردانە و جوامێرانە و خۆراگری سەلاح داودە لە شارێکی وەك کەرکوکدا، نەك مایەی شانازی بوو بۆخۆی و خێزانەکەی، بەڵکو مایەی سەربەرزی و شانازیش بوو بۆ دانیشتوانی شارەکەشی.

سەلاح داودە ئەو پیاوەی زیاتر لە (٥٠) ساڵ تەمەنی بۆ هونەر و جوانی و خۆشەویستیو مەقام تەرخان کرد، سەلاح داودە شانبەشانی مامۆستای ئەمر عەلی مەردان و حوسێن عەلی وەك مۆمێك وەك پەروانەیەکی پەرسوتاو بە مەقام و دەهۆڵ وزورنا خەڵکی کوردستانی دڵخۆشکرد و تەنانەت خۆشەویستی و گۆرانییەکانی سەلاح داودە بەرەو کوردستانی رۆژهەلاتیش پەلی هاویشت و بووە هونەرمەندی خۆشەویستی ئەو دیویش.

بە ئامێر و تیپی مەقام کۆتایی بە مەقام و مەقامبێژانی کەرکوك دێنین.

ئامێرەکانی مۆسیقای مەقام، یان تیپی مۆسیقای مەقام جیاوازی هەیە لەگەڵ تیپی مۆسیقای ئاسایی، مەقام دوو جۆر ئامێرو تیپی هەیە:

١-چالغی: بریتییە لە سەنتور، جۆزە، تەپڵ، نەقار، باشترین ژەنیاری جۆزە لە عێراقدا لە ماوەی (٦٠) ساڵی رابردوودا خوالێخۆشبوو (شەعووبی ئیبراهیم) بوو کە بەرەچەڵەك جوولەکە بوو.

٢- تەختی رۆژهەلاتی: بریتییە لە کەمان، عودو نایی، شمشاڵ، قانون، چەلۆ، ئیقاع.

*** مەقامی قەتار:**

لە سەردەمێکی زۆر کۆن، لە گوندی عەلیاوەی ناوچەی هۆزی جەباری لەلایەن عەبدوڵلا ناوێکەوە گوتراوە.

یان هەندێك بۆچوونی تر دەڵێت:

"مەقامێکی تری کۆنو رەسەنی کوردی هەیە و لە ناوچەی کەرکوكو دەروربەریدا دەبێژرێ ناوی مەقامی (قەتار)ە، ناوکەیشی لە بنچدا لە (گاتا) بووە، کە واژەیەکی موزیکی ناسراوی خۆرهەلاتی کوردستانەو بڕواش وایە وشەی (قەتار)، یان (گاتا)، لە وشەی (گات)، یان (گاتا)ی ئایینی زەرتوشتییەوە وەرگیرابێ، ئاڵوگۆری بەسەردا هێنرابێ کە مەبەست لێی ئەو سروودە ئاینییانەی زەرتوشت بووە، کە لە بۆنەو جەژنەکانی زەرتوشتیدا بە موزیکەوە خوێندراونەتەوە. هەر ئەم ووشەیەشە، کە ئاڵوگۆری بە سەردا هاتووەو ئێستا کە ووشەی (گاتا) وەك پێشگرێك بۆ ناوی ئەو پەیژەی موزیکە، کە لە پۆلێنکردنی موزیکی گەلانی ئاریایی نەژاد دا ناسراوەو دەوترێ: یەك گا، دوو گا، سێ گا".

*** مەقامی ئەڵلاوەیسی:**

دەگێرنەوە، کابرایەکی زۆر دەنگخۆشو بلیمەت لە مەقام گوتنا، ئەم شێوەگوتنەی داهێناوە، ئەوانەی گوێیان لەگوتنەکەی بووە، لەتاوانا گووتویانە (ئەڵلاوەیسی، ئەڵڵا، ئەڵلاوەیسی.. واتە دەمخۆش وەیسی، بیڵێ وەیسی گیان، بەردەوام بە وەیسی..) تا لە ئەنجاما مەقامەکە ئەم ناوی (ئەڵلا وەیسی)یەی بەبەر دابڕاوە.

*** مەقامی زەنگەنە :**

دەربارەی ئەم مەقامەش بەم شێوەیە باسی هاتووە:

"(سترابۆن)ی جوگرافیناسی یۆنانیش دەیگێڕێتەوە، کە پێڕەوانی زەرتووشتی، لەکاتی پێشکەشکردنی قوربانی دا، (ئاڤیستا)ی کتێبی پیرۆزی ئاینییان خوێندۆتەوەو موزیکیان لەگەڵدا ژەندووە. دیسان مەقامێکی تری کۆنی کوردی هەیە، مەقامی (زەنگەنە)یە، کە دەدرێتە پاڵ هۆزی (زەنگەنە)ی ناسراوی کورد، بەڵام لە عێرقدا بە ناوی (تاهیر) ناسراوەو لە کتێبی (ارجوزة الانغام العراقية)دا، بەمجۆرە ناوی هاتووە: (تلك مقامات الاصلية ندرجها والقطع الفرعية بيات ناري، طاهر محمودي سيكاه، قوريات، صبا حديدي عبوش قريباش، فالسفيان خليلي كار كرد فالبلجلان ئەوەش کە پیشتیوانی لە تەمەن درێژیی و ڕەسەنایەتی مەقامی (زەنگەنە) دەکات، ئەوەیە کە ناوی (زەنگەنە) لە لیستی ئاواز گەلی ئێرانیدا، لە هەردوو سەردەمی پێش ئیسلامو دوای هاتنی ئیسلامشیدا، ناوی هەیە. جگە لەم مەقامانە، مەقامبێژانی کورد، مەقامی تریشیان چڕیوە، کەلە ناو کورداندا باوبووەو هەندێکیان تایبەت بە کورد خۆیو هەر لە ناو کورداندا بووەو هەندێکیشیان مەقامی ناسراو بووە، لە ناو ئەماندا، یەکێك لە جۆرەکانی مەقامی (بەیات)، بە (بەیاتی کوردی)، یان (کوردبەیات) بە ناوبانگەو یەکێکشە لە پاشکۆکانی (دەزگای شوور)، کە (دەزگای سوور)یش بەرینترین دەزگای ناو حەوت دەزگا موزیکییەکەی ئێرانییە، ئامێر گەلی موزیك".

*** مەقامی خورشیدی:**

دەڵێن، یەکەمجار لەلایەن پیاوێکی خورشید ناوەوە، گوتراوە، بۆیە مەقامەکە بەناوی ئەوەوە ناونراوە.

خوالێخوش بوو نوری فەقێ دەگێڕێتەوە:

"ئەوەی بەبیرم بێت پەیوەندی مەقام خوێنەکانی بەرتەکیەو شارەکانی دیکەی کوردستان هەبووە، گەلێك جار (شێخ شەریف) لەهەولێرەوە هاتووە بۆ لای مامم، بەو مەبەستەی لەبەرتەکیە کۆڕی مەقام خوێندن ساز بدرێتو ئەویش بەشداری تێدا بکات، دیسانەوە (شەهابە)ش گەلێ جاربۆ هەمان مەبەست هاتووە، مامم دەیگێڕایەوە دەیگوت، (شەهابە) دەهاتە لامو دەیگوت، مامە مەقامێکی (مەنسووری) یم بۆ نالێی؟ منیش کە بۆم دەخوێند، دەیگوت ! مامە بەڵکو بەتەواوی بیخوێنی.. واتە چەند لقی لێ دەبێتەوەو چۆن دەگەڕێتەوە، زۆریش زیرەك بوو زوو وەریدەگرت، (شەهابە) بەکوردیو تورکیو عەرەبی مەقامی دەخوێندەوە، هەرچەندە بێ مەی هەڵی نەکردووە، لەگەڵ ئەوەشدا قورئان خوێنێکی وەستایش بووە گەلێ مەقامو قورئانی زۆر بەلێهاتوویی خوێندووە".

"مەقامی (خورشیدیە) کە مەقامێکی ڕەسەنی کوردەوارییەو هەر لە زۆر کۆنەوە لە کوردستاندا بەکارهاتووەو تایبەتە بە میللەتی کوردو لە کوردستانیشدا تایبەتە بە ناوچەی گەرمیان؟ واتە هەڵقوڵاوی ناخو هەستو سۆزی ئەم گەلە ستەم دیدەیەمانە، ئەم شێوە چڕینە لای میللەتانی عەرەبو فارسو تورکو میللەتانی تر دەورووبەرمان بەدی ناکرێ.

(عەلی سابیر قەرەتامۆری)و (حەمە دیلان) لەگەڵ مەجیدینە شەل (حەسەن ئایش) کە خەڵکی ناحیەی (قادر کەرەم)ن، من خۆیشم ناوبانگی ئەمانەم لە کاك (شکور خەیات)و شێرزادی قالە خانم) بیستووە کە شارەزان لە مەقامی خورشیدیو مەقامو ئاوازی ناوچەکە. (قادر ڕەشید) ناسراو بە (قالە خانم) هەر شارەزای خورشیدیو ئەو دەستە مەقامەی هەبووە، (شێخ عەول عەزین)یش بە ناوبانگ بووەو شوێندەستی دیارە، ناحیەی (قادر کەرەم) تەکیەی (شێخ حەسەنی قەرەچێوار)ی لێیەو ئەوێش مەڵبەندێکی دیکییە ئەڵڵاوەیسی و خورشیدی بووەو چەندین ئاوازی کوردیی بە سۆزو جوان لەوێ لەدایکبوون.

هەڵبەتە شاری خانەقینیش بێبەش نییە لە چڕینی خورشیدیو کەسانی وەکو هونەرمەندی خوالێخۆشبوو (خودادادا عەلی)و (حەسەن هەیاس)و (سەیید فوئاد)ی لێیە کە سنووری ئەم ئاوازە ڕەسەنانەیان فراوان کردووە.

ئەگەر خورشیدی شی بکەینەوەو لە چوارچێوەی دەزگاو پەیژەو مەقامە ڕۆژهەڵاتییەکاندا خانەبەندیی بۆ بکەین، ئەوا دەچێتە چوارچێوەی پەیژەو مەقامی (حیجازکار)ەوە، مەقامی (حیجازکار) یش لە خێزانی پەیژەی مەقامی حیجازە، دیارە پەیژەی حیجازکار وەکو هەموو پەیژەکانی دیکە لە هەشت پلە دەنگی پێکهاتووە بۆ نموومە لە پلەی (دۆگا) واتە لە دەنگی ڕێ دەست پێبکات (ڕێ، می بیمۆل، فا دیێز، سۆل، لا، سی بیمۆل، دۆدێز، ڕێ) یان بە دەنگە ڕۆژهەڵاتییەکان (دوگا، کورد، حیجاز، نەوا، حوسەینی، عەجەم، شاناز، موحەیەرس) کە ئەمە سنوورە دەنگیو پلەی پەیژەی حیجازکارە. دیارە ئەم پەیژەیە وەکو هەموو پەیژەکانی تر دووبەشە یان دوو ڕەگەزە بەڵام یەك پلە لە نێوان هەردوو ڕەگەزەکەدا هەیە:

بەشی یەکەمیان: ڕەگەزێکی حیجازە لە پلەی یەکەمی پەیژەکەوە دەست پێدەکات کە لە چوار پلەی دەنگی پێکهاتووەو دووری یان میانەی نێوان دەنگەکان ئەو ڕەگەزە مەقامیە پێکدەهێنێت کە حیجازە، بۆ نموونە میانەی نێوان (ڕێ بۆ می بیمولْ نیو پلەیە، میانەی نێوان می بیمولْ بۆ فا دیێز پلەو نیوە، میانەی نێوان فا دیێز بۆ سۆل نیو پلەیە)، واتە لە بەینی چوار پلەی دەنگیدا سێ میانە هەیە (نیو پلە + پلەو نیو + نیو پلە) کە ئەو سێ میانەیە دەکەوێتە نێوان ئەم چوار دەنگەوە (ڕێ، می بیمولْ فا دیێز، سۆل) ئەمە ڕەگەزی حیجازی یەکەم بوو.

دووەم: ڕەگەزی دووەمیش هەر حیجازە بەڵام لە پلەی دەنگیی (لا)وە دەستپێدەکات واتە لە پلەی پێنجەمی پەیژەکەوە (لا، سی بیمۆل، دۆدێز، ڕێ) کەواتە ڕەگەزی دووەمیش هەر حیجازە بەڵام لە چینە دەنگی (لا)، ئەمیشیان هەمان سیستەمی میانەو دووری نێوان دەنگەکانی ڕەگەزی یەکەمی بەسەردا دەچەسپێ. بەڵام خورشیدی لە ڕووی ئەدا کردنەوە یان دەرکەوتنی شێوازو سنووری دەنگیدا وەك حیجازکار پانتاییەکی فراوان بەکار ناهێنێ.

ئەگەر بۆ نموونە پلەی ڕێ بکەین بە بنکە، ئەوە تەنیا خۆی لە ڕەگەزی یەکەم دەدات بەڵام لە کۆتاییدا بە پێچەوانەی مەقامەکانی دیکە لە پلەی بنکەوە کە پلەی (ڕێ)یە دادەبەزێت بۆ پلەی دەنگیی (لا) واتە تەسلیم کردنو کۆتاییەکەی لە بنکەوە کە دەنگی ڕێیە دادەبەزێ بۆ دەنگی سی بیمۆل واتە بۆ عەجەم عوشەیران".

*** دەربارەی مەقامە ڕەسەنەکانو سەرەکییەکان دەڵێت:-**

حەوت مەقامی سەرەکی هەیە کە بریتییە لە: (مەقام ڕاست، مەقام بەیات، مەقام سێگا، مەقام حیجاز، مەقام چوارگا، مەقام نەهاوەند، مەقام سەبا).

– مەقام (ڕاست) لقەکانی بریتیە لە:- پێنجگا، مەقام شەرقی ڕاست.

– مەقام (بەیات) لقەکانی بریتییە لە:– (ئای.. ئای)، ئورفە، حەیران، ئیبراهیمی، محمودی، لاوك، بەزراوی، قەتار، جبوری، سەفەر، هجران.

– مەقام سێگا لقەکانی بریتییە لە:– ئەوج، حەمال، حەکیمی، تفلیس، روکبانی.

– مەقام حیجاز لقەکانی بریتییە لە:– مەدمی، حوەیزاوی، حیجازکار، نیوەشەوێ.

– مەقام چوارگا لقەکانی بریتییە لە:– عەجەم، راشدی، خەلۆەیی، تاهیر، تاهیری.

– مەقام نەهاوەند لقەکانی بریتییە لە:– نەوا، شەرقی ئەسفەهان.

– مەقام سەبا:– مەقامی تری لێوە دەرناچێت کە بۆ ئاوازدانان دانراوە، دوو مەقامی لێوە دەردەچێت هاوبەشە لەگەڵ مەقامێکی تردا وەکومەنسووری، حەدیدی کە لەگەڵ بەیاتا هاوبەشە.

بەهۆی شوێنی جوگرافیای ناوچەی کەرکوك و نزیکی (هاوسنووری) لەگەڵ ناوچەکانی ئێران و تورکیا و سوریا و بەغدا، جاران خەڵکی شارەکان بەکاروان و قافڵە بازرگانیان دەکردو ئەم کاروانانەش هاتووچۆو پەیوەندی دروست کردبوو، ئەم کاروانانە لەناوچەکانی ترەوە سەریان لەکەرکوك دەداو شەوانیش لەخانەکانی کەرکوکدا دەحەوانەوەو تێکەڵاوی ئاڵوگۆڕی مەقامات و گۆرانی لەنێوانیاندا ئاڵوگۆڕ دەکراو لێك وەرگرتن و تێگەیشتن دروست دەبوو لەنێوانیاندا.

خەڵکی کەرکوکیش توانای وەرگرتنی ئەو جۆرە مەقامانەیان هەبوو، ئارەزووی پێشوازی لایان هەنگاوێك بوو بۆ گەشە کردنی مەقام و گۆرانی، کە ئەمیش کاریگەری فێربوون دروست بوو بەلایانەوە، ئینجا خەڵکەکە کەوتنە دەستکاری کردن لێیەوەو هەوڵی تایبەت مەندییان دەدا لەگەشە کردنی مەقامەکەدا، سەرەڕای ئەمانەش کە مەقامزان هەبووە لەکەرکوك کە توانای چێژ دروست کردنیان هەبووە لەسازدانی مەقامەکەدا، کە ئەمە وای کردووە لەکەرکوکدا مەقام دەرچێت کە نموونەمان بۆ ئەوە مەقامی (هەمایۆن)ە لە ئێرانەوە هاتۆتە سلێمانی و ئینجا کەرکوك.

*** مەقام خوێنەکانی کەرکوك:**

– (مەلا ئەحمەدی بەرزاوی).

– (ئەحمەد داوود – ئەحمەد داودە).

– (سەیید ئەحمەد قاسم پۆستەچی).

– (ئەحمەد کەبابچی).

– (سەیید ئەحمەد سەیید کەریم بەرزنجی).

– (شێخ ئەدیب شێخ حەسیب تاڵەبانی).

– (ئەکرەم دووزلوو).

– (ئەمین باغەوان).

– (ئیسماعیل ئیبراهیم-غەفوور – ئیسماعیل تەرزی).

– (ئیلهام مەردان).

– (بارام چاوەش).

– (بورهان کاکی).

– (مەلا تاهای کەرکوکی).

– (جەبار – تاخورما).

– (مەلا حەقی).

– (مەلا حەسەن تکەچی).

– (حەمە درێژ).

– (حەمە سەعید ئەحمەد).

– (حەمەی کۆترەمل).

– (حوسێن عەلی).

– (مەلا حوسێن مەلا غولام).

– (خەسرەو سالح).

– (خدر بارام چاوەش).

– (خولەی ئۆمەر).

– (دەروێش غەیبوڵڵا سەلیم).

– (رەحمەتوڵڵا شەڵتاغ).

– (رەشید کولە رەزا).

– (مام رەفیق – رەفیق ئەمین عومەر ئەحمەد).

– (زەینەڵ سابونچی).

– (زەینەڵ نەعلبندی کوردی).

– (مەلا سەباح هورمزی).

– (سەعید عەبدوڵڵا).

– (مام سەعا).

– (سەڵاح داودە).

– (سەلیمە ئەحمەد کەرکوکی – کەرکوك قیزی).

– (سەیید مەحمود – ئەحە عاسم).

– (مەلا سابیر عەبدولقادر کەرکوکی).

– (سامی جەلالی).

– (سدیق بەندە غەفوور).

– (مەلا سدیق تۆفیق خدر زەنگەنە).

- (مەلا شاکیر).
- (شوکر جەیران).
- (شێخ عەبدولعەزیز شێخ ئیسماعیل بەرزنجی).
- (عەبدوڵڵا خەتیب).
- (عەبدوڵڵا سەعید عەرەبەتی).
- (مەلا عەبدوڵڵا لۆبیاچی).
- (مەلا عەبدولواحید ترکەلانی).
- (عەبدولواحید گۆزەچی).
- (مەلا عەبود بوستانچی).
- (مەلا عەلی سۆرانی).
- (عەلی قەلایی).
- (عەلی مەردان).
- (عەلی محەمەد ئەحمەد).
- (عەول دورسە).
- (عارف دەلۆی کاکەیی).
- (عومەرە درێژ).
- (حاجی عومەر عەبدوڵڵا).
- (عیزەددین فارس).
- (مامە فەتاح مەحمود مەللاك چۆلمەکی).
- (فانی - عەبدولڕەحمان کەرکوکی).
- (فایق نەجار).
- (قەمەر بەگلەر ئەلماس).
- (شێخ قابیل تالەبانی).
- (کامیل شوکر نادر).
- (کوێخا ئەلیاس).
- (کوێستانی).
- (شێخ مەجید نەجمەددین‌نەجیب تالەبانی).
- (مەلا مەحمود).
- (مەلا محەمەد تۆپاڵ).
- (محەمەد جامچی).
- (محەمەدی خولەی بارام چاوەش).
- (محەمەد دوزلی).
- (محەمەد ڕەئوف).
- (محەمەد سالح - حەمە غەزال).
- (محەمەد مەلا فاتیح).
- (محەمەد قەلایی).
- (مستەفا ئەحمەد مستەفا).
- (مستەفا عەلە قۆجە).
- (مستەفا نەجار).
- (موئەیەد حەسەن).
- (مام محیدین).
- (مام نەزەر).
- (مام نەسرەددین).
- (شێخ نەسرەددین تالەبانی).
- (نادر دەمگێڕ).
- (نوری فەقێ).
- (هابە - عەبدولوەهاب مەلا بەرغەش حوسێن).
- (وەجدی حاجی کەماڵ).
- (وەجدی مستەفا).
- (وەحید قایەچی).
- (مەلا وەلی).

*** تیپی مۆسیقای بێ کەس:**

ئەم تیپە لە ساڵی ١٩٥٨ لە کەرکوك دامەزراوە، ئەم تیپە لە گەڕەکی ئیمام قاسم دروست بوو لەلایەن سێ هونەرمەند: مامۆستا عەبدولئیلا موحێدین بوو کە سەرەتا ئاشنای ئامێری مۆسیقای (نای) بوو، پاشان دەستی دایە مەشق کردنی ئامێری کەمانچە، تاکو بە تەواوی فێری بوو، هەروەها هونەرمەندێکی تر دەرکەوت کە ئاشنای ئامێری کلارنێت بوو ئەویش هونەرمەند ڕەمەزان زامدار کە حاڵێ حازر لە کەرکوك شەقامی کۆماری (الجمهورية) ستۆدیۆی وێنەگری هەیە، ئینجا مۆسیقاژەنێکی تر پەیدا بوو کە ئامێری ئۆکۆردیۆنی دەژەنی ئەویش هونەرمەند (سەلاح عەباس) بوو، ئەم سێ هونەرمەندە هەموو ئێوارانێك پێکەوە پرۆڤەیان دەکرد تاکو لە ساڵی ١٩٥٨ تیپێکی مۆسیقای خنجیلانەیان لە کەرکوك پێك هێنا بە ناوی (تیپی مۆسیقای بێ کەس).

ئەم تیپە ساوایە لە چەندەها گۆرانیو زەماوەند بەشداری دەکرد تەنانەت سروودی کوردی خۆش خۆشیان پێشکەش دەکرد وەکو (ئەی ڕەقیب)و (خوایە وەتەن ئاواکەی).

عەبدولئیلا موحێدینو ڕەمەزان زامدارو سەلاح عەباس توانیان مۆسیقاژەنێکی تری لێهاتوو بدۆزنەوە کە (عود)ی دەژنی ئەم هونەرمەندە خوالێخۆش بووە (سەردار فەتاح)ی بێبەخت بوو، لە سالەکانی (١٩٦٤-١٩٦٥) هونەرمەند پەیوەندی کردووە بە تیپی مۆسیقای بێکەس، پاشان هونەرمەند (شەوکەت ڕەشید)یش بووە ئەندامی تیپەکە بە ئامێری (عود)و (کلاڕنێت).

ئەم تیپە پرۆڤەی چالاکییە مۆسیقاکانیان لە مالی بورهان جاف یان مالی حەمەی سیروان دەکرد.

*** تیپی مۆسیقای سۆلاڤ:**

لە سالی ١٩٦٩ یانەی وەرزشی سۆلاڤ دامەزرا لە گەڕەکی ئیمام قاسم لە نزیك حەمامە کۆنەکەی خوار سینەما (خەیام)، دەستەی دامەزرێنەری یانەکە پێك هاتبوو لە (پیرۆت تالەبانی، شێخ ستار عەبدوللا بەرزنجی، سەلاح سالح، فەوزی محەمەد نوری، ستار محەمەد ڕەسول، عەزیز تاهر، عەدنان سابیر، ئیسماعیل تاها، نەجیب سالح، ئەنوەر عەبدولقادر).

مامۆستا پیرۆت تالەبانی کە سەرۆکی یانەی وەرزشی سۆلاڤ بوو لەگەل سەرجەم ئەندامانی یانەکە ناردیان بە شوێنی مامۆستا عەبدولئیلا موحێدینو داوایان لێکرد کە تیپەکە کۆ بکاتەوە تاکو لە ژێر چاودێری یانەی وەرزشی سۆلاڤ دەست بە کاری هونەری خۆی بکات، پاشان تیپی مۆسیقای سۆلاڤ دامەزرا کە ئەندامانی پێك هاتبوو لە عەبدولئیلا موحێدین و قادر مەردانو شەوکەت ڕەشیدو ڕەمەزان زامدارو محەمەد ڕەزاو عەلی عەزیزو کەمال زەنونو فایق سەعدونو جەلال وەندیو قابیل عەبدوللاو نەجمەددین عەلیو حوسامەدینو چەند هونەرمەندێکی تر.

تیپی مۆسیقای سۆلاڤ هەر کە دامەزرا چەند ئاهەنگێکی لە ئامادەیی کەرکوكو قوتابخانەی (الایوبیة)ی گەڕەکی ئاخووڕ حوسێنو قوتابخانەی سەلاحەدین لەگەڕەکی شۆڕیجە سازکرد.

هەروەها ئەم تیپە توانی لە شاری کەرکوك بەشداری لە گەلێك ئاهەنگی کۆمەلایەتی بکاتو ئەندامەکانی شەوو ڕۆژ خزمەتی هونەری کوردییان دەکرد.

لە سالی ١٩٧٩ تیپی مۆسیقای سۆلاڤ لە کەرکوك زیاتر گەشەی سەند هەتاکو بوو بە تیپی مۆسیقای سەر بە تەلەفیزیۆنی کەرکوك بەلام هەندێك لە ئەندامانی پێشووی وازیان هێناو هەندێکیشیان مانەوە وەکو قادر مەردانو عەبدولئیلا موحێدینو شەوکەت ڕەشیدو جەلال وەندیو حوسێنی بهائەدینو نەزیم عەبدوللا ئالتونو سامی کەریم فەتاحو محەمەد ڕەزاو مەلا ئیبراهیمو نۆڤەر موحییدینو عیماد دەندەنەو عەبدولەتیف واستیو خەلیل ئیسماعیلو محەمەد عەدنانو موئەیەد عەسکەرو ژمارەیەکی تر.

تیپی مۆسیقای سۆلاڤی کەرکوك، یەکەم جەژنی نەورۆزی لە گوندی حەساری ناوچەی شوان دوای مۆرکردنی بەیاننامەی مێژوویی (١١)ی ئاداری سالی (١٩٧٠) کە لە نێوان سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلولو ڕژێمی ڕووخاودا، بە ئامادەبوونی دەیان هەزار کەس سازدا، دواتر سازدانی هەموو ئاهەنگەکانی نەورۆزو ئادارو هی تری جەماوەری، لە ناو شاری کەرکوك، تا سالی (١٩٧٤-١٩٧٥) گرتۆتە ئەستۆی خۆی، سالی (١٩٧١)یش لە یەکەم سالیادی دەرچوونی بەیاننامەی یانزە ئادارا، تیپی مۆسیقای سۆلاڤی کەرکوك بە بەشداری هونەرمەندانی تیپی مۆسیقای باواجی کۆیە (زاهیر محەمەدو وریا ئەحمەد) لە بەغدا لە هۆلی (خولد) ئەو ئاهەنگەی بەڕێوەبرد، لەو یادەدا هورنەمند (ڕەفیق چالاك) بێژەر بوو، (نەجمەدین هەمەوەندی لەگەل تیپی مۆسیقای سۆلاڤ هەموو ئەو ماوەیە ئامێری (تەپلی) لێداوە، دیسان ئەو تیپە لەگەل کردنەوەی یەکەمجاری تەلەفزیۆنی کەرکوك لە کۆتایی شەستەکان، یەکەم گۆرانی کە بۆ ئەو تەلەفزیۆنەیان تۆمارکردووە، گۆرانی (دۆستە دۆستە)ی گۆرانبێژی مێرمندالی ئەوسا (شێرزاد عەبدولڕەحمان)و هەندێ بەرهەمی مۆنۆلۆژیست (سابیر عەبدولڕەحمان) بوو.

تۆڤال حەمە

شەلتاغ

### * رەشید کولە رەزا (١٨٨٨ – ١٩٧٤):-

ئومێد نەجم

رەشید کولە رەزا.. یەکێکە لە هونەرمەندە دەنگخۆش و بەناوبانگەکانی کەرکوک، ئوستادی خۆریات (قۆریاتی تورکمانی) بووە.
لە بنەڕەتدا کوردە، لە تەواوی ژیانی هەر جلوبەرگی کوردی (مشکی و جامانە و کەواو سەڵتە)ی لەبەر کردووە.
بەڵام جگە لە چەند گۆرانییەکی کوردی زۆربەی گۆرانی (بەستە) و قۆریاتەکانی بەتورکمانی ووتووە، هەر لەبەر ئەمەشە کە تورکمان بە هونەرمەندی خۆیانی دەزانن!
رەشید کولە رەزا قۆریات و مەقامات لە (ئەمین باغەوان) فێربووە، لەوانە (کوردە خۆریات)
گۆرانی کەسی تری نەئەوت، خۆی بە ئوستاد نەزانی، مامۆستای قۆریاتی تورکمانییە، کەس هاوتای نەبوو، دەنگێکی خۆش و سازگاری هەبوو، جەماوەر و گوێگرێکی زۆری هەبوو، زۆربەی جۆرەکانی قۆریاتی وتووە لەوانە (کوردە "کوردۆ" ، یۆڵچی، موچەلا، عیدەلە، نۆباتچی، کاسوک، بەشیری، موخالف).

### * ئاشنا بوون بە هونەری خۆریات (قۆریات):-

قۆریات (هەندێك دەڵێن خۆریات) ئاوازێکە لە مەقامەوە دەرده‌چێ، دەکرێ بڵێین قۆریات روحی مەقامە، ئەم هونەرە لە کەرکوکەوە لە دایك بووە و بڵاوبووەتەوە و لە هەولێر و بەغدا و تورکیا ناسراوە، مێژوویەکی کۆنی هەیە و مەقام و قۆریات ناسنامەی هونەری کەرکوکە، قۆریات چوارینەکی شیعرییە و هەریەکەیان بە ئاوازێکی تایبەت و ئیقاعی مۆسیقییەوە بە زمانی تورکمانی دەوترێت، لە بەغدا قۆریات وەك مەقامێکی سەربەخۆ ناسراوە، کورد دەستێکی باڵای هەبووە لە دەوڵەمەندکردنی ئەم هونەرە تاکو ئەوەی ناوی یەکێ لە قۆریاتەکان بەناوی کوردەوەیە (قۆریات کوردە "کوردۆ")یە.
زۆربەی قۆریات بێژەکانی کەرکوك کورد بوون بەڵام بە تورکمانی وتوویانە لەوانە: (شەڵتاغ، مەلا وەلی، مەلا تەها، مەلا محەمەد تۆپاڵ، مستەفا قەڵایی، رەشەی کولە رەزا، عوسمان تەپلەباش، مامۆستای مەقامات عەلی مەردان، شارەزای هونەری قۆریاتی تورکمانی بوو، حەمە درێژ، سدیق بەندە غەفور، هابە، هیشام، ئیسماعیل تەرزی..تاد).
قۆریات چەند جۆرێکە کە نزیکەی بیست ناوی قۆریات هەیە و هەریەکە لەسەر مەقامێکە لەوانە:
١. قۆریاتی (بەشیری، یەتیمی، قزل) هەرسێکیان لەسەر (مەقامی راست)ە.
٢. قۆریاتی (کاسوك، قەرەباغلی، موخالف کەرکوك، ئەسکەندەری) لەسەر (مەقامی سێگا)یە.
٣. قۆریاتەکانی (نۆباتچی، موچەلا، دەللی حەسانی) ئاوازەکەی لەسەر (مەقامی حیجاز)ە.
٤. قۆریاتی (کوردە، یۆڵچی، عیدەلە، مەزان، مالەلا، عومەرە گەلە) لەسەر (مەقامی بەیات)ە.
٥. قۆریاتی (مەتاری) لەسەر (مەقامی چوارگا)یە.

### * گۆرانییە کوردییەکانی:-

رەشید کولە رەزا لە ماوەی ساڵانی (١٨٨٨_١٩٧٤) ژیاوە، هەندێك لە هاوسەردەمی رەشەی کولەی رەزا باس لەوە دەکەن رەشە لە عەشیرەتی جافە، خۆی وتوویەتی (من خەڵکی دێی قەیتەوانم و ئەسڵم کوردە).
لە ساڵی ١٩٥٧ ئاهەنگێکی بۆ (شێخ فازڵ تاڵەبانی) کردووە. لەو ئاهەنگەدا مۆزیکژەن (ئیلهام مەردان) کەمانی بۆ لێداوە و عیزەدین نیعمەت (دومبەك)ی بۆ لێداوە. لەوێدا چەند بەستە و گۆرانی فۆلکلۆری ووتووە وەك (ئەی خودا لەم ئاگر بارانە، کولەنجە کولەنجە).
جگە لەوە گۆرانی (ئاغاو ئاغا و یار زەینەب زەینەب)ی بەکوردی وتووە، دەیان جار لە دیوەخانی تاڵەبانییەکان گۆرانی قۆریاتی وتووە، بەڵام تەنها ئەو کاسێتی ئەو ئاهەنگە وەك ئەرشیف ماوەتەوە.
شارەزایی لەم مەقامانە هەبووە: (مەقام دیوان– ئورفە) و (مەقامی مەنسوری) خوێندووە.. ستایشی (عەلی مەردان) ی کردووە و ووتویەتی وەستایە لە مەقامات.
رەشید کولە رەزا ساڵی ١٩٦٣ لەناو قەڵای کەرکوك بەشداری کردووە لە مەولودێك کە چەندین مەقامبێژی ئەو سەردەمەی کەرکوك و هەولێر بەشدار بوونە، لەوانە مەلا محەمەد تۆپاڵ، مەلا عەبدوڵڵا لۆبیاچی، جەمیل قاپقاپچی،..) تەنها بە دەف، لەو مەولودە رەشە مەقام دیوان و خۆریاتی خوێندووە.

### * رەشە و کچە سەماکارەکە:-

بە بۆنەی رزگار بوونی (عەبدولکەریم قاسم)، لە هەوڵێکی کوشتنی (تیرۆر)، ساڵی ١٩٦١ لە کەرکوك ئاهەنگێك سازکرا لە (هلال احمر)، ژمارەیەکی زۆری کەسایەتی و بەرپرسی ئەو سەردەمەی کەرکوك بەشدار بوونە، لەوێدا رەشە وەك

هونەرمەندێك بانگهێشت کراوە گۆرانیی و بەستەی وتووە، (محەمەد رەئوف) عودی بۆ ژەنیووە. لەو ئاهەنگەدا (فاتیمە) کچە کوردێکی مووسڵ بووە، سەمای کردووە لەگەڵ رەشە، لەو ئاهەنگە بۆ ماوەی سێ چارەگ لەسەر شانۆ گۆرانی و قۆریاتی وتووە, چەندین بەستەی کوردی و تورکمانی وتووە وەك (هەی ئاغا و ئاغا و مەقام قەرەباغلی و بەستەی ئۆلەم ئۆلەم).

* رەشەی کوڵە رەزا و مەقام و گۆرانی ئازەری:-

رەشە لەماوەی جەنگی جیهانی یەکەم سەرباز (عەسکەر) بووە لە سوپای عوسمانی، ماوەیەك ئەسیر بووە.. ئەو ماوەیەی لە (تەبرێز) بووە مەقامات و ئاواز و گۆرانی ئازەری فێر بووە. لەوێ ئاشنا بووە بە بنەرەت مەقامات و هونەری ئازەری و (مقام قەرەباغلی) و بەستەی (اولم اولم) و (ای بالا بالا) کە بۆ یەکەمجار رەشە لە ئاهەنگ و ئەگلەنجەکانی کەرکوك وتوویەتی، بە رەچەڵەك ئازەرییە و لەوانەوە فێر بووە.

ئاوازی زۆربەی بەستە و گۆرانییەکانی, لەسەر ئیقاعی (جۆرجینا)یە. (جۆرجینا) ریتمێکی مۆسیقایە کە ئاوازەکەی بەم شێوەیەیە (دوم تە تەك دوم تەك), دەیان گۆرانی و بەستەی شەرقی (تورکی و کوردی و عەرەبی و تورکمانی) لەسەر ئەم ئیقاعەیە.

رەشە باڵای کورت بووە بۆیە پێیان وتوەوە (کوڵە)، کەسێکی خۆشەویست بووە لەناو خەڵك, لەش ولارێکی بەهێزی هەبووە، کەسێکی بە هەیبەت و سامی هەبوو, سەخی تەبیعەت بووە و ئەو پارەیەی لە ئاهەنگەکانی دەستی دەکەوت بەسەر هەژاران دابەش دەکرد.

چایخانەیەکی هەبووە لەلای بازاڕی قازانچییەکانی کەرکوك بووە، بۆ ماوەی چەندین ساڵ لەو کارەی بەردەوام بووە، چایخانەکەی جێی کۆبوونەوەی ئارەزوومەندانی هونەری مەقام و قۆریات بووە.

دۆستایەتی و پەیوەندیەکی بەهێزی بووە لەگەڵ بنەماڵەی تاڵەبانییەکانی کەرکوك لە نموونەی (شێخ حەسیب تاڵەبانی، شێخ حەبیب، شێخ فازڵ تاڵەبانی)، زۆربەی کەسایەتییەکانی کەرکوك رێزیان دەگرت و بانگهێشتیان دەکرد تا گوێیان لەو دەنگە بە سۆزەی بێت، لەوانە (شامل یەعقوبی کە سەرۆکی شارەوانی کەرکوك بوو، حاکم موعتەسەم کە ئەمەی دواییان (حاکم تحقیق) بوو لە کەرکوك، زۆر دۆستی رەشە بوو، زۆرجار دەینارد بە شوێنیدا تاکو گوێی لە قۆریات و بەستەکانی بێت بەو دەنگ بە سۆزەی.

لەبۆنە رەسمییەکان بانگهێشت دەکرا وەك هونەرمەندێك تاکو گۆرانی و قۆریات بڵێ, موتەسەریفی کەرکوك (یوسف زیا پاشا) رێزی لێدەنا و حەزی لە دەنگی بوو.

رەشە زۆر هاورێی و دۆستی قۆریاتبێژی تورکمان (عیزەدین نیعمەت) بووە و بەردەوام بەیەکەوە دەچوونە ئاهەنگەکان، بۆ ماوەی بیست ساڵ دومبەکی بۆ رەشە لێداوە. لەگەڵ (مستەفا قەلایی و سدیق بەندە غەفور و سمە بەربەر و محەمەد گوڵ بۆی) و چەندین قوریاتبێژی کەرکوك ئاهەنگی ساز کردووە.

ئەگەرچی باڵای کوڵ (کورتە باڵا) بوو بەڵام پێگەیەکی بەرزی هونەری هەبوو لەناو خەڵکی کەرکوك، بە (دایی رەشە) ناسراوە. هونەرمەندێکی بە زەوق بوو, لە هەر ئاهەنگێك یا(ئەگلەنجە)-وشەیەکی تورکمانیی ناو کەرکوکە, ماناکەی ئاهەنگی خۆشی و شادی)یە بوایە, جەماوەرەکەی دەهێنایە سەماکردن.

لە کۆتایی عومری حەجی ماڵی خوای کردووە.. زۆربەی رۆژانی هەینی سەردانی تەکیەی تاڵەبانی کردووە. ساڵی ١٩٧٤ کۆچی دوایی کردووە.

* رشید کوڵە رەزا و جەمیل بەشیر:-

رەشید کوڵە رەزا لە ساڵی ١٩٥٩ لە رادیۆی بەغدا بەشی تورکمانی کاسێتێکی تۆمار کردووە، کۆمەڵێك خۆریات و بەستەی بە زمانی تورکمانی بۆ رادیۆی بەغدا تۆمار کردووە بە هاوکاری کەمانچەژەنی لێهاتوو (جەمیل بەشیر), لەوێدا (مەقامی قەرەباغلی) و چەندین بەستەی وتووە لەوانە

بەستەی (ئولم ئولم).

ڕەشید کوڵە ڕەزا، کاریگەری هەبووە لەسەر چەندین هونەرمەندی کورد و تورکمان وەك (حەمە درێژ، عەبدلواحید گۆزەچی، هابە، کەریم عوسمان، ئیسماعیل تەزری)، بەوەی زۆربەی بەستە و قۆریاتەکانی ئەویان وتوەتەوە، هەوڵیان داوە لاسایی (تقلید) لە شێواز و ئەدای ئەو هونەرمەندە بکەنەوە.

* بەناوبانگترین گۆرانییەکانی:-

زۆربەی گۆرانییەکانی ڕەشەی کوڵە ڕەزا ئاوازەکەی لەسەر نەغمەی (مەقام بەیات)ە، چەند بەستەیەکیش لەسەر (مەقام سێگا)یە.

١- هەی ئاغا و ئاغا (فۆلکلۆر- بەستەی مەقام ڕاست)
٢- ئەی خودا لەم ئاگر بارانە (فۆلکلۆر- بەستەی مەقام بەیات)
٣- یار زەینەب زەینەب (فۆلکلۆر)
٤- کوڵەنجە کوڵەنجە (فۆلکلۆر- بەستەی مەقام چوارگاە)
٥- دڵەکەم غەمگینە (بەستەی مەقام سێگا)
٦- ئۆلەم ئۆلەم (ئاوازەکەی ئازەرییە، نەغمەی مەقامی (سێگا)یە، ڕیمتێکی شادی هەیە، لەزۆربەی ئاهەنگەکان ئامادەبووان داوای وتنی ئەو بەستەیەیان لە دایی ڕەشە دەکرد.
٧- خانم خانم (ئاوازی مەقام سێگا).
٨- (بو خاڵ نە خاڵدی) بەستەی مقام بەیاتە، هونەرمەند (عەبدولواحید گۆزەچی) ئەم ئاوازەی لە ڕەشە وەرگرتووە و لەرادیۆی بەغدا تۆماری کردووە.
٩- ایاغندە دار شالوار
١٠- بابا وایللەم واویل
١١- زەینەبم (ئاوازەکەی عەلی مەردان دایناوە، ڕەشە وتوویەتی، لەسەر نەغمەی مەقام بەیاتە).
١٢- (بلبل اوچار یواسنە، یاغمور یاغار نواسنە، من قربانم نواسنە) .. ئاوازی مەقامی بەیات
١٣. (ئی بالا بالا بالا، خوردە خوردە یرغالا، اورتە یردە چار خالا) . ئەم ئاوازە ئازەرییە و ڕەشەی کوڵە ڕەزا لە ئاهەنگەکانی کەرکوك وتویەتی.
١٤. (سوسن مخمور یخەسی، یوخدی لو یارك وفاسی)
١٥- (سەن بیر یەنا بیر یانا) بەستەی (نەغمەی مەقام سەبا)
١٦. (باخار قاپی زارننان، گوزك کسمز یارننان) ئاوازەکەی لەسەر (مەقام سێگا)یە.
١٧. اغام سلێمان (بەیات)
١٨. (سەلەوك دامنان باخانە، مسکنم اولوب چیخانە)
١٩. یار یمان سید قیزی شیخ گلینی (بەیات)

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:

١- بۆ نووسینی ئەم بابەتە سودم لە زانیارییەکانی هەردوو هونەرمەند (مامۆستا میقداد محەمەد عومەر، شارەزا و پسپۆڕی هونەری مەقام) و (محەمەد ڕەئوف) گۆرانیبێژ و ژەنیاری عود، وەرگرتووە.
٢- کتێبی (کرکوك هوالری) ایکنجی جلد: عەتا تەرزی باشی، ١٩٩١، بەغداد.

*** شەوکەت ڕەشید.. باشترین کلارنێت ژەنی کورد (١٩٣٠_١٩٩١):-**

**نومێد نەجم**

(ئایە.. نۆیە... ئەو کچە جوانە کۆییە)
زۆربەمان ئەم گۆرانییەمان بیستووە، ئەو هونەرمەندە بەم گۆرانییە زیاتر ناوبانگی دەکرد، ئەو کەسەش (شەوکەت ڕەشید)ە، هونەرمەندی مۆسیقاژەن و ئاوازدانەر و گۆرانبێژ. هونەرمەند شەوکەت ڕەشید؛ تەمەنێکی درێژی لەناو کاری هونەری بەڕێکردووە و خزمەتێکی بەرچاوی بەهونەری گۆرانی و میوزیکی کوردی کردووە.. ئەو ئەندامی تیپی مۆسیقای سۆلاف و تەلەفیزیۆنی کەرکوکی جاران بووە.
شەوکەت ڕەشید، وەك مۆسیقاژەن، دەست و پەنجە و ریشەی لە لێدانی ئامێری ژێدار (ئالەتی وەتەری) وەك (عود و جومبوش) زۆر پاك و بێ نەشاز بوو. بۆ گۆرانی وتن قورگی و ژێیەکانی دەنگی نەرمۆڵە و ساز بوون. وەك ئاوازدانەر، ئاوازی دڵگیر و ڕەسەن و خۆش بوو.
ئەو مۆسیقازانێکی ئەکادیمی بوو، نۆتەی مۆسیقای بە باشی دەزانی و دەخوێندەوە، ئەمەش لە (جوقی عەسکەری) فێربوو، چونکە لەو جوقە بە نۆتە مۆسیقایان دەخوێند. ژەنیارێکی لێهاتووی ڕیتیم (ئیقاع) بوو، بەتایبەت دومبەکی بە باشی لێئەدا.
شەوکەت ڕەشید لەڕووی تیۆرییەوە زانیارییەکی زۆری هەبوو لەسەر مەقام، ئەگەرچی هیچ مەقامێکی نەخوێندووە. لەچەندین ئاهەنگی تایبەتی هونەرمەند (حەسەن زیرەك و هابە)بەشدار بووە عەزفی مۆسیقای بۆیان کردووە.
شەوکەت ڕەشید هاوکاری هونەرمەند (سەلاح داودە)ی کردووە لەوەی لە ڕادیۆی تەلەفزیۆنی بەغدا و کەرکوك بەستە و گۆرانی و مەقام تۆمار بکات.
لە یەکێ لە ئەگلەنجەکانی هونەرمەندی دەنگخۆش هابە، شەوکەت ڕەشید کلارنێتی ژەنیوە، ئەو ئاهەنگە ساڵی ١٩٨٨ لە کەرکوك سازکراوە و هابە چەندین مەقام و خۆریات و بەستەی وتووە و شەوکەت ڕەشیدیش بە ئامێری کلارنێت مۆزیکی بۆ ژەنیوە لەوانە (بەستەی هەی ئاغا و ئاغا، ئەی وەی زارا گیان دیدەم زارا).
لە ئاهەنگی نێوان هونەرمەندان (هابە و مەقامبێژی عێراقی حامد سەعدی و ئەکرەم توخلو) بە ئامێری کلارنێت مۆزیکی ژەنیوە.
شەوکەت ڕەشید لە گۆرانی (ئێمە گیانێکین)ی ئیبراهیم خەیات، عودی ژەنیوە، شەوکەت کلارنێتی بۆ هونەرمەندی تورکمان (عەبدولواحید گۆزەچی) ژەنیوە لە (مەقامی دیوان و بەستەی گیولە گیولە).

*** شەوکەت ڕەشید و قادر دیلان.. کامیان؟**

کلارنێت یەکێکە لە ئامێرە ڕۆژئاواییەکانە، ماوەیەك زۆر نیە هاتووەتە ناو هونەری مۆزیك و گۆرانی کوردییەوە، بۆ بەکارهێنانیشی لە گۆرانی کوردیدا دەبوو مامەڵەیەکی ڕۆژهەڵاتییانەی لەگەڵدا بکرێت، ئەویش بە بەکارهێنانی چارەگە دەنگی موزیك لەو ئامێرە.
هونەرمەند شەوکەت ڕەشید چەندین جار باسی ئەوەی کردووە کە خۆی یەکەمین کەس بووە لە ڕێگەی بەکارهێنانی تێپەوە چارەگە دەنگی بۆ کلارنێت دروست کردووە.
هونەرمەند شەوکەت ڕەشید، چاکترین کلارنێت ژەنی سەردەمی خۆی لە پاش (هونەرمەند قادر دیلان)، تاکو ئەمڕۆش جارێ یەکێکی تر وەك خۆی نەهاتووە شوێنی بگرێتەوە.
شەوکەت ڕەشید لە داهێنانێکی هونەریی زیرەکانە وەك خۆی گوتوویەتی کە دەنگی چارەکە تۆنی بۆ ئامێری کلارنێت دروست کردووە بۆ ئەوەی هەموو ئاوازە ڕۆژهەڵاتییەکانی (شەرقی) پێ لێ بدرێت. بەڵام هونەرمەندی مۆزیکژەن (باکوری) پێی وایە کە، پێش شەوکەت ڕەشید هونەرمەند (قادر دیلان) لە سەرەتای پەنجاکانەوە واتا نزیکەی هەشت نۆ ساڵێك لە پێش شەوکەت ڕەشید، ئەو چارەگە دەنگەی لە کلارنێتەکەی زیاد کردووە.
لەئێزگەی ڕادیۆی کوردی بەغدا چەند ساڵێك لەگەڵ هەموو گۆرانییەکان، لە مەقام و بەستەکانیاندا کە هەموویان نەغمەکانیان شەرقی بوون و پێویستیان بە چارەگە تۆن هەبوو، قادر دیلانیش لەگەڵیاندا بە کلارنێتەکەی چ وەك (صولۆ) لەگەڵ مەقامەکان، یان وەك ئامێرێکی ئاسایی لەگەڵ تیپی مۆسیقای ئێزگە بەستە و گۆرانییەکانی دیکەی دەژەنی. بۆیە قادر دیلان یەکەم کەس بووە دەنگی چارەگە تۆنی بۆ کلارنێت زیاد کردووە و ئاوازە شەرقییەکانی پێ ژەنیوە.
ساڵی ١٩٣٠ لە گەڕەکی مەڵکەندی شاری سلێمانی لەدایك بووە.
شەوکەت ڕەشید هونەرمەندێکی بەتوانا و کارامە بوو لە بواری مۆزیك و ئاوازدانان و گۆرانی وتن، شەوکەت ڕەشید ئەوکاتەی کە تەمەنی ١٨ساڵ بوو ناوی بۆ سەربازی هاتەوە، لە جوقی عەسکەری کەرکوك مۆسیقا فێربوو، لەوێش ئامێری فوداری هەڵبژارد بۆ مەشقکردن و فێربوون وەك (کلارنێت و فلووت).

*** گۆرانییەکانی شەوکەت ڕەشید:-**

چەندین گۆرانی و سرودی لەتەلەفیزۆن تۆمار کردووە لەوانە:
١. چاوی کاڵت دڵ ئەفرێنێ: یەکەم گۆرانی بوو لە ئێزگەی ڕادیۆی بەغدا تۆماری کرد لە ساڵی ١٩٥٧
٢. کاڵێ هەی لیمۆ: ئەمەش یەکەم گۆرانی بوو بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوك تۆماری کرد لە ساڵی ١٩٦٨
٣. کێ ئەڵێ تۆبەکە لە مەی: ئە گۆرانییە ناوبانگی زوو بڵاوبۆوەوە و شەوکەت ڕەشید بە گۆرانییە ناسرا.
٤. ئایە و ئۆیە... ئەو کچە جوانە کۆییە
٥. جەژنە جەژنە.. جەژنی شادییە
٦. چاوەڕوانی
٧. قوربانی چاوی کاڵت بم
٨. چەندە جوانی
٩. ئاخ لە بۆیە شارەزایە
١٠. زۆر دەمێکە چاوەڕوانم

شەوکەت رەشید پیاوێکی خۆش مەشرەب و قسەخۆش و زۆر حەزی لە نوکتە بووە، لەهەر کۆڕ و مەجلیس و ئاهەنگێدا بەشداری بکردایە ئامادەبووانی دەهێنایە پێکەنین و دڵخۆشی دەکردن..

جارێکیان "شەوکەت رەشید" لە سلێمانی ئاهەنگ ئەگێڕێ و لەوێش کابرایەک فشار دەخاتە سەر رەحمەتی و دەڵێ ئەبێ ئەم کابرایە گۆرانی بڵێت شەوکەتیش زۆر هەوڵ ئەدا کە پێی بڵێ ئەمە ناتوانێ گۆرانی بڵێت بەڵام فایدە ناکات بە ناچاری شەوکەت رەشید بە تیپەکەی ئەڵێ:

کاکە جەماعەت یەک (مەقامی چوارگا)ی بۆ بژەنن، تیپەکەش وا دەکەن کابرا هەر هەوڵ ئەدا دەنگی دەرچێ، دەنگی دەرناچێ بە شەوکەت رەشید ئەڵێ کاکە ئەوە ئێوە چیتان بۆ لێداوە ئەویش ئەڵێ مەقامی چوارگا کابراش تەماشای لەشی خۆی ئەکا و ئەڵی کاک شەوکەت بیکە لەراهی خوا من لەشم تەنها تەحەمولی نیو گا ئەکا تۆ چوار گات لێداوم.

دڵێکی زۆر پاکی هەبوو، ئەگەرچی زوو تووڕە دەبوو، بەڵام قین لە دڵ نەبوو، زوویش سارد دەبۆوە، تا بڵێی ئینسانێکی عاتفی بوو، هاوکات مرۆڤێکی دڵتەڕ و عاشقی جوانی بوو.

شەوکەت رەشید عاشقی مۆسیقا بوو، بە جۆرێك لە گەشت و سەیرانی بەهاران لەگەڵ هونەرمەندانی دۆست و هاوڕێی مۆزیکی دەژەنی. لە ئاهەنگ و چالاکییە هونەرییەکانی زۆربەی تیپە مۆسیقییەکانی کوردستان وەك مۆزیکژەنێك بەشداری کردووە، لەوانە لەگەڵ (تیپی مۆسیقای مەولەوی لە سلێمانی، تیپی مۆسیقای سۆلاڤ، تیپی مۆسیقای باواجی لە کۆیە).

(٢٢) گۆرانی و (٣) پارچە مۆسیقای لە ئێزگەی رادیۆی بەغدا تۆمار کردووە و لە تەلەفزیۆنیش (٤) گۆرانی و (٣) پارچە مۆسیقای تۆمار کردووە.

یەکێك بووە لە ئەندامە کاراو چالاکەکانی تیپی مۆسیقای سۆلاڤ لەکەرکوك هاوشانی ئەم هونەرمەند و موزیکژەنانە :

(قادر مەردان، عەبدولئیلا محێدین، رەمەزان زامدار، حەمەڕەزا و چەند کەسێکی تر.

ئاوازی بۆ هونەرمەندان (ئیبراهیم خەیات، عوسمان عەلی، سەلاح رەشید، حەمەی نێرگز، ئیبراهیم سابیر، سەلاح مەجید، کامەران عومەر) داناوە.

یەکێ لەو هونەرمەندانەی زۆر دۆستی شەوکەت رەشید بوو (عەلی عەزیز) بوو کە شمشاڵ ژەنێکی کارامە بوو و هەناسەی درێژ بوو لە ژەنینی نەی و شمشاڵ.

ئارەزووی ئەو بۆ هونەر دەگەڕێتەوە بۆ منداڵی ئەویش کاتێك خۆی فێری ژەنینی شمشاڵ کردووە. لەپاشان دەچێتە تیپی مۆسیقای سوپاوە، لەوێ فێری ئامێرەکانی (کلارنێت، عود، نەی، سەکسیفۆن، زورنا، جونبوش) بووە.

ئەگەرچی شەوکەت رەشید لە سلێمانی لەدایك بووە؛ بەڵام زۆربەی ژیانی لەکەرکوك بەسەر بردووە و ماڵەکەی لە گەرەکی ئیمام قاسم بوو.

* سەرچاوە:

١. گۆرانیبێژە نەمرەکان . بەشی دووەم: باکوری، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٢
٢. دەنگ و میلۆدی: وشیار ئەحمەد ئەسوەد، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئاراس، ٢٠١٢، هەولێر
٣- رەمەزان زامدار، مۆسیقاژەن و هاوڕێی هونەرمەند
٤- مەریوان شەوکەوت رەشید کوری هونەرمەند
٥- زانیاریم دەربارەی کلارنیت لە مۆزیکژەن (رێبین جەمال) وەرگرتووە.

*** سەلاح داودە.. سۆز و ئاوازی گەرمیان:-**

سەلاح داودە، یەکێك بوو لەو دەنگە رەسەنانەی کەزیاتر لە ٥٠ ساڵ خزمەتی هونەر و مەقاماتی کوردی کرد.ساڵی ١٩٤١ لە دایك بووە.

سەلاح داودە لەپەنجاکان چۆتە ئێستگەی کوردی بەغدا و چەندین مەقام و گۆرانی تۆمار کردووە، سەلاح داودە؛ بەبنەماڵە هونەرمەند و مەقامبێژ بوونە، خۆی و باوکی (محەمەد) و باپیری (خدر بارام چاوش) کە ئەمەی دواییان عەلی مەردانی فێری مەقاماتی کوردی کردووە.

*** لە کەرکوکەوە بۆ رۆژهەڵاتی کوردستان**

دەنگی سەلاح داوە هەر لە سنووری کەرکوك و باشووری کوردستان قەتیسی نەخواردووە بەڵکو خاوەن گوێگرێکی زۆرە لە رۆژهەڵاتی کورستان. داودە، لە خوێندنی مەقامە کوردییەکانی گەرمیان (قەتار، خاوکەر، ئەڵڵاوەیسی، ئای ئای، خورشیدی، ...) وەستا بوو. سەلاح داودە لەگەڵ چەندین هونەرمەند ئاهەنگی سازکردووە لەوانە (حوسێن عەلی، ئەحمەد شەماڵ، هابە، سابیر کوردستانی، شوکر خەیات، ئیسماعیل تەرزی..)

*** عەلی مەردان چی پێ ووت؟**

لە تەمەنی ١٢ ساڵیدا بووە کە هونەرمەندی نەیژەن (ئەحمەد داودە) ساڵی ١٩٥٣ لەگەڵ خۆیدا بردوویەتی بۆ بەغدا و بە هونەرمەندانی ئەوکاتی ئێستگەی کوردی ناساندووە، کە بەو دەنگە خۆشەی مەقام و بەستەی وتووە یەکێ لەوانەی پێی سەرسام بووە مامۆستا عەلی مەردان بووە، سەلاح داودە لە چاوپێکەوتنێکدا بەم شێوەیە باسی ئەو دیدارە دەکا کاتێ عەلی مەردان زانیویەتی داودە نەوەی مەقامبێژ (خدر بارام چاوش)ە پێی ووتوە: "کاك سەلاح من تەلەبەی بابات (مەبەستی مەقامبێژ خدر بارام چاوشە) بووە

و فێر ئەم مەقامێلە بیم و ئێوە گشتان گۆرانیوێژ و مەقاموێژن، ئەو وەختە ماڵمان لە لەیلان بووە. منیش ئەموت ماموّستا راستە، کەوابێ تۆش ببە ماموّستای ئێمە ئەگەر نوقسانییەك یان کەموکوڕییەکمان هەبێ لە ووتنی مەقامەکان بۆمان ڕاست بکەوە. عەلی مەردان ئەیوت کفرە تۆ نەوەی ئەو پیاوە مەزنەی کفرە من ئاوازت بۆ دانێم".

*** یەکەم تیپی هونەری میللی کوردی:-**

لە کۆتایی ساڵانی شەستەکان هونەرمەند سەلاّح داودە ، بەهاوکاری ئەم هونەرمەندە ژەنیارانە (فایەق داودە و ئەحمەد داودە و نەوزادی کوری، تیپێکی میللی کوردییان پێکهێنابوو، ئەم گۆرانیانەی لە تەلەفزیۆنی کەرکوك بە ڕەش و سپی تۆمارکرد: (کوێستانان خاڵ خاڵ، ڕێبوارو ڕێبوار ، ڕاوەستاوە لەو بانە)، بەمەش بوونە یەکەم تیپی هونەریی میللی کوردی گۆرانی لە تەلەفزیۆنی کەرکوك تۆمار کرد.
لە ساڵانی شەستەکان لە شاری سلێمانی و بەهاوکاری یەکێ لە تۆمارگەکان، بەناوبانگترین کاسێتی خۆی تۆمار دەکات بە هاوکاری هونەرمەندانی موزیکژەن (ئەحمەد داودە و نەوزادی ئەحمەد داودەو فایەق داودە) بە (نەی و باڵەبان و زەرب)، کە بریتییە لە گۆرانی (ڕاوەستاوە لەو بانە و خانزادەخان و نایلۆنە و جەمیلە و شەدەلار و ڕێبوار وخرینگە خرینگە و....هتد) تۆمارکرد.
سەلاّح داودە خاوەنی نزیکەی ١٠٠گۆرانی تۆمار کراوە.

***سەلاّح داودە و قۆریات و بەستەی تورکمانی:-**

سەلاّح داودە جگە لە گۆرانی کوردی، شارەزایی هەبووە لەووتنی قۆریات و بەستەی تورکمانی، کە لە ئاهەنگ و ئەگلەنجەکان وتوویەتی لەوانە (ئۆیانا دۆن دەرمانە) و (ئاڵ ئیپەك یەشیل ئیپەك) و چەندانی تر ، زۆر کەیفی بە بەستەی (ئەی هاوار داگیرماچی) هاتووە.
چەندین ئاهەنگی لەگەڵ هونەرمەندی ناسراوی کەرکوك (هابە) ساز داوە، یەکێ لەو ئاهەنگانەی هابە و سەلاّح داودە (هیشام) بەشدارە ، کە هونەرمەندێکی دەنگخۆشی کورد بوو، بەلاّم جگە لە چەند گۆرانییەکی کوردی زۆرتر خۆریات و بەستەی بە تورکمانی دەوت. هەریەك لە موزیکژەنان (ئەمیر عەلی مەردان. کەمان ، نازم عەلایی کاکەیی . زوڕنا و نەی ) مۆزیکیان ژەندووە. داودە و هابە لەو ئاهەنگە چەندین گۆرانی و بەستەی کوردی و تورکمانیان وتووە لەوانە ( مەقامی بەیات و شلێرە، باران بارانە، ئەی خودا لەم ئاگر بارانە، هاتەوە خانزادەخان، ئۆلەم ئۆلەم).

*** بەناوبانگترین گۆرانییەکانی:-**

(هاتەوە خانزادە خان، ئامۆزا گیان، ڕێزە بە ڕێزە گیانە، یار وەرەوە هەی وەی زارا، ئەی خودا لەم ئاگر بارانە، هەی شەمێ، دانە دانە، هەی وەگرد ئامۆزا وەگرد، ئەملان و ئەو لانتکەم، یار زەینەب، بەستەی باوانم، ڕاستەی خیابان، و نایلۆنە ، جەمیلە ، شەدەلار ، خرینگە خرینگە، کوێستانان خاڵ خاڵ، ڕێبوار و ڕێبوار، هەوارە ، شیرینێ وشەمامە).

سەلاّح داودە تەواوی ژیانی بە نەبوونی و هەژاری بەسەربرد، تا مردیش هەر کرێچی بوو.!
ئەو خەمی گەورەی پەیداکردنی بژێوی ژیان بوو بۆ منداڵەکانی، ئەرشیفێکی زۆری هەیە توانای کۆکردنەوەی بەرهەمەکانی نەبوو کە لە سەررووی ١٠٠ سەد بەرهەم دەبن

*** سەلاّح داودە و مەقامە کوردییەکانی گەرمیان**

شارەزاییەکی باشی هەبووە لەخوێندنی مەقامە ڕۆژهەلاّتییەکان (بەیات، حیجاز، صەبا، سێگا، ڕاست، چوارگا، نەهاوەند، ئورفە).
لەدوای عەلی مەردان و حوسێن عەلی، داودە ناسراوترین هونەرمەند لە چڕینی (مەقامی ئەڵلاّوەیسی)
سەلاّح داودە شارەزای مەقام (همایۆن) بوو کە مەقامێکی ئێرانییە و بە فارسی خوێندوویەتی.
شارەزایی مەقاماتی عەرەبی بوو، بە تایبەت لاسایی (داخل حەسەن)ی دەکردەوە. حەزی بە دەنگی (محەمەد عارف جزراوی) بووە.

*** سەلاّح داودە و مۆسیقا:-**

سەلاّح داودە جگە لەوەی مەقامبێژێکی دەنگخۆش بوو، هاوکات باڵەبان و زوڕنا و شمشاڵ ژەنێکی کارامە بوو، ئەگەرچی هونەرمەندێکی ئەکادیمی نەبوو واتە نۆتەی مۆسیقای نەدەزانی، بەلاّم گوێیەکی مۆسیقی هەبوو، ئەگەر یەکێ لە موزیکژەنەکان مۆسیقایەکی نەشازێکی لێبدایە دەیزانی.
سەلاّح داودە بۆ بژێوی ژیانی زۆرجار دەچووە ئاهەنگەکانی شایی و بووك گواستنەوە بە دەهۆڵ و زوڕنا و باڵەبان لەسەر ڕیتمی ئاوازە شادەکانی ئامادەبوانی دەهێنایە سەما و شادی و هەڵپەرکێ.
لە دیوەخانی گەلێ ناودارو پیاو ماقوڵی کورد لە دەڤەری گەرمیان مەقامی خوێندووە لە وانە: (مەدحەت ئاغای داودە، جەمال ئاغای کاکەیی، یونس ئاغای داودە، کەریم ئاغای هەمەوەند لە چەمچەماڵ).
لەساڵی ٢٠٠٥ بەهاوکاری گروپی میوزیکی کورد لە سلێمانی، دواهەمین کاسێتی تۆمار کرد بەناوی (سۆزی گەرمیان) و ئەم گۆرانیانەی لە خۆ گرتووە(ئامۆزا گیان، خانزادەخان، یاروەرەوە، لەبیاوە، قەتار، بەهارەن حەبیبەخان، ڕێزە بە ڕێزە، شیرینێ وشەمامە).

*** دواهەمین بەستە و مەقام :-**

لە ٨ی مایسی ساڵی ٢٠٠٩ لە یەکەمین ساڵیادی دامەزراندی ناوەندی عەلی مەردان بۆ مەقام، ئاهەنگێکی گۆرانی و مۆسیقا لە کەرکوك ساز کرا، لەو ئاهەنگەدا سەلاّح داودە (مەقامی قەتار و خاوکەر) و بەستەی (ڕاوەستاوە لەو بانە)ی ووت، دوای هاتنە خوارەوەی لەسەر تەختەی شانۆ باری تەندروستی تێکچوو و بە پەلە گواسترایەوە بۆ نەخۆشخانەی ئازادی کەرکوك، لە کاتژمێر ٨ی ئێوارە ماڵئاوایی لە ژیانی دونیا..
تا ئێستاش چایخانەکانی جووت قاوە و حەمەی گوڵناز و شەوانی ڕەمەزان و جەژنەکانی کەرکوك ؛ سەدای (ڕاوەستاوە لەو بانە) و (ئامینێ نازەنینێ) و (ئامۆزا گیان) و (حەبێ خان)ی تێدا دەنگدەداتەوە.

*** هونەرمەند هابە :-**

دوای ئەوەی مەقامبێژەکانی پێش خۆی نەمان هابە هاتە بوون.. لە گۆرانی و خۆریاتی تورکمانی بارتەقای نەبوو، زۆر پێشکەوتوو بوو، هابە یەکەم کەس بوو لەئاهەنگەکانیدا مەقامی (نەهاوەند)ی خوێند، تا پێش ئەو تورکمانەکان ئەو مەقامەیان لەئەگلەنجەکان نەدەخوێند.

هابە یەکەم کەس بوو کە مەقامی مەنسووری پارچە مەقامێکی تری تێکرد ئەویش (نیوە شەوی) کە مەقامێکی کوردییە و زۆر بەجوانی خوێندویەتی. لە مەقامی (غەزەلی بەیات) یەکەم بوو.

هابە، هەرچەندە کوردە بەڵام زۆربەی گۆرانییەکانی بە تورکمانی وتووە ئەمەش بۆ ئەوە دەگەرێتەوە لە گەرەکێکی تورکمان نشینندا کە (موسەڵایە)یە گەورە بووە.

کاتێك کە هابە لەتەمەنی گەنجیدا دەبێت، قۆریات بێژی بەناوبانگی تورکمان (عیزەدین نیعمەت)، هابە بە هونەرمەندی تورکمان (عەبدولواحید گۆزەچی) دەناسێنێت، کاتێ گۆزەچی گوێی لەدەنگی هابە دەبێت، سەرسام دەبێ پێی دەڵێ ئەمە داهاتووی پرشنگداری هونەری تورکمانییە.

عەبدولوەهاب کە دواتر ناوەکەی بوو بە هابە، لە ساڵی ١٩٤٥ لە خێزانێکی کوردی کەرکوك لەدایك بووە، باوکی ناوی (بەرغەش )بە خەڵکی گوندی (تەرجیل)ی ناوچەی ساڵەیی یە، یەکێك بووە لە قورئانخوێنە دەنگخۆشەکانی سەردەمی خۆی، دایکی ناوی (جەمیلە) بووە کە هەمیشە جلوبەرگی کوردی لەبەر کردووە.

هابە لە گەرەکی ئیمام قاسمی کەرکوك لەدایك بووە، هەر لە منداڵییەوە حەزی بە گۆرانی و مەقامات بووە، لەتەمەنی نۆ ساڵیدا چووەتە بازاری قەیسەری گەورە لە کەرکوك و لەدوکانی وەستا ساڵح بۆتە بەرگدوور، لەکاتی کارکردندا گۆرانی وتووە، خەڵکی دەوروبەری بەو دەنگەی سەرسام بوون.

لەسەرەتای کاری هونەری گوێگری ئەم هونەرمەندانە بووە (رەشید کوڵە رەزا و عیزەدین نیعمەت، عەلی مەردان، حەسەن زێرەك، زهور حوسەین، تاهیر تۆفیق، سدیقە مەلایە،..).

*** سەرەتای ناوبانگی هونەریی هابە :-**

ساڵی ١٩٦٩ هابەو هونەرمەند (عیزەددین نیعمەت) قۆریات بێژی بەناوبانگی تورکمان، کاستێك تۆمار دەکەن، ئەم کاسێتە دەبێتە سەرەتای ناوبانگی هونەریی هابە.

ساڵی ١٩٧٣ (مەحمود قازانچی)، کە یەکێك لە هەوادارانی دەنگی هابە بووە، ئاهەنگێك بۆ هابە ساز دەکات، کاسێتی ئەم ئاهەنگە دەبێتە دەنگدانەوەیەکی هونەریی و هابە جەماوەرێکی زۆر پەیدا دەکات.

هابە گۆرانی (بلبلم نوچار.. هیواسنە) لە ئاهەنگێکدا وتووە، ناوبانگی زیاتر پەیدا کردووە.

*** هابە گۆرانی و قۆریاتی تورکمانی زیندوو کردەوە،**

هابە لەکۆتایی شەستەکان دەرکەوت لەنێو تورکمانەکان، دوای نەمانی مەقام بێژەکانی کەرکوك رەشید کوڵە رەزا و عیزەدین نیعمەت و مستەفا قەڵایی و سمە بەربەر، ساحەکە چۆڵ بوو، هابە توانی جێگەیان پڕ بکاتەوە و گۆرانی و قۆریاتی تورکمانی زیندوو کردووە.

لە خۆریاتی تورکمانی ئوستاد بوو، زۆربەی خۆریاتەکانی خوێندووە لەوانە (موچەڵا، نۆباتچی، کوردە خۆریات، کاسوك، دەللی حەسانی، عیدەلە، مەزان، بەشیری).

*** (بەیاز گویل قرمزی گویل ) یا ( کوێستان خۆشە گەرمێن )ی حەسەن زیرەك؟**

هابە، رەخنەی ئەوەی لێدەگیرێت زۆربەی گۆرانییە کوردییەکانی کردووە بەتورکمانی و ئێستا تورکمان بەموڵکی خۆی دەزانێت.

هابە لەساڵی ١٩٩٠ لەتورکیا چەند ئاهەنگێکی سازکرد زۆر لەهونەرمەندەکانی ئەو وڵاتەی بینی، لەگەڵ خانمە هونەرمەند (ئەجلان ئاڵ قاپڵان) چەند گۆرانییەکان بەیەکەوە وتووە. هابە لەتورکیا لەسەر گۆرانی (بەیاز گویل قرمزی گویل) خەڵاتی ئاڵتوونی وەرگرتووە. کە لەراستیدا ئەم گۆرانییە کوردییە، (کوێستان خۆشە گەرمێن) حەسەن زیرەك و فوئاد ئەحمەد وتوویانە، جگە لەوە هـابـە، گۆرانی (راستەی خیابان)ی مامۆستا عەلی مەردانی بەهەمان ئاواز کردووە بەتورکمانی (لالە جۆردم داغلەردا.. بلبل سەنەیر باغلەردا).

بەستەی (کەوا لەسەر کەوایە) ئاوازەکەی کوردییە کە هابە بەتورکمانی وتوویەتی (بو بەغداد دۆڵانصان).

هابە، (حەسەن زیرەك و مشکۆ و تاهیر تۆفیق و سەلاح داودە) ی خۆشویستووە و حەزی بەدەنگیان بووە.

چەند گۆرانییەکی مامۆستا عەلی مەردانی وتۆتەوە (راستەی خیابان، کەتانە کەتانە، کۆڵان بەکۆڵان، ئەمان عمشە).. پێوابووە مامۆستایە لەمەقامات.

*** هابە لەگەڵ چەندین هونەرمەندی کورد و تورکمان و عەرەب ئاهەنگی ساز کردووە:**

(سەلاح داودە، مشکۆ، حەمە درێژ، ناسر رەزازی، حەمە جەزا، کازم ساهیر، حامد سعدی، هیشام، عەبدول واحید

گۆزەچی، محەمەد رەئوف، ئیسماعیل تەرزی، سمە بەربەر، ئەکرەم تۆزلو، محەمەد ئەحمەد ئەربیلی، کەریم عوسمان، سامی جەلالی، نەجمەدین عاشق، ئامۆزا نەجات، عارەب عوسمان، حەسەن غەریب، ئیلهام مەلا عبود، کەریم گولانی، خوله دۆم (مەحمود محەمەد) ، کامەران عومەر، محمود تەرزی، ئیبراهیم رەئوف،..)

زۆرجار دەچووە لای مامۆستای مەقامات (حەمە درێژ) بۆ ئەوەی ئوسولی مەقامەکانی لێوەی فێر بێت.

هابە پەیوەندی باشی هەبوو لەگەڵ مەقامبێژی ناسراوی کەرکوك (حەمە درێژ)، زۆربەی کات دەهاتە لای، هابە پرسیاری زۆری لێدەکرد، حەمە درێژ رەخنەی لێدەگرت و هەڵەکانی لەخوێندنی مەقامەکاندا بۆ راست دەکردەوە. هابە و حەمە درێژ لەچەند ئاهەنگێکدا مەقامیان بەیەکەوە خوێندووە و کاسێتیان تۆمارکردووە.

هابە و مشکۆ چەندین جار لە ئاهەنگە و ئەگلەنجەکان بەیەکەوە بەشدار بوونە و خۆریات و بەستە و گۆرانیان و وتووە. مشکۆ و هابە زۆر یەکتریان خۆشویستووە و لە چەندین ئاهەنگدا بەیەکەوە گۆرانی و مەقام و قۆریات یان وتووە.

*** هابە و کازم ساهیر:-**

ساڵی ١٩٩٠ هونەرمەند (کازم ساهیر هاتە کەرکوك، لە هۆڵی سینەما سەلاحەدین ئاهەنگێکی ساز کرد لەو ئاهەنگەدا هابەش بەشدار بوو، دوو رۆژ بەردەوام بوو.

"لەوکاتەی کازم ساهیر لەسەر شانۆ گۆرانی دەوت، هابە هاتە ژوورەوە جەماوەر هەموو روویان بەرەو لای هابە وەرگێرا و بەچەپلەرێزان پێشوازیان لێکرد، کازم ساهیر پرسیاری کرد ئەوە کێیە؟ محافزە؟ ووتیان ئەوە هـابـەیە! ".

*** هابە.. منداڵێکی بێ باوکی بیبینایە دەستی بە گریان دەکرد:-**

هابە، ئینسانێکی سادە بوو، مرۆڤێکی هەست ناسك، چونکە هەر لەمنداڵییەوە باوکی خۆی نەدیوە و کۆچی دوایی کردووە، هەر منداڵێکی بێ باوکی ببینیایە دەستی بە گریان دەکرد، ئەمەش لە هونەرەکەی رەنگی داوەتەوە کە زۆربەی ئەو خۆریات و مەقامانەی دەیخوێند، حەزین و غەمگین بوو وەك (بەیات و سەبا و مەنسووری و ئای ئای، خۆریاتی مۆچەڵلا و نۆباتچی و مەزان)، هابە بە سۆزە مەقامی دەخوێند.

هابە تەمەنی بە ووتنی گۆرانی و بەستە و خۆریات و مەقام بەسەر برد، ئەو بۆ هونەرەکەی ژیا، ماڵی دونیای بە لاوە گرنگ نەبوو، هابە لە دڵی هەر کەرکوکییەك خاوەن ماڵبوو.

هابە بۆ تۆمارکردنی بەرهەمی هونەری نەچووەتە تەلەفزیۆن، ئەمەش لەبەر ئەوەی حەزی بە دانیشتن و ئەگلەنجە و ئاهەنگی شەوانە بوو، بە بێ مەی خواردنەوە هەڵی نەکردووە.

هابە لە (کەرکوك، هەولێر و سلێمانی، بەغدا، کفری، ئالتون کۆپری، حەبانیە، خورماتوو، تەلەعفەر، تورکیا) ئاهەنگی ساز کردووە، هابە زیاتر لە (١٠٠٠) هەزار کاسێتی دەنگی و ڤیدیۆیی ئاهەنگەکانی وەك ئەرشیف ماوە، ئەمە جگلە لەو ئاهەنگانەی تۆمار نەکراوە.

*** پارە و ماڵی دونیای بەلاوە گرنگ نەبوو:-**

هابە شەوان کە سەرخۆش و مەست بوو نەیئەزانی لە ئاهەنگەکانی پارە چی بۆ هاتووە ئاگای لەخۆی نەبوو ، لەکۆتایی تەمەنی ئیدمان و ئالودەبوونی بە مەی ئەوەندە زۆر بوو چەندجار بەرۆژیش ئەیخواردەوە، هەندێك برادەرەکانی دەستپاك نەبوون، دزییان لێ ئەکرد.

زۆرجار پێیان دەووت: حاجی تۆ ئەو پارە زۆرەت بۆ دێت، تۆ ئاگات لەخۆت نیە ئەوانەی دەورووبەرت لێت ئەدزن! ، بەلام هابە زۆر جار تورە ئەبوو ئەیوت پارە لای من گرنگ نییە، ئەوەی گرنگە هونەرو گۆرانییە". سەرەرای ئەوەی لەشەوە ئاهەنگەکان پارەیەکی زۆری بۆ ئەهات و زۆرجار ئۆتۆمبیلی بەدیاری وەرگرتووە بەلام تاکو کۆتایی ژیانیشی هەر لەکرێچێتی دابوو، پارە و ماڵی دونیای بەلاوە گرنگ نەبوو.

هابە زۆر حەزی لەمەقامی (ئای ئای) بووە، لەزۆربەی ئەگلەنجەکانی دا وتوویەتی.. ئای ئای کە یەکێکە لە مەقامە کوردییەکانی دەڤەری گەرمیان و کەرکوك، مەقامێکە بۆ دەربرینی حوزن و گریان.

هابە، دەنگێکی خۆشیی هەبوو، شارەزایی باشی هەبوو لە مەقامەکانی بەیات و راست و دیوان و حیجاز و مەنسووری و چوارگاه و نەهاوەند بوو.

(ای بویە لرندە) یەکێ لە گۆرانییەکانی (سەلیمە موراد)ە، هابە کردوویەتی (ئاخ یارن ئالندە). ئاوازێی گۆرانی (انت الحبیب)ی خانمە هونەر مەند ( زهور حوسەین)ی بە تورکمانی وتوەتەوە و کردویەتی بە (سنسن حبیب).

هابە لەگەڵ مۆسیقییەکان رەفتاری باشبوو، هەموویانی خۆشدەویست، جیاوازی لەنێوانیان نەدەکرد.. هابە پەیوەندییەکی بەتینی هەبووە لەگەڵ هونەرمەند (شەوکەت رەشید) و لە ئاهەنگێکدا ساڵی ١٩٨٨ شەوکەت رەشید عەزف کلارنێتی بۆ کردووە، یەکێ لەو گۆرانییانە (ئەی وەی زارا گیان).

*** ئەوانەی میوزیکیان بۆ هابە ژەنیوە:**

(عەبدولئیلا محێدین بەئالەتی کەمان، نازم عەلایی کە کوردێکی کاکەیی یە بە نەی، حەربی شکور- کەمان، مەحموود قلنچی - عـود، شەوکەت رەشید- کلارنێت، ئەمیر عەلی مەردان - کەمان، مستەفا رەئوف- عـود، نەجمەدین مرور - عود، فەهمی جومعە کەمان، ئیسماعیل نەقاش- کەمان، رێبین جەمال- کلارنێت،..).

*** هابە، زۆربەی گۆرانییە کوردییەکانی کردووە بەتورکمانی:-**

هابە گەلێ گۆرانیی کوردی کردووە بەتورکمانی یەکێ لەوانە گۆرانییەکەی حەسەن زیرەك (کوێستان خۆشە گەرمیان)، هەروەها گۆرانی (راستەی خیابان)ی مامۆستا عەلی مەردانی کردووە بەتورکمانی. بەلام بەشێکیش پێیانوایە شانازیە کوردێك مامۆستای مەقام و خۆریاتی تورکمانی بێت.

*** ئەو گۆرانی و بەستانەی کە هابە بە کوردی وتوویەتی:-**

( ئەی وەی زارا گیان، ئەی خودا لەم ئاگر بارانە، لیمۆ هەی لیمۆ، ، هەی ئاغا و ئاغا, باوانەکەم باوام، یار زەینەب, گیان ئازیزەکەم, کەتان کەتانە, هەی بەلارو بەلاراوە، کولەنجە کولەنجە ، جەمیلە، نەمام نەمامە، شلێرە، کراس زەردێ، کەوا لەسەر کەوایە، یا عەبا بەیلێ، نەجیبە, باران بارانە, کۆلوانە سوور تۆم ئەوێ،)

هەر هونەرمەندێك لەسەرەتایی کاری هونەریی دا بەلاسایی دەست پێدەکات، هابە ئوسولی مەقاماتی کوردی وەکو عەلی مەردان و تاهیر تۆفیق وتۆتەوە. زۆر گۆرانی کوردی کردووە بەتورکمانی. پێش هابەش، (محەمەد ئەحمەد ئەربیلی) زۆر گۆرانی کوردییەکانی عەلی مەردان و حەسەن زیرەك (یەلا شۆفێر، مامە گیانی مامە) کردووە بە تورکمانی و داویەتی بە هومەنەرمەندی تورکیا (ئیبراهیم تاتلیساس).

*** هابە و ناسر رەزازی:-**

ناسر رەزازی لە گفتوگۆکانیدا باسی ئاشنابوونی بە دەنگی هونەرمەند (هابە) گێراوەتەوە.. رەزازی وتویەتی : "سالی ١٩٧٩ چوومە کەرکوك، بۆ پەیداکردنی کاسێتی هونەرمەندان (مامۆستا عەلی مەردان، حوسێن عەلی، سەلاح داودە)، دەچێتە دوکانی تەسجیلاتێك گوێی لە دەنگی هابە دەبێ و کاریگەری زۆری دەبێ لەسەر

هونەرمەند ناسری رەزازی و حەز دەکات کاسێتێك تۆمار بکات لەگەل هابە، ئاواتەکەی رەزازی لەسالی ٢٠٠١ هاتە دی، ئەوەش کاتێ هونەرمەند (ناسری رەزازی) داوا لە رەوانشاد(نەوشیروان مستەفا) دەکات (هابە)ی بۆ داوەت بکەن بۆسلێمانی و ئاهەنگێك بەیەکەوە ساز بکەن، لەوئاهەنگەدا کە هونەرمەندان ( کەریم کابان و مەرزییە فەریقی و مەحمودی تۆفیق شلك)یش بەشدار دەبن, ئەو شەوە ئاهەنگە ٣ کاتژمێر دەخایەنێت.

دەنگ و سەدای هابە کاریگەری لەسەر ناسر رەزازی هەبووە و رەزازی زۆرجار لە خوێندنی مەقامی بەیات بە ئسلوبی (هابە و مشکۆ) مەقام دەخوێنێ. (صار قزن ئاللندە) بەستەیەکی فۆلکلۆری کەرکوکە, هابە وتوویەتی و هونەرمەند (ناسر رەزازی)ش ئەم گۆرانییە کردووە بە کوردی (چارەی خەمی من مەی نییە, مەیخانە بلێ چی), بەستەی (خانم خانم) یەکێ لەو ئاوازانەیە کە ناسر لە هابەوە گوێی لێ بووە و کردوویەتی بە کوردی (تاکەی تاکەی).

دوای ئەوەی خەبەری ئەم ئاهەنگەی هابە و ناسر بلاو دەبێتەوە و دەزگای موخابەراتییەکانی حکومەتی بەعس دەزانن کە ئاهەنگی بۆ پێشمەرگە کردووە.. لەلایەن بنکەی مۆسەلا لێپرسینەوەی لێدەکرێت، وەك لەنێو هەوادارانی دەنگی بلاوە گوایە دەرزی ژەهراوی لێدراوە، بەلام حەربی شکوری کەمانژەن کەتا دواهەمین ئاهەنگیش مۆسیقای بۆژەینیوە، ئەم قسەیە بەپروپاگەندەو دیعایە دەزانێت، وەك ئەو دەلێ پێش ئەو ئاهەنگەش هابە نەخۆش بووە و بەهۆی ئیدمان و ئالودەبوونی بەمەی، سییەکانی بەتەوای رەش بوو

بوون ئەمەش دوای ئەوەی لەنەخۆشخانە پشکنینی کرد دەرکەوت.

*** خاك و خۆلی شێخ محێدین باوەشی بۆ تەرمی هابە کردووە:-**

هابە لەرێکەوتی ١٧ی ئابی سالی ٢٠٠١ لە مالەکەی خۆیدا کۆچی دوایی کرد، هابە دەرزی ژەهراوی لێنەدراوە بەلکو بەنەخۆشی مردووە, بەئامادەبوونی سەدان کەس لەهەوادارو گوێگرانی دەنگی، تەرمەکەی بەرێکرا سەرەتا بۆ بەردەم قەلا دێرینەکەی کەرکوك لەوێوە بۆ گۆرستانی شێخ محێدینی بەرتەکیە..

هابە کە مرد ئەگلەنجەش نەما لە کەرکوك.. قوتابخانەیەك بوو بۆ گۆرانی و خۆریاتی تورکمانی، چونکە تا ئێستاش هەرچی گۆرانبێژی تورکمانە لاسایی دەنگ و ئەدای هابە دەکەنەوە، ئەمە جگە لەوەی دەنگی هابە کاریگەری زۆری هەبووە لەسەر هونەرمەند ناسری رەزازی (وەك خۆی لە چەند گفتوگۆیەکدا باسی کردووە).

*** سەرچاوە:-**

- دیدار لەگەل مامۆستا میقداد محەمەد عومەر, شارەزای هونەری مەقامات.
- عومەرە درێژ, مەقامبێژ, کوری مەقامبێژی ناسراوی کەرکوك (حەمە درێژ).
- حەربی شکور, کەمانژەن کە بیست سال زیاتر هاورێ هابە بووە و موزیکی بۆ ژەنیوە.
- چاوپێکەوتنی هونەرمەند ( ئەمیر عەلی مەردان) ژەنیاری عود و کەمان.
- چاوپێکەوتن لەگەل هونەرمەند (حەسەن غەریب), لەچەند ئاهەنگێدا لەگەل هابە مەقام و بەستەیان وتووە.
- دیداری کەمانژەن (ئیسماعیل نەقاش)

**تەق تەق لە ساڵی ١٩٦٠ هەندێك لە ناوی ئەو کەسانی کە ناسراوەتەوە:**
**(ئەحمەد حوسێن، خالید دلێر، ڕەمەزان زامدار، شێخ تەحسین تاڵەبانی، حوسێن عەلی قاچاخچی، قادر دانساز، شێخ جەبار، ئیبراهیم ئەحمەد، شەهید جەلال کەریم، مەلا ڕەشید توتنچی، عەبدولئیلا محێدین، سەلاح عەباس).**

**شوکر جەیران و هەردەوێڵ کاکەیی**

سالّی ١٩٦١، پێش شۆڕشی ئەیلول بە چەند مانگێک لە ناوچەی تەق تەق، ناوەکان:
ئۆکۆردیۆن: سەلاّح عەباس، کلارنێت: ڕەمەزان زامدار، کەمان: عەبدولئیلا محێدین

کوێر عیزەت و محەمەد ئەحمەد ئەربیلی و عیزەددین نیعمەت و عوسمان تەپڵە باشی و محەمەد بەلاّ و حەبیب هورمزلی

برای مەلا محێدین سەلاّح عەباس و ڕەمەزان زامدار و عەبدولئیلا و شەهید جەلال کەریم و
مەلا ڕەشید توتنچی و شێخ مەلیك شێخ ڕئوف خانەقا و خانزاد، ساڵی ١٩٦٠

مەلا جومعە و عەبدولواحید گۆزەچی و مەلا عەبود و مەلا مەحمود و مەلا حەسەن لە ئاهەنگێکی ئایینیدا

جومعە محێددین

خولە چاوش

هەر یەکە لە هونەرمەندان: حاجی عەبدولڕەحمان عەزاویو حاجی هاشم ڕەجەبو حاجی محەممەد عاشورو میقداد محەممەد
لە ٣٠ی ئاداری ساڵی ١٩٧٩

**کۆمەڵێك لە هونەرمەندانی شاری کەرکوك: شکور حوسێن و میقداد محەمەدو سەلاّح داوودەو ڕەمەزان زامدارو محەمەد عەبدولڕەحمان**

**ئەبو بەکرو عەباس محەمەدو عادل عەبدوڵلاو ڕەمەزان زامدار**

**ناسیح و مەرزیەو ڕەمەزان زامدارو ناسری ڕەزازی، لە ساڵی ١٩٨٤**

**ڕەمەزان زامدارو مامۆستا موزهەر مەلا ئیبراهیم و ئیسماعیل گەیلانی و دڵنیا ڕەزازی و کوڕەکەی ڕەزازی**

*** تیپی مۆسیقای ( بێکەس - سۆلاف ) لە یادەوەری ڕۆژگاری جارانی کەرکوکدا :**

**زاهیر شکور**

ساڵی ۱۹۳۲، ئەندازیارێکی بەریتانی بە ناوی (مستەر بڕات) لە فەرمانگەی (بەرق و بەرید)ی عێراق کۆڕێکی دەربارەی ئامێری ڕادیۆ لە یەکێك لە ئامادەییەکانی بەغدا پێشکەش کرد، (بڕات) لە کۆڕەکەدا باسی گرنگی ڕادیۆی کرد، هەر لەو ساڵەدا حکومەتی ئەوسای عێراق، لە سەرەتاوە بە شێوەیەکی ئەزموونی ڕۆژانە لە کاتژمێر (۸:۳۰ بۆ ۱۰:۳۰)ی بەیانی دەستی کرد بە پەخشکردنی گۆرانی و هەندێك بەرنامە، هەر ئەو ساڵە شا فەیسەڵی یەکەم پاشای عێراق بە بۆنەی کردنەوەی پێشانگایەکی تایبەت بە پیشەسازییەوە ووتارێکی پێشکەش کرد، لە زۆر شوێنەوە خەڵکی گوێی لە ووتارەکە بوو، تەنانەت پەخشی ڕادیۆکە دەگەیشتە قاهیرەی پایتەختی میسر.

ئەمە بووە هاندەرێك بۆ ئەوەی بیر لە دامەزراندنی ئێزگەیەك بکرێتەوە، دوای ئەو ئەزموونەو لە (۷)ی تەموزی ساڵی (۱۹۳٦) ئێزگەی ڕادیۆی بەغدا بە فەرمی دەستی کرد بە پەخشی بەرنامەکانی خۆی. یەکەم دوو بێژەر خوالێخۆشبووان (حوسێن گەیلانی و موحەمەد عەبدولەتیف) بوون، هونەرمەندان موحەمەد گوبانچی و ڕەشید قۆندەرچی و عەبدولڕەحمان بەناو سەلیمە موراد کە جوولەکە بوو دواتر بووە هاوسەری نازم غەزالی و هەروەها هونەرمەندان زەکییە جۆرج و ئەمیرە جەمال و عەزیز عەلی، یەکەم پۆلی هونەرمەندان بوون پەیوەندیان بە ئێزگەوە کرد. هونەرمەندی گەورەی کوردو کەرکوك عەلی مەردان یەکەم هونەرمەندی کورد بوو خۆی گەیاندە ئێزگەی بەغدا، بەدوای مامۆستا (عەلی مەردان)دا حوسێن عەلی و دواتریش سەلاح داودە بەرەو ئێزگە لە کەرکوکەوە بە سواری شەمەندەفەر کە بە (۱۲) سەعات لە کەرکوکەوە دەگەیشتە بەغدا کەوتنە ڕێ. ئەو عەیام و ڕۆژگارە لە کوردستان بە کەرکوکیشەوە ئێزگە نەبوو، تەنانەت کەرکوك تیپی مۆسیقایشی نەبوو. نەبوونی تیپی مۆسیقا لە کەرکوك زۆری کێشا، تا (١٤)ی تەموزی ساڵی (١٩٥٨) کە سوپای عێراق بە فەرماندەی عەبدولکەریم قاسم و عەبدولسلام لە کودەتایەکدا کۆتایان بە سستمی حوکمڕانی پاشایەتی هێناو سیستمی حوکمڕانیان گۆڕی بۆ سستمی کۆماری، سیستمی کۆماری هەندێك ئازادی و جۆرێك لە کراوەیی لەگەڵ خۆی هێنا، ئەمە دەرفەتێکی ڕەخساند بۆ دامەزراندنی یانەو ناوەندو تیپی جۆراوجۆر کە بووە مایەیی لەدایك بوونی یەکەم تیپی مۆسیقا لە کەرکوك.

(ڕەمەزان زامدارو عەبدولئیلا موحێدین و سەلاح عەباس) بوونە سێ ئەستێرەی گەشاوەو پرشنگدار لەئاسمانی کەرکوك، بەڵێ ئەم سێ کەڵە هونەرمەندە، ئەم سێ بەڕێزە ناویان چووە دونیای مۆسیقاو گۆرانییەوە، هەنگاوی یەکەم بۆ دامەزراندنی تیپێکی مۆسیقا ئەمان نایان و دامەزراندنی تیپی مۆسیقای بێکەسیان ڕاگەیاند. ڕۆژگاری (١٤)ی تەموز ڕۆژگاری نیشتمان پەروەریی و خەباتی کوردایەتی بوو، شیعرەکانی شاعیری گەورەی کورد فایق بێکەس ئاگری ئەکردەوە، ئەی وەتەن مەفتوونی تۆم وشێوەتم بیر کەوتەوە، گەورەو بچوك دەیانوتەوەو لەبەر دەکرا، ناوی یەکەم تیپی مۆسیقاش لە کەرکوك بێکەس پڕ بەری بوو، بارزانی گەڕابۆوە، پارتی مۆڵەتی وەرگرت بوو، لە هەموو شارەکان بارەگای کردبۆوە، ڕۆژانە ئاهەنگ گێڕان بوو، ڕۆژ ڕۆژی کاك ڕەمەزان زامدارو هاوڕێکانی و تیپی مۆسیقای بێکەس بوو، تیپەکە لە هەموو بۆنە نیشتمانی و ئاهەنگەکاندا بەشداری کرد. ناوو ناوبانگی بە هەموو لایەکدا بڵاوبووە، هونەرمەندانی تری کورد، تورکمان، ئەرمەن، عەرەب ڕوویان تێکرد بوونە ئەندامی تیپەکە، تیپەکە لەسەر دەستی کاك ڕەمەزان و هاوڕێکانی تەکاملی کردو چووە قۆناغی دانانی ئاوازەوە بۆ هونەرمەندانی کورد، لەم سۆنگەیەوە هونەرمەندان (جەلال وەندی، حوسێن بەهادین، جەبار سۆدەچی، ڤارگیس، قادر مەردان، ئەنوەر تایر، سەردار بێ بەخت، نەجمەدین قەرداش، سەلاح سەڕاج، سالح مەولود، دواتریش شەوکەت ڕەشید) بەشدارییان کرد.

تیپی مۆسیقای سۆلافی کەرکوك

تیپی مۆسیقای سۆلافی کەرکوك

تیپی مۆسیقای بێکەس بووە تیپێکی گەورەو گرنگ‌و ناودارو دەیان ئاهەنگیان گێڕا، بەشداری چەندین فیستیڤاڵیان کردو درێژەیان بە کارو چالاکیە هونەرییەکانیانداو لەسەر دەستی ئەم تیپە مۆسیقای کوردی لە کەرکوك گەشەیەکی زۆری کرد، تا ساڵی (١٩٦٩) بەڕێزان شێخ پیرۆت‌و شێخ ستارو هاوڕێکانیان یانەی وەرزشی سۆلافیان دامەزراند، تیپی مۆسیقای بێکەسیش ناوەکەی گۆڕی بۆ ناوی سۆلاف، ئیتر یانەی وەرزشی سۆلاف‌و تیپی مۆسیقای سۆلاف بوونە دوو بووکی ئێسك سووك‌و ناوازەی دنیای مۆزیك‌و گۆرانی‌و وەرزش لە کەرکوك. لەو یانەو تیپەوە سەدان گەنج‌و لاو بوونە وەرزشکارو میوزیك زان‌و گۆرانی بێژ.

تیپی مۆسیقای سۆلاف لە شاشەی تەلەفزیۆنی جارانی کەرکوکەوە دەیان گۆرانی‌و پارچە مۆسیقایان تۆمارکرد، لە دەیان ئاهەنگ‌و بۆنەدا بەشداریان کرد، هونەرو مۆسیقاو گۆرانی کوردیان پێشخست، هونەرمەندانی نەتەوەکانی تری کەرکوك ڕوویان تێکرد، تیپی مۆسیقای سۆلاف بووە ماڵی هونەرمەندانی هەموو پێکهاتەکانی کەرکوك‌و تەنانەت بەچەندین ئاوازی جوان‌و ناسك بۆ هونەرمەندانی شارەکانی تر سنووری کەرکوکی تێپەڕاند.

بەڵێ ڕەمەزان زامدارو هاوڕێکانی بەسەرەتایەکی سادەو ساکار بوونە ڕەچە شکێن‌و خەرمانی موزیك‌و گۆرانی کوردیان دەوڵەمەند کرد. ئێستاش ڕەمەزان زامدار وهاوڕێکانی بوونەتە بەشێکی هەمیشە زیندوی هونەری کوردی، هونەری کوردی لە کەرکوك بەتایبەتی مۆزیك قەرزاری زامدارو عەبدولئیلاو سەلاحە، کە خەرمانێك گوڵی ڕەنگاو ڕەنگ‌و دنیایەك ئاوازی جوانیان بۆ بەجێهیشتین کە تا ئەم ئان‌و ساتەش لە گوێماندا دەزرنگێتەوە وهەموو ئاهو وحەسرەت بۆ ڕۆژگارە زێڕینەکانی ئەو عەیامە هەڵدەکێشین، ڕۆژگارێك بوو بەشێ لە جوانیەکانی ئەو عەیامەی لەگەڵ خۆی برد کە زەحمەتە هونەرمەند وپیاوی وەك ئەوانە دروست ببێتەوە.

وەرزشکاران‌و ڕێکخراوە دیموکراتیەکان ئازایانە یانەی سۆلافیان دامەزراندوە، ئێستا ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێ لە بواری وەرزش لە شارەکە، بەڵام بەداخەوە تیپی مۆسیقای سۆلاف بووە بەشێك لە ڕابردوو وەك چۆن کتێبخانەی (ئاسۆ)ش ڕابردوو لەگەڵ خۆیدا ئەویشی ڕاپێچی، بۆ ئێمەش ئاەو حەسرەتێکی زۆریان بە جێ هێشت کە نەك لەیادەوەری ئێمە هەر دەمێنن، بەڵکو ئەوە لە دوای ئەوە بۆ یەکتری دەگێڕنەوە، چونکە تیپی مۆسیقای سۆلاف‌و یانەی سۆلاف‌و کتێبخانەی ئاسۆ سەردەمێکی ئێجگار هەستیاری مێژووی کوردیان بە ڕەنگی خۆیان ڕەنگکرد، بوونە بەشێکی ئێجگار جوان‌و گرنگی کەرکوك کە هەموومان شانازیان پێوە دەکەین، چونکە کورد نیە لەو ڕۆژگارەدا ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەگەر بۆ جارێکیش بووبێت سەردانی لایەنی کەم یەکێك لەو شوێنانەی نەکردبێ، جارێکی تریش دەیڵێمەوە: چونکە ماڵی هەموو کورد بوون.

بەیاننامەی (١١)ی ئاداری ساڵی (١٩٧٠) لە هەموو بوارە ڕووناکبیری وسیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و هونەرییەکاندا وەرچەرخانێکی گەورە بوو، بەیاننامەی (١١)ی ئادار هەل‌و مەرج‌و دەرفەتی گونجاوی ڕەخساند بۆ گەشەپێدانی ڕووناکبیری‌و هونەری لە کوردستان بە گشتی‌و لە کەرکوك بە تایبەتی. تەلەفزیۆنی ئەوساکەی کەرکوك، وێستگەیەکی گرنگ‌و هەستیار بوو بۆ نەوگەشەکردنە بە تایبەتی بۆ تیپی مۆسیقای سۆلاف، لێرەوە لە بەیاننامەی ئادارەوە قۆناغێکی نوێی تەلەفزیۆنی کەرکوك‌و تیپی مۆسیقای سۆلاف دەست پێدەکات. قۆناغێك بە سەرپەرشتی‌و بەڕێوەبردنی ئاهەنگی یەکەم ساڵیادی بەیاننامەی

(١١)ی ئادار بوو لە گوندی حەسار چونکە دەرکەوتنی تواناکانی تیپی مۆسیقای سۆلاف بوو لەو ئاهەنگە، هەر لەو ئاهەنگە عەباس محەمەد (عەباس وەی وەی)ی وەك گۆرانی بێژێکی گەنج زیاتر دەرکەوت و خەڵك ناسی، ئاهەنگی حەسار بۆ ئەو زەمانەی خۆی بە گەورەترین ئاهەنگ دادەنرێ، تا ئێستاش لە مشت ومڕو موناقشەکردنی ناوەندە ڕووناکبیری و هونەرییەکاندا ئەو ئاهەنگە بە نمونە دەهێنرێتەوە، هەم لە ڕووی گەورەیی ئاهەنگەکەوەو هەمیش لە بەر ئەوەی بۆ یەکەم جار لە کەرکوك ئاهەنگی وا گەورەو قەرەباڵغ بکرێت کە لە ڕووی هونەرییەوە توانای تیپی مۆسیقای سۆلافی دەرخست، چونکە ئامادەکردن، بەڕێوە بردن، دانانی بڕگەو بەرنامەی ئاهەنگەکە هەمووی تیپی مۆسیقای سۆلاف بوو، کە ڕەمەزان زامدارو هاوڕێکانی مامۆستای خوالێخۆشبوو ڕەفیق چالاکیان کردبووە سەرپەرشتیاری ئاهەنگەکە، خوالێخۆش بوو ڕەفیق چالاك، هاوڕێی زیندانی ڕەمەزان زامدار بوو، لە گرتوخانەی سەرای کەرکوك. مامۆستای هەمیشە زیندوویش خالید دلێر بە هۆنراوەو ئاوازەکانی ئاهەنگەکەی زیاتر خۆشکردبوو، گۆرانی بێژان (قادر مەردان و عەلی عەزیزو حەمە ڕەزاو عەباس محەمەد) یش بەشداریان تێداکرد، ئاهەنگی حەسارو تیپی مۆسیقای سۆلاف، شوێنێکی تایبەتیان لە زاکیرەی هونەری کەرکوك و ئەوەی ئەو عەیامە بەجێهیشت.

تا هەڵوەشانەوەی تیپی مۆسیقای سۆلاف شەوکەت ڕەشیدو قادر مەردان و عەلی عەزیزو عەباس وەی وەی و هونەرمەندانی تریش پێش ئاهەنگی حەسار ودواتریش تیپی مۆسیقای سۆلاف لەسەر دەستی ئەمان و بە هاوکاری ئەندامەکانی تیپەکە درێژەی بە گەشەپێدان و بەرەو پێشبردنی هونەری مۆسیقاو گۆرانی داو تەنانەت سنووری کەرکوکیشیان تێپەڕاند بۆ هونەرمەندانی شارەکانی تری کوردستان کە لێرەدا بەشێکیان ڕیزبەند دەکەین:

١. عەلی عەزیز، گۆرانی (بۆ ئەویارە لێم زیزە) شیعری ڕەمەزان زامدارە (شۆخی نازدار) ئاوازو شیعری هەردوو گۆرانی (گیانەکەم لێت دوورم و گۆرانی (دوو چاوی شین ومن وزەردە خۆر) هەمووی لە لایەن ڕەمەزان زامداری دامەزرێنەری تیپی مۆسیقای (بێکەس-سۆلاف)وە ئاواز وهۆنراوکەی دانراوە. هەروەها سروودی (ئێمە گەلێکین هەرگیز نابەزین.. لە مافی خۆمان قەت دانابەزین) هۆنراوە وئاوازی ڕەمەزان زامدارە.

٢. قادر مەردان، هۆنراوەی گۆرانییەکانی (یار یار، یادم کەوە، بێ بەینەتی، قەت ئەم ئەزانی، دەرگای ماڵی یار، دوێنێ بەیانی) هەموو هۆنراوەی ئەم گۆرانیانە ڕەمەزان زامدار دایناوە ئاواز ووتنەکەشی مامۆستا قادر مەردان بوو، مامۆستا قادر مەردان ئەندامێکی دیارو چالاکی تیپی مۆسیقای سۆلاف بووە، کەمانچەژەنێکی بە توانای کەرکوك بوو، ڕۆژگارێك گۆرانی (بێ ئومێدی کەوتە دڵی غەمناکم.. سامناکی پۆشی ڕۆژی ڕووناکم) کە هۆنراوەی مستەفا زەنگەنەو ئاوازی مامۆستا قادر مەردان خۆیەتی، لە هەموو کوردستاندا دەنگی دایەوە، ماوەیەکی زۆر ڕۆژانە تەلەفزیونی کەرکوك لێدەدایەوە وێنەکەشی ڕەش وسپی بوو. دەیان حیکایەت و ئەفسانە بۆ ئەو گۆرانییە دروست کرا.

٣. مامۆستا عەلی مەردان: هۆنراوەی گۆرانییەکانی (بۆ تۆ ئەژیم، لەیلا) ڕەمەزان زامدار دایناوە.

٤. ژیان ئەحمەد (دکتۆرە بەلقیس) هۆنراوەی (وەرەلام دەم بەگۆرانی) ڕەمەزان زامدار ئەم هۆنراوەی داناوە. هۆنراوە وئاوازی بۆ (ئاسکێکی بریندار وگۆرانی ئەم کۆڵان وئەو کۆڵان) داناوە. جگە لە مانە مامۆستا ڕەمەزان زامدار ئاوازو هۆنراوەی بۆ هونەرمەندان (جەلال کۆچەرو شەوکەت ڕەشیدو تەها جاف، حەمە ڕەئوف کەرکوکی) داناوە، مامۆستا قادر مەردانیش ئاوازی بۆ دەیان گۆرانی داناوە، جگە لە چالاکی و کارەکانی خوالێخۆشبوو شەوکەت ڕەشید کە ئەستێرەیەکی گەش وجوانی ناو تیپی مۆسیقای سۆلاف بوو.

تیپی مۆسیقای سۆلاف درێژەی بە کارە هونەرییەکانی داو و لە زۆربەی ڤیستڤاڵ و ئاهەنگەکانی کوردستان بەشداری دەکرد،

تیپی مۆسیقای سۆلاف لە ٩ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٦٤

ساڵی (١٩٧٤) ساڵی تێکچوونی بارودۆخی کوردستان بوو، ساڵی پەشیمانبوون و پاشگەزبوونەوەی بەعس بوو لە برگەو بەڵێنەکانی بەیاننامەی (١١)ی ئادار، لەگەڵ تێکچوونی بارودۆخەکەو هەڵگیرسانەوەی شەڕ لە لایەن حکومەتی عێراقەوە دژی کورد، ئاستەنگ دروستکردن و دژایەتیکردن دژی هەموو یانەو ناوەندە کوردییەکان دەستیپێکرد، هەر ڕۆژەی ناوەندێك دادەخرا، لەو سەروبەندەشدا تیپی مۆسیقای سۆلاف هەڵوەشێنرایەوە ئەندامانی تیپەکە پەرش و بڵاوبوونەوە.

ئەوەی ماوە کۆمەڵێك یادگاری وێنەو گۆرانی تۆمار کراوی ئەو ڕۆژگارەیە کە بەشێکی لەلای کاك ڕەمەزان زامدارە وبەشێکی تریش لەم ئێزگەو ئەو ئێزگەیەو لە زاکیرەی ئێمەمانانیشدا گۆشەیەکی پڕ سەروەری تۆمار کردووە.

لە ڕەمەزان زامدارەوە دەستمان پێکردو هەرلەویشەوە، ئەم تۆزە وەفاو یادگاریانە دەخەینە سەر خەرمانە زێڕینەکەی تیپی مۆسیقای سۆلاف و جارانی کەرکوك و بەژیاننامەی ڕەمەزان زامدار خوا حافیزی لە تیپی مۆسیقای سۆلاف و هەموو ئەوانە دەکەین کەڕۆژێك لەڕۆژان لەگەڵ ئاوازەکانی سۆلاف خەم و ئاهێکیان بە باداداوە.

ماوەتەوە بڵێن، ڕەمەزان زامدار: لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی (١٩٤٣)، لە گەڕەکی ئیمام قاسم لەدایك بووە، لە مزگەوتی (شێخ جەواد) دەنرێتە بەر خوێندنی حوجرە، پاش خەتمکردنی قورئان و خوێندنی مەولودنامەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لە ئیمام قاسم تەواو دەکات و پەیمانگای نەوت تەواودەکات و لەکۆمپانیای نەوت دادەمەزرێت، ساڵی (١٩٦٣) دەیگرن. ساڵی (١٩٧٦) لە کۆمپانیای نەوت فەسڵ دەکرێت. ساڵی (٢٠٠٦) دەگەڕێتەوە سەر کارەکەی، ئێستا خانەنشینە و خاوەن ستۆدیۆی ڕەمەزانە لە شەقامی جمهوری، ستۆدیۆکەشی نزیکەی (٤٥) ساڵ بیرەوەری شەقامی جمهوری تۆمار کردوە. لە دوای ئەم کاروانە دوورو درێژە، ڕەمەزان زامدار هەقە ئاوڕێکی ڕێزلێنانی لێبدرێتەوە بە تایبەتی لەلایەن (ی. ن. ك) چونکە کاك ڕەمەزان وێستگەی کادرەکانی باڵی مەکتەبی سیاسی بووو یادەوەریەکانیان ڕەگ و ڕیشەی لە ناو یەکێتیدا هەیە، کاتێ جارانی کەرکوك میوانی ڕەمەزان زامدار بوو، کادرێکی ئەو ڕۆژگارو عەیامە لەوێ بوو ئەویش هەڤاڵ نەجمەدین گلی بوو.

*** تیپی مۆسیقای کەرکوك:**

لە دوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلولی ساڵی (١٩٧٥) زۆربەی ئەندامەکانی تیپی (سۆلاڤ) بەرتەوازە بوون، بەڵام بەشێك لەم هونەرمەندانە لەگەڵ هەندێك لە هونەرمەندانی عەرەبی و تورکمان و ئاشووری تیپی مۆسیقای (کەرکوك)یان دامەزراند لە دواتر بوو بە تیپی مۆسیقای (تەلەفزیۆنی کەرکوك) کە زۆربەی ئەندامەکانی لە عەرەب و تورکمانی و ئاشووری پێکهاتبوو.

هاوکات لە سەردەی شەڕی عێراق-ئێراندا پاڵەپەستۆیەکی زۆر کەوتە سەر ئەو تیپە بەوەی زۆرترین سوود بۆ قادسیەی سەدام تۆمار بکەن، ئەمەش وای کرد (تیپی مۆسیقای تەلەفزیۆنی کەرکوك) چ لە ڕووی کەسایەتیی مەعنەوییەوە، یان لە ڕووی کاری هونەری و داهێنانەوە لە پاشەکشە بدات، ئەویش تا کۆتایی ساڵانی هەشتاکان بەردەوام بوو و پاشان هەڵوەشایەوە.

*** تیپی مۆسیقای قوتابخانەی ئاسوری لە کەرکوك:**

بەڕێز مامۆستا باکووری بەم جۆرە باسی گۆرانی و مۆسیقا دەکات لە کەرکوك:

"لە ساڵی ١٩٥٠ لە کەرکوك مامۆستایەکی مۆسیقا (عودژەن) هەبوو، وابزانم خەڵکی بەغدا بوو، سەرپەرشتی تیپی مۆسیقای (شرقی) دەکرد کە شەوانە لە (ملهی کەرکوك) مۆسیقایان بۆ

ڕەمەزان زامدارو شەوکەت ڕەشید

گۆرانیبێژەکان لێ ئەدا. لە هەمان کاتیش، بەڕۆژ، هەر لەو ئوتێلەی لێی دابەزیبوو کە وابزانم (فندق كركوك) بوو، یەکسەر بەدیواری چاپخانەی مەجیدییەوە نووسا بوو، واتا لەسەر شەقامی (مجيديه) بوو، لە نێوان باخچەی یانەی فەرمانبەرانی کەرکوك‌و چاپخانەی مەجیدییە بوو، لە بەرامبەر، لەوبەر جادەکە، دائیرەی پۆستەو تەلەگراف بوو، ئا لەو ئوتێلە مامۆستای ناوبراو (جۆرج الخيالي) دەرسی مۆسیقای فێر دەکرد بۆ ئەو کەسانەی حەزیان دەکرد فێری مۆسیقاو عودژەنین بن، کە منیش یەکێك بووم لەو گەنجانە.

ماوەی دوو مانگێکە لەلای (جۆرج الخيالي)، هەموو عەسرێك (دوای دەوامی قوتابخانەم)، دەچوومە ئوتێلەکەو بە نۆتە عودی فێری من‌و برادەرانی دیکەی دەکرد، ئەم جۆرج الخياليه چاوەکانی کزبوون، چاویلکەی مەیلەو ڕەشی لە چاو بوو، بەلام پۆشتە بوو، زۆر لە هونەرمەندانی بەغداو گۆرانیبێژو ئاواز دانەری ئەوسا لەسەر دەستی ئەو مامۆستایە فێری عود ژەنین بووین، یەکێکیان هونەرمەند (محەمەد نوشی) بوو کە دوایی بووە ئاواز دانەرێیك زۆر باش‌و گۆرانییەکانی شێوەی میللی‌و شەعبی بوون‌و پشتی بە مەقام‌و فۆلکلۆرو ڕەسەنایەتی ئاوازی عێراقی دەبەست.

جۆرج الخيالی گەڕایەوە بەغدا، منیش هەر خۆم بە پرۆڤەکردن‌و مەشقکردن‌و خوێندنی کتێبی جۆراجۆری لەسەر مۆسیقا وەك کتێبەکەی لە بابەت (المۆسيقا الشرقية) کە لە دانانی کەمانجەژەنی بە ناوبانگی سالانی چل‌و پەنجاکان بوو ناوی (سامي الشوا) بوو، ئیتر بەرە بەرە لەو ئاهەنگە گۆرانییانەی بانگهێشت، دەعوەت دەکرام عودەکەم دەبردو بە عودەوە گۆرانیم دەگوت‌و هیواداریش بووم، کە بچمە بەغداو زیاتر مۆسیقا بخوێنم!

لەو سالەشدا، سالی ١٩٥١و ١٩٥٢ بەولاوە، لەگەل هەندێ برادەری دیکەی هونەرمەندی مۆسیقاژەن تیپێکی مۆسیقامان پێکهێنا بە ناوی (تیپی مۆسیقای قوتابخانەی ئاسووری لەکەرکوك)و لە هەموو ئاهەنگەکانی گشتی‌و بۆنە نەتەوەیی‌و بووك گواستنەوە، ئێمە مۆسیقامان لێ ئەداو تەنانەت مۆسیقای ڕۆژئاواییشمان دەژەنی بۆ ئەوەی (دانس) واتا سەمای لەسەر بکەن.

لەلایەکی ترەوە، لەگەل هونەرمەندانی شاری کەرکوك کە ئەوساکە لەگەل هونەری گۆرانی خەریك بوون‌و ناویان هەبوو، تیپێکی (شرقي) دیکەمان کۆکردەوەو چالاکییەکانی شاری کەرکوکی قەلاو قۆریە، بۆ ئاهەنگەکانی کوردو تورکمان‌و عەرەب ئامادە دەبووین‌و شایی‌و بەزمی ئەوانیشمان دەڕازاندەوە، ئەوانەی لە بیرمن ناویان:

١. ئیلهام مەردان، جوانترین کەمانجەی دەژەنی.

٢. ساتع کۆپرلو، گۆرانی (فريد الاطرش)و تورکمانی دەگوت‌و کەمێك عودیشی لێ ئەدا.

٣. مەمەد قەلایی، عودێکی زۆر جوانی لێ ئەداو قۆریات‌و گۆرانی تورکمانی ڕەسەن‌و بە ئاوازی خۆشی دەچڕی.

٤. دایی قادر، لە ئێمە بە تەمەنتر بوو، تەپلێکی باشی لێ ئەداو خاوەن زەوق‌و خۆش مەشرەب بوو.

٥. فایق نەجار، قۆریات‌و گۆرانی تورکمانی دەگوت.

٦. مەجید، ناوی باوکی یا لەقەبەکەیم لە یاد نەماوە، حەزی لە گۆرانی ڕیفی عەرەبی دەکردو دەیگوتن لەگەل مەقاماتی عێراقی.

٧. عەبدلواحید گۆزەچی ئۆغلۆ، گۆرانی‌و قۆریاتی تورکی زۆری دەزانی‌و لە کەرکوك، لەدیوەخانەی ناوداران‌و مالە فەرمانبەرە گەورەکان ناسرا بوو، هەمیشە ئێمە لەگەلیا مۆسیقامان لێ ئەدا.

٨. خۆشم عودم لێ ئەدا گۆرانی کوردی‌و ئاسووریم دەگوت لەو سەیران‌و ئاهەنگ‌و دانشتنی دیوەخان.

لە زۆربەی مالی بەرپرسەکان‌و گەورە پیاوەکانی شار لە دیوەخانەکانیانا زوو زوو بە یەك دەگەییشتنەوەو شەوی خۆشیان ڕادەبواردو ئێمەش میوانی شانازییان دەبووین: شامیل یەعقووبی، خوای لێ خۆشبێ، ئەنوەر ئاوچی، کامیل تکریتی، چەند مالێکی تر کە ناویانم لە بیر چوونە، ئێمەیان زۆر ڕێز لێ دەگرتین، جوانترین خزمەتیان دەکردین لە کاتی دانیشتنیان‌و رابواردنیان، هەزارەها سلاو لە گیانیان بێ، شاری کەرکوك شارێکی هێمن بوو، هەموو دانیشتوان ژیانێکی ئاسوودەو خامۆش‌و لەگەل یەك بە خۆشی دەژین، جیاوازی نێوان ئەم‌و ئەم، یا هەڕەشە لە یەکتر کردن زۆر زۆر کەم بوو، دەگمەنیش بوو. بەلام دوای شۆڕشی (١٤)ی تەمووز ئیتر وەزعەکە لە هەموو لایەك تێکچووو ناخۆشی‌و حیزبایەتی‌و چینایەتی دەستی پێ کرد لە دوای سالێك لە تەمەنی شۆڕشەکە".

### * تیپی (الفرقة القومية التركمانية):

لە سەرەتادا ئەم تیپە لە سالی (١٩٦٠) بۆ یەکەم جار لە بەغدا لەلایەن کۆمەلێك لە قوتابیانی زانکۆ بە سەرپەرشتی ڕاهێنەر (خەدیجە هاشم) دامەزراوە، بەلام لەسەر چالاکی ئەم تیپەو ئاستی بلاوبوونەوەی لە کەرکوك لە سالی (١٩٧٠)دا لەسەر بنەڕەتی هەمان تیپ لە کەرکوك دامەزرا بە سەرپەرشتی (غازی عەبدولمەجید، موزەفەر نوری، محەمەد قاسم، فەیسەل محەمەد، حەسەن نەفتچی).

شوێنی تیپەکەش لە بالەخانەی (جمعية الهلال الاحمر العراقي) لقی کەرکوك بوو، سەرپەشتیاری تیپەکە بریتی بوو لە: (سەباح سەعید سدیق)و هەر یەکە لەم قوتابییانەی خوارەوە لە ناوەندی‌و ئامادەیی بەشدارییان تێدا کردووە:

(سەباح نوری، غانم ڕەشاد، کەرەم عومەر، محەمەد هاشم، کەریم بیرەقدار، خەلیل قەساب، ئیسماعیل سەباغ، عەبدولڕەزاق نەجیب، خالید ڕەزا، حەمید ڕەزا، ئەنەس عیزەددین، محەمەد عەلی، عەلی چۆپان).

### * تیپی مۆسیقای باوە گوڕگوڕ:

لە دوای پرۆسەی ئازادی لە سالی (٢٠٠٣)دا لە ڕێگەی لقی کەرکوکی سەندیکای هونەرمەندانەوە تیپێکی مۆسیقی دامەزرا بە ناوی (تیپی مۆسیقای باوە گوڕگوڕ).

### * تیپی مۆسیقای کەرکوك:

لە دوای پرۆسەی ئازادی لە سالی (٢٠٠٣)دا لە ڕێگەی ناوەندی کەرکوکی یەکێتی هونەرمەندانەوە چالاکی هونەری بە ناوی ئەم تیپە پێشکەش دەکرا.

*** تیپی مۆسیقای شەفەق:**

**ئەم تیپە لە مانگی (٦)ی ساڵی (٢٠٠٣) لەلایەن دەزگای رۆشنبیری (شەفەق)ەوە لە کەرکوك دامەزراوە، لە دواییدا ناوکەی بووە بە (تیپی مۆسیقای شەفەقی کوردستان) کە ڕاستەوخۆ لەلایەن بەڕێوەبەری دەزگای (ئاراس)ەوە پشتگیری دەکرا.**

*** تیپی مۆسیقای کەناڵی ئاسمانی کەرکوك:**

**ئەمەش یەکێکە لەو تیپە هونەرییانەی کە لە بواری مۆسیقادا لە کەرکوك دەوری هەیەو سەر بە کەناڵی ئاسمانی کەرکوکە.**

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

**١. (مێژووی مۆسیقای کوردی)، محەمەد حەمە باقی، چاپی دووەم، دەزگای ئاراس، ساڵی ٢٠٠٢.**

**٢. (ئامێرەکانی مۆسیقای کوردی)، وریا ئەحمەد، چاپی یەکەم، ١٩٨٩ چاپخانەی رۆشنبیری و لاوان، هەولێر.**

**٣. گۆڤاری (نەوشەفەق)، ژمارە (٤)، تەمووزی، ٢٠٠٣، لاپەڕە ١١٥، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی: (هونەرمەند نوری فەقێ)، هەردەوێڵ کاکەیی.**

**٤. گۆڤاری (کاروان)، لاپەڕە (٨٠ - ٨٤)، گفتوگۆیەك لەگەڵ مەقامزانی کورد (حەمە درێژ).**

**٥. گۆڤاری (شار)، ژمارە (٠)، ساڵی یەکەم، ئەیلول، ٢٠٠٤.**

**٦. گۆڤاری (ڕەنگین)، ژمارە ١٢٥.**

**٧. (بیرەوەرییەکانی باکووری)، باکووری.**

**٨. (مێژووی گۆرانی و مۆسیقای کوردی)، فەرهاد پیرباڵ، ٢٠١٠.**

**٩. (دەنگ و میلۆدی- شارایەك هەڵسەنگاندنی تایبەت بە موزیك و میلۆدی کوردی)، وشیار ئەحمەد ئەسوەد، ٢٠١٢.**

**١٠. (موزیك و گۆرانی کوردی)، محەمەد حەمە باقی، ٢٠١١.**

**١١. (کەشکۆڵی نووسینەکانم)، وریا ئەحمەد، ٢٠٠٩.**

**تیپی (الفرقة القومية التركمانية)**

١٢. **گۆڤاری (پەیژە)، ژمارە (٣)، ساڵی سێیەم، ساڵی (٢٠١٣)، بڕوانە ئەم لێکۆڵینەوانەی خوارەوە:**

**- (موزیکی کوردی لە سەردەمی دوو ئیمپراتۆریەتی گەورەدا)، نووسینی: دکتۆر بارزان یاسین، لاپەڕە (٦ – ١٢).**

**- (بوونی موزیك لە ژیانی موسڵمانانو ڕۆڵی کورد لەم بوارەدا)، نووسینی: بەختیار ئەمین گەنجالی، لاپەڕە (٦٧ – ٦٩).**

**- (دەف پردێکە لەنێوان خوداو مرۆڤایەتیدا)، نووسینی: سەرکەوت بورهان، لاپەڕە (٨٨ – ٩٠).**

**- (خورشیدی)، نووسینی: چالاك سدیق، لاپەڕە (١١٧ – ١٢١).**

١٣. **گۆڤاری (چلاوان)، ژمارە (٥٩)، کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠١)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:**

**(موزیکی کوردی لە سەدەی ناوەڕستدا)، بەشی دووەم، نووسینی د. زرار سدیق تۆفیق، محەمەد حەمە باقی.**

*** سەنتەری مۆزیکی شەهید ئازاد هەورامی بۆ پەروەردە و فێرکردنی موزیك:-**

**ئەم سەنتەرە لە ساڵی (٢٠٠٩)ەوە لەلایەن خاتوو (شنۆ) شاسواری هاوژینی ئازاد هەورامی لە گەڕەکی ئیمام قاسمی شاری کەرکوك کرایەوە بە ڕووی کچان و کوڕانی ئارەزوومەندی ئامێرە موزیکییەکاندا.**
**ڕزگار حەمە ڕەئووف بەڕێوەبەری سەنتەرەکەیە، کۆی گشتی فێرخوازەکان ٥٠ فێرخوازی کوڕ و کچە، کە ژمارەی کچەکان ١٥ فێرخوازن، هەروەها کاری ئەم سەنتەرە پەروەردەی موزیکییە، لە ئێستادا دوو فێرخواز وەکو مامۆستا لە سەنتەرەکە وانە و خول بۆ ئامێرەکانی (کەمان، عود، گیتار، شمشماڵ، دەف) دەڵێنەوە و سەرجەم خولەکانیش بێ بەرامبەرە.**

## * تایبەتمەندی ئاوازو کێش لە تەکیێ تاڵەبانی قادری

چالاك سدیق

ئەگەر ویستت شارستانی هەر نەتەوەیەك لە مۆرك و نەریتی شارەزا بیت دەبێت لێکۆڵینەوە لە هونەری گۆرانییەکەی بکەیت.

چونکە هونەری گۆرانی شانۆیەکە حەزو خولیاو توانای میللەتان بەروونی بەیان دەکات، مۆزیکی گەلانیش گوزارشتی ڕاستەقینە لەو تایبەتمەندییانە دەکات کە پەیوەستە بەروحی هەموومیللەتێك سیماو ئاستو خەسلەتو کەسایەتیو توانایان دەردەخات.

هەڵبەتە هونەری مۆزیك یەکێکە لە هونەرەجوانەکان کە کاریگەری قووڵی لەسەر هزرو ناخی مرۆڤ هەیەو بزوێنەری هەست و بیرێتی، پێگەیەکی گرنگو سەرەکیی لە شارستانییەت و ژیانی مرۆڤایەتیدا هەیە.

دەرکەوتنی مۆزیك بەستراوە بەژیانی مرۆڤایەتی لەسەر ئەم زەمینەو لەگەڵ مرۆڤدا سەری هەڵداوە، گەشەسەندنو پێشکەوتنیشی لەگەڵ پێشکەوتنی ژیانی مرۆڤدا بەپێی قۆناغەکانی مێژوو ڕۆژ بەڕۆژ گەشەی کردووەو هەستاون بەداهێنان و دروستکردنی ئامێرە مۆزیکە سەرەتاییەکان کە لە بنەڕەتدا ببووە هاوشانکردنی گۆرانی و سەما پاشان بەرەبەرە یاساو ڕێساو تیۆری بۆ پەیدا بوو، بەپێی قۆناغەکانی سەردەمەکانی مێژوویش پەروەردەو فێرکردنی مۆزیکیش لای کۆمەڵگاکانی دێرین و میللەتان پەیڕەو کراوەو کاریان پێکردووە.

### * کورتەیەکی مێژوویی گۆرانی و مۆزیکی ئایینی:-

لێدوان لەسەر مۆزیکی ئایینی دەبێ بگەڕێینەوە بۆ ڕۆژگاری شارستانییە دێرینەکانی ناوچەکەمان کە تا ئێستا پاشماوەی زۆرینەیان لەبەر چاون و دیارن گەیشتووەتە ڕۆژگاری ئەمڕۆ، بەتایبەتی ئەوانەی کە هەڵکۆڵین و توێژینەوەو لێکۆڵینەوەی لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە لەسەر کراوە نموونەی شارستانێتییەکانی (میدی و خوری و سۆمەری و بابلی ساسانییەکان و هتد.....)

ئەگەر لەسەر مێژووی گۆرانی و مۆزیکی کوردی لەسەردەمی دەوڵەتی میدی (٧٠٠-٣٠٠ پ ن) میللەتی کورد لەو سەردەمەدا دەقی ئایینەکە لە کتێبی ئاڤێستاوە سەرچاوەی گرتبوو بە ئاوازو گۆرانی گووتنەوە سرووتە ئایینییەکانیان پەیڕەو دەکرد لەلای کوردانی ئەو سەردەمە بەو شێوەیە ڕەچاو دەکرا. هەڵبەتە میللەتی کورد لە سەردەمی ساسانییەکانیشدا ڕۆڵی گرنگی هەبووە لە ژەنینی ئامێرە مۆزیکییەکانی ئەو سەردەمە نموونەی ژەنیارانی وەکو (بارباد و نەکیسا) لەگەڵ ژەندنی چەندین سازو ئامێری مۆزیکی وەکو (دەهۆڵ و زوڕنا - تەمبور - ڕوباب - نای - چەنگ - کووس - بەربەت - زەنگ) لە سەردەمی شا خەسرەوی پەروێز بەتایبەتی و شاکانی تری ساسانی.

هونەری مۆزیك شان بەشانی پێشکەوتنی مرۆڤایەتی هەنگاوی ناوەو بەرەو پێش چووە تا گەیشتووەتە سەردەمی فیرعەونییەکان یاخود میسری کۆن کە مۆزیك تارادەیەك هەنگاوی ناوەو جێی خۆی کردووەتەوە بەشێك بوو لە نموونەی هونەری ئەو سەردەمە دێرینەی جیهان، دیارە ئەوەیش دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆڵی پیاوانی ئایینی لای میسرییە کۆنەکان کە گۆرانی و ئاوازیان لەناو پەرسگاکاندا لەکاتی ئەنجامدانی سرووتەئایینییەکاندا بەکاردەهێنا.

بەڵام مۆزیك وگۆرانی لای یۆنانی کۆن بەوە جیادەکرێتەوە کە پەیوەندییەکی توندو تۆڵی بە لایەنی ڕۆشنبیری مرۆڤایەتییەوە هەبوو هەر لە(ئەدەب، شیعرو هەڵبەست، ڕۆمان، شانۆ) پاشان بوو بەمیراتی بۆ شارسانێتییەکانی دوای خۆیان هەر لە ڕۆمانەکان سەردەمەکانی کلێسایی وسەدەکانی ناوەڕاست و تادەگاتە سەردەمی بووژانەوە (ڕێنیسانس). سەردەمەکانی ناوەڕاست بە چڕینی سروودو تەراتیلی ئایینی مەسیحی لەوانی دی جیا دەبێتەوە.

بەڵام مۆزیك و گۆرانی لەپێش هاتنی ئایینی ئیسلام لەوناوچانەدا لاواز بووەو لە سەردەمەکانی پاش بڵاوبوونەوەی ئایینەکە بەرەبەرە هەنگاوی ناوە بەتایبەتی لە سەردەمی دەسەڵاتی عەباسییەکان زۆر پەرەی سەند چەندین هونەرمەندی میللەتانی غەیرە عەرەب لە شاری بەغدا خۆیان بینیەوەو ناوبانگیان بڵاوبووەتەوە.

### * مۆزیك وگۆرانی لەعێراقی کۆن:-

مێژووی مۆزیك و گۆرانی لەعێراقی کۆندا بەتایبەتی لە شاری بەغدا لە ماوەی پێنج سەدەی حوکمی عەباسییەکان (٧٥٠-١٢٥٨)لە نیوەی سەدەی هەشتەمەوە دەسەڵاتیان بەسەر هەموو جیهانی ئیسلامیدا سەپاند تاکو هاتنی سوپای هۆلاکۆ لە نیوەی سەدەی سیازدە.

دیارە هونەری مۆزیکیش بەچەند قۆناغێکدا تێپەڕیوە لەو ماوانەیشدا پێشکەوتنی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی ئەم هونەرە پەیوەستیش بووە بە هونەرو مۆرك و ڕۆشنبیری هەموو ناوچەکانی ژێر دەسەڵات و قەڵەمڕەوی و حوکمی عەباسییەکان.

لەنێوان پێنج سەدەی دەسەڵاتیشیاندا کۆمەڵێ کەسایەتی و مۆزیکزانی لێهاتوو سەریان هەڵدا شوێن پەنجەیان لەسەرخستنی هونەری مۆزیکدا دیارە، بنەمایەکی بەهێزیشیان لەنووسین و دانان، کەچەندین دانراوی تیۆرییان لەسەر ئەم هونەرە داهێناوەو ڕۆڵێکی گرنگیشیان بینی لەبەرەو پێشچوونی هونەری گۆرانی و مۆزیك بەتایبەتی لە سەردەمی دەسەڵاتی عەباسی یەکەم (سەردەمی زێڕین) کە کۆمەڵێ داهێنەر سەریان هەڵدا بەتایبەتی (ئیبراهیمی موسڵی کوڕی ماهان، ئیسحاقی موسڵی کوڕی ئیبراهیمی موسڵییە،

زریاب، ئیبراهیمی کوڕی مەهدی، مەنسووری زەلزەل، سەفییەدینی ورمێیی، کە خەڵکی شاری ورمێیەو هتد.....)

دیارەکۆمەڵێ کتێب و سەرچاوەو دەستنووسی مۆزیکی ئەوسەردەمە کە هەندێکیان تا ئێستا لە هەندێ شوێنی جیهان پارێزراون کە بە کۆمەڵێ سەرچاوەی دانسقەو گرنگی بواری مۆزیك دەژمێردرێت کە لەلایان (فارابی، کندی، ورمێیی، ئەبوفەرەجی ئەسفەهانی، هتد.......)، دانراون دیارە گەڵێ هونەرمەندو کەسایەتی تر هەیە، بەڵام ئێمە بەپێی سنووری ئەم وڵاتە ناویان دەهێنین کە سنووری جوگرافیای توێژینەوەکەمانە.

*** مۆزیك و گۆرانی لە سەردەمی دەسەڵاتی داگیرکاری هۆلاکۆ تاکو سەردەمی عوسمانییەکان ١٢٥٨ - ١٥٠٨:-**

لەدوای کەوتنی شاری بەغدا لە ساڵی(١٢٥٨ ز) بەدەستی سوپاکەی هۆلاکۆ هونەری مۆزیك گەورەترین مەڵبەندی خۆی لەو سەردەمانەدا لەدەستدا، چونکە لە هەموو جیهانی ئیسلامییەوە ڕوویان لەو شارە دەکرد، ئیدی ئەم ناوچەیە بە کوردستان و ئێران و عێراقی کۆنیشەوە بە کۆمەڵێ شەڕو داگیرکاری و ماڵوێرانیدا بەدەستی تەتەرو مەغۆلەکان تێپەڕاند. تاکو لە ساڵی ١٥٠٨ز کەوتە دەست قەڵەمڕەوی دەوڵەتی عوسمانییەکانەوە ئەم ماوەیەش بە سەردەمی تاریکی لە ئەدەبی عەرەبیەکاندا ناودەبرێت، لەگەڵ ئەو هەموو ئەهامەتییانەشدا کۆمەڵێ کەسایەتی مۆزیکزانی بەناوبانگ کاروانی هونەری مۆزیکیان بەرەو پێش بردو کۆمەڵێ کتێب و دەستنووس و سەرچاوە لەم سەردەمەدا نووسیوە، کە بووەتە بنەماوجێی بایەخ بۆ مۆزیکی کوردی مۆزیکی دراوسێکانمان. ئەم چەند هونەرمەندەیش نموونەی هەندێك لەو کەسایەتییانەن:

١- سەفیەدینی ورمێیی (١٢١٤- ١٢٩٤):- کۆمەڵێ دەستنووس و دانراوی لەسەر هونەری مۆزیك بۆ بەجێهێشتووین کەلێکۆڵینەوەیە لەسەر تیۆرو دەنگ ونەوای مۆزیکی ڕۆژهەڵاتی ناوین کە بە کۆمەڵێ سەرچاوەی دانسقە دادەنرێت بوون بە بنەما بۆ مۆزیکی ڕۆژهەڵاتی ناوین، هەندێك لەو دەستنووسانە لە هەندێ شوێنی جیهان تا ئەمڕۆیش پارێزراوە کە بریتین لە کتێب و دەستنووسەکانی:

أ -کتێب ئەدوار (الادوار) باسکردنە لەسەر پەیژەو ئاوازەکان.

ب - کتێبێك لەسەر ڕیتم و کێش.

ج - کتێبی زانستی کێشی شیعر.

٢ - (جەمالەدین دانسی دەشتی کوڕی سەعیدی کوردی) خاوەنی کتێبی (الکنز المطلوب في الدوائر الضروب) وێنەیەکی لە کتێبخانەی نیشتیمانی لە سویسرا پارێزراوە.

٣- (بەدرەدینی ئەربیلی ١٢٨٧ - ١٣٥٤) خاوەنی کتێبی ئەرجوزەی ئەنغامە (ارجوزة الانغام) یەکەم کەسە باسی هونەری مەقاماتی کردووە، ئەربیلی ڕەچەڵەکی هەموو پەیژەو مەقامەکان دەگەڕێنێتەوە بۆ مەقامی ڕاست و بە شیعر باسیان لێوە دەکات.

٤- (عەبدولقادر مەراغی ١٣٥٤- ١٤٣٤) ئەم مۆزیکزانە لە سەمەرقەند مردووە، بەڵام سەرەتاکانی لە هونەری مۆزیك لە شاری بەغداوە دەستی پێکردووەو خاوەنی کتێبی (مقاصید الألحان)ە.

*** مۆزیك و گۆرانی لە سەردەمی حوکمی عوسمانییەکان١٥٠٨-١٩١٨:-**

لەدوای داگیرکاری مەغۆلەکان وتورکمانەکان ئیمبراتۆرییەتی عوسمانی دەستی بەسەر کوردستانی باشوورو ڕۆژهەڵاتی ناوین و بەشێك لە وڵاتانی جیهاندا گرت لە ساڵی ١٥٠٨ تا ساڵی ١٩١٧ تا سوپای بەریتانیا عوسمانییەکانی وەدەرنا. ئیدی لەو ڕۆژەوە ئەم ناوچەیە بووە گۆڕەپانی ململانێ لەنێوان دەوڵەتی سەفەوی و عوسمانی، لەدوای شەڕی چاڵدێران لە ساڵی ١٥١٤ کوردستان دابەشبوو لەنێوان هەردوو ئەم زلهێزەدا و چەند جارێکیش ویلایەتی بەغداو یان ئێراقی عەرەبی لەو چوار سەدەیەدا دەکەوتە دەست دەسەڵاتی سەفەوییەکان بۆ نموونە ساڵی ١٥٠٨ تا ساڵی ١٥١٤ ز پاشان لە ساڵی ١٦٢٣ تا ١٦٣٣ ز ئەم ناوچەیە هەر لە ئاڵۆزیدا بوو.

لە ماوەی ئەم چوارسەدەیەدا هونەری ناوچەکە کەوتە ژێر کاریگەری مۆزیکی عوسمانییەکان، بەتایبەتی پایتەختە نوێیەکەیان کە شاری ئەستانبۆل (قوستەنتینیە) بوو بووە سەرچاوەی زانست و ئەدەب و مۆزیك کە کاریگەری وڵاتانی ئەورووپایی داگیرکراو لەلایان عوسمانییەکانەوە نموونەی یۆنان وڵاتانی باڵکان و هەروەها کاریگەری شارستانییەت و مۆزیکی ئێرانیش لەلایەکی ترەوە، لەو ماوەیەدا ئاسۆی هونەر لە شاری بەغدا کوژایەوە کە پێشتر لە کاتی خەلافەتی عەباسییەکاندا زۆر گەشەی کردبوو.

*** هونەری مۆزیك لە سەردەمی عوسمانییەکان:-**

دەسەڵاتدارو سوڵتانەکانی عوسمانییەکان زۆرگرنگیان بەهونەری مۆزیك دەدا تەنانەت هەندێك لەسوڵتانەکان دەستیان لەڕێکخستن و دانانی مۆزیکدا هەبوونموونەی سوڵتان (سەلیم خانی) سێیەم یەکێك بوو لە سوڵتانە هونەر دۆستەکان و گرنگی زۆری دەدا بەمۆزیك و گۆرانی لە مۆزیکی تەکێ و خانەقاکانەوە گواستییەوە بۆ ناو کۆشکی سوڵتانەکان.

دیارە بە پێی تیۆرو زانستی مۆزیکی ڕۆژهەڵاتیش بێت ئەو زانستە لەلایان وڵاتی ئێران بەگشتی لە دێرزەمانەوە سەرچاوەی گرتووە، عوسمانییەکانیش هونەری مۆزیکیان لەوێوە وەرگرتوو شایەت حاڵی ئەو ڕاستییەیش ناوی دەزگاو مەقامەکانە کە زۆرینەی تا ئێستا بەزمانی کوردی و فارسی ناودەبرێت نموونەی (یەککا - دوکا -سێکا -نەوا - نەورۆز عەجەم - نیکار - نیاز - چەندین ناوی دیکەی مۆزیکی)، ئەم مۆزیکە لەو سەردەمەدا وا بەستەی دووتوخمی سەرەکی بوو یەکەمیان: ڕیتم و کێش بوو پێیان دەووت (اصول).

دووەمیان: پەیژە

بەگشتی مۆزیکی سەردەمی مۆزیکی عوسمانییەکان تێکەڵەو پێکهاتەیەك بوولەمۆزیکی کوردی وفارسی و عەرەبی و تەنانەت ئەرمەنی و یۆنانیش.

لەسەدەی هەژدەیش بەملاوە هونەری مۆزیك وردە وردە بەرەو پێشەوەچوو و گۆرانکاری بەسەردا هاتوو لەگەڵ داب و نەریتی هونەری کۆندا ئاوێتەی مۆزیکی نوێ بوو بەتایبەتی سوود وەرگرتن لە زانست وتیۆری مۆزیکی جیهانی یاخود مۆزیکی ئەوروپی. پاشان ئەم شێوازە لە مۆزیکی تورکی عوسمانی باڵی بەسەر هونەری ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیان کێشا وەکو مۆدێلێك لە مۆزیك و گۆرانی ئاوازی نوێ لەم وڵاتانەدا پەیرەو دەکرا تەنانەت لە شارە گەورەکانی وەکو قاهیرەو حەلەب و بەغدا چەندین شوێنی تر وەکو میراتی ئەم هونەرەیان بۆمایەوە، بەتایبەتیش لە هونەری ئامێرژەندن و مەقام چڕین و ئوسوڵ و زانستی مۆزیك بەگشتی.

دیارە لە ماوەی دەسەڵاتی عوسمانیدا کۆمەڵێ هونەرمەندو دەنگخۆشی بەناوبانگ سەریان هەڵدا ئەمانە رۆڵی بەرچاویان بینی لە گەیاندن و گەشەسەندنی هونەری مۆزیك و گۆرانی بۆ نەوەکانی دوای خۆیان.

بەتایبەتی هونەری مەقامخوانی رەسەن چونکەرەگ و ریشەیەکی دێرینی هەیەو پەیوەندی بە ئاوازە رەسەنەکان وهەروەها بە پەیژەکانی مۆزیك و ریتم و کێشە کوردی و رۆژهەڵاتییەکانەوە هەبووە، دیارە ناوی ئاوازو ریتم بە چەندین ناو و دەستەواژەی جوداوە ناوزەندکراوە بۆ نموونە (پەردە) بەزمانی عەرەبیش (الادوار) بەکارهاتووە هەروەها بۆ کێش و ریتم دەستەواژەی (الضروب) واتە زەرب یان میزراب بەکارهاتووە. بەکارهێنان و یاخود مێژووی چڕینی مەقاماتی ئێراقی بەرای شارەزایانی وەکو (هاشم الرجب) دەیگێرنەوە بۆ ٣٠٠ بۆ ٤٠٠ ساڵ بەر لە ئێستا، لێرەدا ناوی چەند شارەزاو کەسایەتییەکی دێرین وەبیردێنینەوە کە خزمەتی بواری زانستی هونەری مەقاماتیان کردووە و هەندێکیان لە نەتەوەی کوردن و لە کوردستانەوە چوونەتە شاری بەغداو ئەو هونەرەیان بڵاوکردووەتەوە و چەندین کەسانی هونەرمەند و دەنگخۆشیان لەدوای خۆیان پێگەیاندووە:

١- مەلا وەلی ١٢٤٦-١١٥٦ کۆچی ناوی تەواوی (عەبدولرەحمان وەلی) بوو لە شاری کفری لەدایکبووە پاشان لە سەردەمی عوسمانییەکان چووەتە شاری بەغدا کەسانی تریش نموونەی رەحمەتوڵڵا شەلتاغ لەسەر دەستی مەلا وەلی فێری هونەری مەقام چڕین بوون.

٢- مەلا حەسەن بابۆچی ١١٨٨- ١٢٥٦زایینی لە شاری بەغدا لەدایك بووە کۆمەڵێ کەسانی تر هونەری مەقامچڕینی لێوە فێربوون یان سوودیان لێ بینیوە نموونەی شەلتاغ و مەلاحەسەن بەسیر.

٣- رەحمەتوڵڵا شەلتاغ ١٧٩٣ -١٨٧١زایینی یەکێکە لە گەورە هونەرمەندانی بواری مەقامبێژی لە نەتەوەی کوردەو لە شاری کفری چاوی بەژیان هەڵهێناوە لە فێربوون و وەرگرتن و چڕینی هونەری مەقامدا ئەم هونەرمەندە سوودی لە شارەزاو مەقامبێژی کوردی شاری کفری مەلا وەلی بینیوە پاشان لە مەلا حەسەن بابوچی هەروەها ئەمیش هونەرەکەی خۆی گەیاندووەتە کەسان و مەقامبێژانی تری وەکو مەلا عوسمانی موسڵلی و ئەحمەد زێدان و خەلیل رێباز و هتد......

٤- مەلا عوسمانی موسڵلی ١٨٥٤ - ١٩٢٣ زایینی لە شاری موسڵ لەدایکبووە ئەم هونەرمەندە زۆر کارابووە لە بواری ئاوازدانان و توانای هەبووە لە ژەندنی چەند سازو ئامێرێکی مۆزیکدا لەهەمان کاتدا وتاربێژێکی بەتوانا بووە، سەفەری بۆ شاری ئەستەنبول کردووەو بووەتە جێی سەرسوورمانی سوڵتان عەبدولحەمید و فەرمانی کردووە بەدامەزراندنی لە مزگەوتی (ئایاسۆفیا) لە شاری ئەستەنبول پاشان دواتر سەفەری وڵاتی میسری کردووەو دەڵێن کە ئەو ئاوازی مەقامەکانی نەهاوەندو حیجاز کاری گەیاندووەتە وڵاتی میسرو بە وڵاتانی تری عەرەبیدا بڵاوبووەتەوە، پاشان گەراوەتەوە لە شاری بەغدا نیشتەجێ بووەو لەوێ کۆچی دوایی کردووە.

### * گۆرانی دینی و دنیایی لەسەدەی بیستەمدا:-

لە سەرەتایی سەدەی بیستەمەوە جیهان گۆرانکاری گەورەی بەسەردا هات هەر لە داهێنانی کامێرا، سینەما، ئامێرەکانی تۆمارکردنی دەنگ (گرامافۆن) و هەموو داهێنانەکانی تر. وردە وردە ئەم هەموو کەرەسەیە بەجیهاندا بڵاوبوونەوەو گەیشتە ناوچەو وڵاتی ئێمەیش بەدەر نەبوو لەم شارستانییەتە نوێیانە بەتایبەتی لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم و لەگەڵ دروست بوونی دەوڵەتی نوێی ئێراقی پاشایەتی.

هەر لە سەرەتای بیستەکانی سەدەی بیستەمەوە چایخانەو قاوەخانەکان رۆڵێکی بەرچاویان هەبوو لە بڵاوبوونەوەی رۆشنبیری و هونەر بەتایبەتی هونەری (مەقام چڕین)، دیارە هۆکانی گوێگرتنی گۆرانیومۆزیك زۆر کەم بوون تەنیا (چایخانەکان، لە هەندێ لە شارە گەورەکان یانەو تیاترۆخانەو یاخود (ملهی) شوێنی مۆزیك و گۆرانی مەقامخوێندن بوون بەتایبەتیش لەگەڵ گرووپی مۆزیك، دیارە پێش ئەم سەردەمە گۆرانی و مۆزیك لە سینگی دەنگخۆشاندا دەپارێزراو پاشان دەماو دەم دەگوازرایەوە بۆ یەکتری تاکو سەردەمی داهێنان هەرچەندە هۆکارەکان لە سەرەتاوە زۆرکەمیش بوون، بەڵام گەلێك لە گۆرانی و مەقامی هەموو ناوچە جیاوازەکان تۆمارکران و بەو بۆنەیەوە لە فەوتان رزگاربوون هەرچەندە رەنگە کۆمپانیاکانی تۆمارکردن بۆ بەرژەوەندی خۆیان ئەم کارانەیان تۆمار کردبێت، بەڵام بۆ ئێمەو میللەتانی تریش بە نەرێنی رەنگی داوەتەوە.

دیارە لە ئاکامی بڵاوبوونەوەی کۆمەڵێ فۆرمی گۆرانی و مۆزیك بەگشتی لە جیهاندا بوو بەهۆی پێویستی بە هۆکارێك بۆپاراستنی ئەم هونەرە لە کەرەسەیەکدا کە گواستنەوەیشی ئاسان بێت، بۆیە داهێنەران بیریان لەو داهێنانە کردەوە کە دەنگ و گۆرانی بەگشتی تێدا پارێزراو بێت، دوای ئەم داهێنانە کۆمپانیاکانی تۆمارکردن کەوتنەکارکردن بۆپەیداکردنی بازاری مۆزیك وگۆرانی لە ئەوروپاوە لەدوای

سالآنی (١٩٢٥) گەیشتنە ولآتی عێراق ولآتانی دەوروبەرمان و دەگەڕان بەدوای دەنگخۆشە ئاوازەو و دیارەکان بەتایبەتی لەبواری چڕینی گۆرانی و بەستەو مەقامخوانی.

بەتایبەتی کۆمپانیاکانی (هیزماستەر ڤۆیسی بەریتانی، کۆمپانیای بەیزافۆن، ئۆدیکایرفۆن، پۆلیفۆن) نوسینگەیان لە شاری بەغدا و چەند شارێکی تر کردەوەو بەرهەمێکی زۆریان بۆ کۆمەڵێك لە هونەرمەندانی ئێراق تۆمارکرد نموونەی (محەمەد گویانچی، سەلیمە موراد، مەلا عوسمانی موسڵلی زهور حوسێن هتد...) دیارە هونەرمەندانی کوردیش لەو کارانە بێبەش نەبوون نموونەی (عەلی مەردان، حەمدی ئەفەندی ١٨٨٥-١٩٤٩، ئەمین باخەوان، عەبەی سەعە عەربەتی، مریەم خان، ئەڵماس خان١٨٩٤-١٩٧٩ کاوێز ئاغا، دایکی جەمال ١٩٠٨-١٩٧٩، مەلا کەریم١٨٨٥-١٩٣٩، ئەسمەر فەرهاد، رەشۆڵ چەندین کەڵە هونەرمەندی تر دیارە لە کوردستانی ئێرانیش کەسانی وەکو هونەرمەندی پایە بڵند سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی نزیکەی ٢٠ تراك مەقام و گۆرانی کوردی و کۆمپانیاکانی (پۆلیفۆن) تۆمارکرد.

لە ساڵی ١٩٣٢بەدواوە لەپاش گەڕانەوەی وەفدی ئێراقی لە کۆنگرەی مۆزیکی عەربی لە قاهیرە ئیدی حکومەت بیری لە کردنەوەی پەیمانگایەکی مۆزیك کردەوە بەشێوەیەکی پەروەردەیی ئەکادیمی کە پەیوەست بێت بەمێڵی گشتی رۆشنبیری و هونەری، بۆیە لە سەرەتای ساڵی ١٩٣٦ بەناوی (پەیمانگای هونەری مۆزیکەوە) کرایەوە، هەڵبەتە لەو ساتە وەختەوە رۆڵی گرنگی هەبوو لە پێشخستنی هونەری مۆزیک بە گشتی ودواتر هونەرمەندانی کوردیش روویان لەو پەیمانگایە کردو چەندین کەڵە هونەرمەند لەوێ پێگەیشتن و خزمەتی گەورەیان بە میللەتەکەیان کرد.

هەر لە سەرەتایی دەرچوونی چەندین هونەرمەندی بەئەزموون لە پەیمانگای هونەری مۆزیك لە بەغدا رۆڵی گرنگیان بینی لە پەرەسەندنی رادیۆی بەغدا بەشی کوردی و عەرەبی کە بەشی کوردییەکەی بۆ میللەتی کورد بۆ ئەو سەردەمە زۆرگرنگ بوو پاشان گەشەسەندنی ئۆرکێسترای سیمفۆنی و هەموو گرووپ و دەزگا هونەرییەکانی ولآتی ئێراق بەهۆی پێگەیاندنی کادری موزیك لەو پەیمانگایەوە بوو.

هەڵبەتە جگە لەو شوێن و دەستگاو تیپ و کۆمپانیانەی باسمان کرد مەراسیم و بۆنە ئایینییەکانی وەکو (مەولودی پێغەمبەر(د.خ)، شەوی قەدر، زیکر)، هەروەها بۆنە تایبەتەکانی کە لە مالآنی خاوەن پلەوپایەو خەڵکی دارا ئەنجام دەدران وەکو (شایی و زەماوەند، خەتەنەی مندالآن، بۆنەی تایبەت)و گەلێك بۆنەی دیکە تەوەرێکی دیکەی بلآوبوونەوەی هونەری مۆزیك و گۆرانی مقام بوون بەتایبەتی لەگەڵ ئامێرەکانی مۆزیك کە وردە وردە بازاری ئامێرەکانی مۆزیکیش گەرم دەبوو وێستگەیەکی دیکەی پەخش کردن و نمایش کردنی هونەری مۆزیك بوو لە شارەکاندا.

*** کورتەیەك لەسەر هونەری مۆزیك و گۆرانی لە شاری کەرکوك:-**

لە تەوەری باسەکەماندا تیشك دەخەینە سەر هونەری مۆزیك و گۆرانی لە شاری کەرکوك، چونکە ئەم شارە مێژوویەکی بەرچاوی هەیە لەم هونەرەدا بەتایبەتی هونەری گۆرانی ئایینی و هونەری مەقامخوانی، هەر لە سەدەکانی پێشتریشەوە بەهۆی هەڵکەوتەی شارەکەوە کە کەوتووەتە نێوان هەموو شارەکانی (بەغدا، هەولێر، موسڵ، شارەزوری کۆن لەوێیشەوە بۆ ئەسفەهان و هەمەدان وەکو هێڵێکی بازرگانی لەنێوان رۆژهەلآت و رۆژئاوا، ئەمەیش لە ئەداکردنی هونەری مەقامخوانی و لە تەکێ و خانەقاو مزگەوتەکاندا بەدی دەکەین لە خوێندنی زۆرینەی مەقامە سەرەکییە رۆژهەلآتییەکانی وەکو (راست، بەیات، سێگا،چوارگا، سەبا، حیجاز. عەجەم، نەهاوەند، کورد) مەقامە لق و لاوەکییەکانیش کە لەبۆنە ئایینییەکان و لە ئاهەنگ و یادەکاندا بەرگوێمان دەکەوت نموونەی (دەشت، هەمایۆن، ئەشار، ئەوج، نەوا، حیجازکار، ئورفە).

هەروەها شاری کەرکوك بە لانکەی فۆرم و مەقامە کوردییەکانی (ئەڵلاوەیسی، قەتار، خاوکەر، ئای ئای، هیجران، قەزازە) لەگەڵ قۆریاتی تورکمانی و خوێندنی مەقاماتی ئێراقیش هەر رۆڵی تێدا دەبینن نموونەی (خەنەبات، مەنسوری، لامی، پێنجگا، شەرقی راست، موخالیف چەندین مەقام و ئاوازی تر).

دیارە زانیاری لەسەر هونەری مۆزیك بە گشتی لە سەدەکانی پێشتردا بە کەمی دەکەوێتە بەردەستمان، بەلآم لە ناوەراستی سەدەی نۆزدە بەملاوە دەنگویاسی ئەم هونەرەمان پێدەگات کە لە سینەو لێوی باب و باپیرانمانەوە گواسترایەوە بۆمان تا زانست و هۆکارەکانی تۆمارکردن گەیشتە ئەو ئاستەی ئەم هونەرە لە شاری کەرکوکیش وەکو تارادەیەك لە رێی چەندین کەڵە هونەرمەندەوە تۆمارکراو پارێزرا بەتایبەتی لە دوای سالآنی ١٩٢٥ کۆمەڵێك هونەرمەندی شارەکە روویان لە شاری بەغدا کردوو بەرهەمەکانیان لە کۆمپانیاکانی قەوان تۆمارکرد:

١- سەر قافڵەی هونەرمەندان (عەلی مەردان ١٩٠٤ -١٩٨١) کە خاوەنی زۆرترین بەرهەمی بەستەو گۆرانی و مەقامە بەزمانی کوردی تۆماری کردووە کە زۆرینەی مەقامە کوردی ورۆژهەلآتییەکان لەخۆی دەگرێت و بووەتە گەورەترین ئەرشیف و سەرچاوە بۆ ئەم هونەرە.

٢ ئەمین باخەوان یاخود (محەمەدئەمین تاڵەبانی) هەر لە شۆرەسوارانی مەقام و ئاوازە کوردییەکان بووە لە ساڵی ١٩٢٥ لە کۆمپانیای (بەیزافۆن) لە بەغدا (قەتارو خاوکەرو ئای ئای) تۆمار کردووە.

٣- عەبدوڵڵا سەعید ناسراو بە (عەبەی سەعە عەربەتی لە سالآنی ١٩٢٧-١٩٢٨) ئەڵلاوەیسی و قەتاری بەدەنگێکی بەسۆز تۆمار کردووە، مامۆستا عەلی مەردان سوودی لە ئەزموونی ئەم زاتە بینیوە.

٤ -حەمەی کۆترەمل ئەمیش یەکێکە لە دەنگ خۆش و

مەقامبێژی شاری کەرکوك کە هەر لەو سەردەمانەدا هاوڕێی ئەمین باخەوان و عەبدوڵڵا سەعید بوو بەیەکەوە سەردانی بەغدایان کردووە بۆ تۆمارکردنی مەقامە کوردییەکانی ناوچەی گەرمیان بەتایبەتی (قەتارو خاوکەر).

٥- مەلا تاهای کەرکوکی زیاتر لە ٤٠ بەرهەمی بۆ کۆمپانیا بەیزافۆن لە ساڵی ١٩٢٥ لە بەغدا تۆمار کردووە یەکێکە لە مەقامبێژەکانی شاری کەرکوك لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا ژیاوە، برایەکیشی هەیە بەناوی مەلا سابیر هەر لە مەقامبێژە دێرینەکانی ئەم شارەیە.

٦- خدر بارام چاوش ١٨٩٠- ١٩٤٩ مەقامزانی و ئامێرژەنینیان پشتاو پشت بۆ ماوەتەوە ئەم زاتە هونەرمەندێکی لێهاتوو بووە لە چڕینی ئەڵڵاوەیسی و قەتارو خاوکەر و خورشیدی و ئای ئای تەمبور ژەنێکی بەناوبانگ بوو لە شاری کەرکوك و دەورووبەری مامۆستا (عەلی مەردان) لە کتێبی (گەڵای پاین) دەیگێڕێتەوە (خدر بارام چاوش) بە مامۆستای خۆی ناودەبات و دەڵێ هەموو فۆرم و مەقامە کوردییەکانی لەو زاتەوە فێر بووم لەو دەمەی کە نیشتەجێی لەیلان بوون.

٧- (محەمەد خدر بارام چاوش ١٩١٣ - ١٩٨٠) باوکی سەڵاح داودەیە دەنگخۆش و شارەزای مەقامە کوردییەکان و ژەنیاری سازەکانی نەی و دەهۆڵ و زوڕنایش بووە.

٨- سەڵاح داود ١٩٤١- ٢٠٠٩ هەڵبەتە دەنگە بەسۆزو شیرینەکەی (سەڵاح داودە) هەر بە نەمری لامان دەمێنێتەوە. بە تایبەتی لەگەڵ نەیەکەی (هونەرمەند (ئەحمەد داودە) چەندین بەرهەمی ڕەسەنیان تۆمار کردووە. دووان لە کوڕەکانیشی(عەباس و دڵشاد) هەر خاوەنی هەمان ڕێچکەن شارەزان لە وتنی (ئای ئای).

٩- (ئەحمەد داودە ١٩٢٦-١٩٧٩) هونەرمەندێکی نەیژەنی بەتوانا بوو شارەزاییەکی باشی لە هەموو ئاوازو مەقامە کوردییەکاندا هەبوو بەشداری لە تۆمارکردنی چەندین بەرهەمی ناسك و ڕەسەن و جوانیان بۆ هونەرمەندان (حەسەن زیرەك و سەڵاح داودەو حوسێن عەلی و شکور خەیات و سابیر کوردستانی)، چەندین هونەرمەندی تر تۆمار کردووە. دیارە ئەم بەرهەمانە بە ئامێری ڕێکۆردەری گروندیك کە لەسەر بەکرەو کاسێتی گەورە لەماڵاندا تۆمار دەکران ئەمەیش بووە جۆرێکی دیکە بوو لە ئەرشیف کردنی ئەو سامانە کەلەپوورییە.

١٠- حوسێن عەلی ١٩٢٥ - ١٩٩١ بە حوسێن عەلی گورجیش ناسراو بوو شارەزای ئای ئای و هەموو فۆرم و ئاوازە کوردییەکانی ناوچەی گەرمیان بوو لە مامۆستا عەلی مەردانیشەوە بەشێك لە مەقامە گشتییەکان فێر ببوو دانەری کۆمەڵێ ئاوازی شیرینی وەك (تەنکە، دانە دانە، نییە لەماڵ، باڵاگەردان، حەبێ خان) چەندین گۆرانی دیکەیە.

١١- حەمەدرێژ ١٩٢٦ -١٩٩٣ هونەرمەندێکی دەنگخۆش و شارەزا بوو لە فۆرم و مەقامە کوردییەکان و مەقامە سەرەکییەکان بەتایبەتیش ئای ئای و ئەڵڵاوەیسی و قەتارو خاوکەر و خورشیدی و مەنسوری و قەزازو قۆریات و مەقامەکانی ڕاست و حیجاز و بەیات و نەهاوەند وهتد....

١٢- شکور خەیات ١٩٤٠ خاوەنی دەنگێکی ڕەسەنی کوردی بە سۆزە. مەودای چینی دەنگی بەرزو تیژە ڕێچکەیەکی تایبەت بە خۆی هەیە بەتایبەتی لە ئای ئای و ئەڵڵاوەیسی و قەتارو خاوکەر دەشت و چوارگاو ڕاست و خەنەبات زۆرینەی مەقامەکانی تر. هۆنراوەی شاعیرەکانی مەولەوی و مەلای جەباری و لە مێشك و خەیاڵی مام شکوردا تێکەڵ ئاوێتەی دنیای ئای‌ئای و قەتارو خاوکەر بووە.

بێجگە لەم چەند هونەرمەندە چەندین مەقامبێژو هونەرمەندی تر لەو سەردەمانەو دواتریش لە گۆڕەپانی هونەریدا خزمەتیان بەم شارە کردووە نموونە (حافز مەلا تۆفیق، زەینەڵ سابونچی، مەلا نوعمان، ڕەشەی کولە ڕەزا، مەلا محەمەد تۆپاڵ، سەعید حەمە گوڵە، حاجی عومەر پاسەوان،چەندین دەنگ خۆشی تر کە زۆرینەیان بەشدار دەبوون لە مەراسیم و بۆنەکانی تەکیەی تاڵەبانی کە هەندێکیان لە نەتەوەی تورکمانن شان بەشانی مەقامبێژەکانی کورد ڕۆڵیان دەبینی لە شاری کەرکوك.

١٣- کوێستانی - سەید محێدینی جەباری ناسراو بە کوێستانی لە ساڵانی پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو چەند بەرهەمێکی بۆ ڕادیۆی کوردی لەبەغدا تۆمارکردووە.

شێخ مەحمود ناسراو بە گەرمیانی، دیارە گەلێك هونەرمەندی تر ماوە باسیان بکەین لە سەدەی بیستەمدا خزمەتیان بە هونەری شاری کەرکوك کردووە، بەڵام دەرفەت نابێت لێرەدا باسی هەموویان بکەین.

### * مێژووی دروستبوونی شاری کەرکوك:-

لەبەر ئەوەی شوێن و سات و جوگرافیای توێژینەوەکەمان لەناو چەقی شاری کەرکوکدایە، بۆیە پێویست دەکات لەڕووی مێژوویشەوە تیشك بخەینە سەر لایەنی مێژوویی ئەم شارە. شاری کەرکوك لە ڕووی مێژووییەوە بە شارە گرنگەکان دادەنرێت، دروستبوونی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمانەی کە شارستانییەتی میزۆپۆتامیا گەشەی کرد کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمە کۆنەکان هەڵبەتە قەڵاکەی شایەتحاڵی ئەو ڕاستییەیە کە لە بەری ڕۆژهەڵاتی شارەکەو ڕووباری خاسە کە بەناو شارەکەدا تێدەپەڕێت بنیات نراوە.

هەڵبەتە بەڵگە مێژووییەکان ئەو ڕاستییە دەسەلمێنن کە (گۆتییەکان) بۆ یەکەم جار بەردی بناغەی ئەم شارەیان داناوە، هەروەها لەڕێی کنەوپشکنین و هەڵکۆڵینە ئارکۆلۆجیاکانەوە دەرکەوتووە کە شارێك بەناوی (ئارابخا، ئارانجا، ئەرەفە) هەبووە ئەم ڕاستییەیش لەلایەن (دائرة المعارف الاسلامیة) پشتڕاست کراوەتەوە، هەروەها مێژوونووسی گەورەی کورد (تۆفیق وەهبی) دەڵێت (شاری کەرکوك شارێکی کۆن و دێرینە لەپێش شاری هەولێرەوە (ئەربیل) لە نووسینە مێخێکاندا ناوی هاتووە) کە لە ڕۆژژمێری بەناوبانگی (سەرجۆنی ئەکەدی) پ. ز لەم ڕۆژژمێرەدا لەنێو ناوانی تری وەکو ناوی (لۆلۆبی) ناوی وڵاتی (ئاراپخا) هاتووە، هەروەها مێژوونووس پرۆفیسۆر (کەمال مەزهەر) لە کتێبی کەرکوك و

دەوروبەریدا کە بە زمانی عەرەبی چاپ کراوە نووسیویەتی (ئاشکرایە کە مێژووی شاری کەرکوک لەلایان لۆلۆییەکانەوە یاخود خورییەکانەوە بنیاد نراوە کە هەردووئەو میللەتە میللەتی کوردی ئێستا پێکدەهێنن. هەروەها لە لاپەرەی شەشی کتێبەکەیدا دەڵێ بە ئاشکرا لە دەقە مێخییەکانی سەردەمی ئەکەدییەکاندا هاتووە لە رووی مێژووییەوە پێدەچێت لۆلۆییەکانیش بنیادی شاری کەرکوکیان کردبێت. لە سەردەمی ئاشورییەکانیش پاشای یەکێك لە پاشاکانیان بەناوی (تکلت - نزت) لەپێش زایین دەستی بەسەر شاری کەرکوکدا گرتووەو پاشان سلۆقییەکان لە دەوروبەری ساڵی(٢٢٧ پ ز)دەستیان بەسەریدا گرتووەو شارەکەیان بەناوی سلۆقس ناساندووە. پاشتر ئەم شارە کەوتە ژێر دەسەڵاتی ساسانییەکانەوە تا سەردەمی بڵاوبوونەوەی ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئیدی ئەم شارە بە ئارامی مایەوە تا هاتنی سوپای مەغۆل لە سەدەی سیازدەیەم، ئیتر شاری کەرکوك کەوتە ژێر دەسەڵاتی تەتەرەکانەوە تا سەدەی شازدەیەم بووە بەشێك لە ولایەتی شارەزوور و پاشان ولایەتی موسڵ دواتر لەگەڵ هاتنی ئینگلیزەکان و دروستکردنی دەوڵەتی ئێراق یەکێك بووە لە لیواو پارێزگاکانی ئەم وڵاتە نوێیەوە.

### * مێژووی تەکییەکان لە جیهانی ئیسلامیدا:-

مێژووی دروستکرنی بیناکرنی مزگەوتەکان دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای هاتنی ئایینی ئیسلام بۆ یەکەم ساڵی کۆچی کاتێ موسڵمانان بەهاوەڵی پێغەمبەر د.خ بەرەو شاری مەدینە کۆچیان کرد لەوێ یەکەم مزگەوتیان دروست بیناکرد. بەڵام لە ماوەی دەسەڵاتی عوسمانییەکاندا (تەکێ) شوێنی (خانەقاکانی) گرتەوە، دیارە هەر تەکێ هەروەکو خانەقا دامەزراوەیەکی ئایینی بوویەك ئامانجیان هەبوو جیاوازییەکەیشیان تەنیا ئەوەیە کە خانەقا لە سەردەمی ئەیوبییەکان دامەزراوە، بەڵام تەکێ لە سەردەمی عوسمانییەکان سەری هەڵدا. تەکێی و خانەقا هەردوو دامەزراوەکە لە سەرەتای دروست بوونیانەوە رۆڵی بیمارستانی دەبینی، بەڵام هەر لە سەرەتای دەسەڵاتی عوسمانییەکانەوە دەسەڵاتداران ئەو بەشەی کە بیمارستان بوو لایان بردوو رۆڵەکەی گۆڕانکاری بەسەردا هات.

دروستکردنی کۆنترین و بەناوبانگترین تەکییەکان دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی شازدەی زایینی لەگەڵ سەرەتای حوکمی عوسمانییەکان بنیادنراوە لە ماوەی ئەو چەند سەدەیەدا، لەگەڵ سەرەتای سەدەی بیستەم و ئەمانی دەوڵەتی عوسمانیش تەکییەکان رۆڵی گرنگیان لە پاراستنی داب و نەریتی ئیسلامی و خوێندن و لەبەرکرنی قورئانی پیرۆزو پەیرەوکردنی رێگەو شێوازی سۆفیزم و هەموو داب ونەریت و خوو رەووشتی جوانی موسڵمانان، هەروەها تەکێ رۆڵی گرنگی هەبوو لە دروستکردن و بەکارهێنانی گۆرانی و ئەواشیحی ئایینی لەگەڵ پێشخستن و بەکارهێنان و چڕینی ئاوازی مەقامە رۆژهەڵاتییەکان کە رۆڵی گرنگ دەبینن لەناو سرووت و رێوڕەسمە ئایینییەکانی تەکییەکاندا بەتایبەتی لەدانیشتن و کۆڕی زیکرو هەموو بۆنە ئایینییەکاندا. بۆیە لێرەدا بە پێویستی دەزانین باسی هەندێ لە تەکێ بەناوبانگەکان لە جیهانی ئیسلامیدا بکەین:-

* تەکێی (سلێمانیە) لە شاری قاهیرە لەلایان سلێمان پاشاوە لە ساڵی ٩٥٠ کۆچی بنیاد نراوە.

* تەکێی(سلێمانیە) لە شاری دیمەشق بنیاد نراوە بەیەکێك لە بەناوبانگترین شوێنەواری ئیسلامی ئەژمار دەکرێت کە لەسەر شێوازی بیناسازی عوسمانی بینا کراوە.

* تەکێی (توربەخانە) لە شاری قۆنیای وڵاتی تورکیایە بە زمانی تورکی واتای (گۆرخانە) دەکات .

* تەکێی (مەولەوی خانە) لە شاری ئەستەنبوڵ لە ساڵی ١٤٩١ز بنیاد نراوە.

* تەکێی (مەولەوی) لە شاری تەرابلوسی وڵاتی لوبنان لە ساڵی ١٦١٩ز دروست کراوە.

* لە وڵاتانی (بەڵکان و هەنگاریا و ئۆکرانیا) لە سەردەمی دەسەڵاتی عوسمانییەکان بەسەر ئەو ناوچانەدا دروست کراون.

### * تەکێی تاڵەبانی قادری:-

تەکێی تاڵەبانی یاخود (جامع المجيدية): دامەزراندنی ئەم تەکێیە دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی دووەمی سەدەی هەژدە لەلایان (مەلا مەحمودی زەنگەنە ١٧١٨- ١٨٠٠ ز) دامەزراوە لەسەر دەستی شێخ ئەحمەدی هیندە لاهوری تەریقەتی شێخایەتی وەرگرتووە، لە سەردەمی شێخ ئەحمەد تاڵەبانی کوری (١٧٨٠ - ١٨٤٠) کە هەڵگری نازناوی تاڵەبانییە لەمەوە بۆ نەوەکانی دوای خۆیان ئەو نازناوە بۆ بنەماڵەکەیان مایەوە بینای تەکێکەی کەرکوك فراوانتر کراوەتەوە.

پاشان لە سەردەمی (شێخ عەبدولرەحمان ١٧٧٩-١٨٥٨) ناسراو بە (خاڵس) لە سەردەمی سوڵتان عەبدولمەجیدی یەکەم تەکێکەیان بەفەرمی ناسیوەو گرنگیان پێداوە، هەر لەو سەردەمەدا دوو دیاری بەنرخیان پێشکەش بە تەکێکە کردووە یەکەمیان (تاڵە مووی قژی پێغەمبەرە د.خ)لە خەزنەی شەریف لە ئەستەنبول.

دووەمیان (کتێبی صحیحی بوخاری) دەستنووسی یەکەم بوو، بەڵام لەگەڵ تێپەربوونی رۆژگاردا ئەو کتێبە لەناوچووە، دیارە بەم هۆیانەو نزیکیان لە دەسەڵاتی عوسمانییەوە تەکێکە ناونراوە(جامع المجيدية).

تەکێکە لە رۆژگاری ئەمڕۆدا لەلایان (شێخ یوسف شێخ عەلی) سەرپەرشتی دەکرێت کە دەست بەدەست لەلایان بنەماڵەکەیانەوە نەوە دوای نەوە سەرپەرشتی دەکەن.

تەکێی تاڵەبانی لە زۆربەی خاکی کوردستان و پارچەکانی تری وەکو لە شاری سنە لە رۆژهەڵاتی کوردستان و شاری سیڤاس لە باکووری کوردستان و لە شاری بەغدایش لقی هەیە.

تەکێی تاڵەبانی لە هەرە تەکێ و مزگەوتە دێرینەکانی شاری کەرکوکە، دیارە لە شارەکەدا گەلێك تەکێی دیکە هەبووە، بەڵام بەشی زۆریان لەگەڵ رۆژگاردا بیناکانیان تووشی داڕووخان

هاتوون و فەوتاون. تەکێی تاڵەبانی ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە بووژاندنەوەی زانستی ئیسلامی و شەریعەت و ئەدەب و هونەرو پەرەپێدان بە هەڵگیرسانی بزووتنەوەی شیعرو ئەدەب بە زمانەکانی کوردی و تورکی و عەرەبی فارسی، لەگەڵ ئەوەیشدا زۆرینەی شێخەکانی تەکێ خاوەنی دیوانی شیعری بەپێزن نموونەی دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی، دیوانی خاڵسی، گرنگی زۆریشیان بە پەروەردەکردنی قورئان خوێنەکان داوە لە هەموو سەردەمەکاندا پارێزگاریان لە سۆزو ئاوازی مەقام و مەقامخوێنەکان کردووەو ساڵانە خولی تایبەت بەم هونەرە لەلایان شارەزایانەوە دەکرێتەوەو بە بەردەوامی نەوەیەکی نوێی دەنگخۆشی ئەم بوارە پەروەردە دەکەن، کە پارێزگاری کردنە لە پاراستنی مەقامە ڕۆژهەڵاتییەکان بە گشتی و مەقامە کوردییەکانیش بەتایبەتی ئاوازو تەواشیح و تەنزیلەو تەهلیلەو بانگدان بە ئاوازی ئەم مەقامانە دەخوێنن، بۆیە بووەتە پێگەیەکی گرنگ بۆ بواری هونەری مەقامات بەگشتی.

تەکێی تاڵەبانی دانیشتنی تایبەتیش بەخوێندن و چڕینی مەقامات ڕێکدەخات و دوو ڕۆژیش لە هەفتەیەکدا بۆ مەراسیمی زیکر تەرخان دەکەن. هەڵبەتە گەلێك هونەرمەندی بەتوانا لە تەکێ سوودمەند بووەو پێگەیشتووەو بەرهەمی لە کۆمپانیاکانی قەوان و ڕادیۆو تەلەفزیۆنەکانیش تۆمار کردووە لە بنەرەتدا دەرچووی ئەم تەکێیەن و لەوێوە پێگەیشتوون یەکێك لەوانە هونەرمەندی گەورە عەلی مەردانە.

## * ڕێوڕەسمی زیکر لە تەکێی تاڵەبانی:-

زیکر لە سەرجەم تەکیەکاندا بەڕێوڕەسمی سەرەکی دادەنرێت، لە تەکێی تاڵەبانیشدا ڕێوڕەسمی سرووتی زیکر لەگەڵ دامەزراندنی تەکێی تاڵەبانی لە کۆتایی سەدەی هەژدەوە تاکو ئەمڕۆ ئەم مەراسیمە ئەنجام دەدرێت، هەروەها هەموو بۆنەو یاد و مەراسیمەکانی دیکەی ئایینی لە تەکێیەکەدا بەرز ڕادەگیرێ‌و یادی دەکرێتەوە نموونەی (یادی لەدایك بوونی پێغەمبەر دخ، مەراسیمەکانی شەوانی قەدر).

دیارە ئەنجامدانی زیکر وەکو ڕێوڕەسمێکی ئایینی گەورە لە هەموو تەکییەکانی دیکەی لە ڕێبازەکانی قادری و کەسنەزانی و ڕیفاعی و پەیرەو دەکرێت، ئەنجامدانیشی لە کۆمەڵێ برگەی دیکەی وەکو (تەهلیلە، تەنزیلە، زکری پەروەردگار، مەدح و پیاهەڵدان بۆ پێغەمبەر د.خ، سیفەتەکانی پێغەمبەرو پیاوچاکان) دیارە ئەمانە هەمووی لە ڕێگەی ئاوازو نەوای دڵگیرەوە دەگوترێتەوە بە زمانی شیرینی کوردی و بە زمانەکانی تری عەرەبی و فارسی و تورکیش ئەو هەڵبەست و قەسیدانە دارێژراون لەلایان شاعیری تایبەت بە ئەدەبیاتی ئایینی ئیسلامەوە هەڵبەتە گەلێك لە شاعیرانی کلاسیکی کورد خاوەنی ئەم جۆرە ڕێبازە ئەدەبیەن بە تایبەتیش لە شیعری تەسەوفدا، هەندێك لە شاعیرانیش هەر پەروەردەی هەندێ لە تەکێ و خانەقاکانی کوردستانن نموونەی شێخ ڕەزای تاڵەبانی‌و باب‌و باپیرانی بەتایبەتی(عەبدولڕەحمان خاڵسی)هەروەها خاڵسی کە باوکی شێخ ڕەزای تاڵەبانییە.

## * چڕین و بەکارهێنانی ئاوازو پەیژەو مەقامەکان لە تەکێ:-

دەنگ و ئاوازو نەوای برگەکانی زیکر دیارە پێکهاتەی فۆرم و ئاوازو مەقامە ڕەسەنە کوردییەکان و مەقامەکانی ڕۆژهەڵاتین هەر دەرهاوێشتەی ئەو پەیژە مۆزیکییانەن کە سەدان ساڵە لای میللەتی کوردو نەتەوەکانی دەوروبەرمان ئاوازەکانی پێ جۆش دەکرێت و ئاوێتەی ناخمان بووە کە بریتین لە چەندین پەیژەو مەقامی سەرەکی و لاوەکی لە تەکێدا دەچڕن:-

١ - مەقامە سەرەکییەکان:

( ڕاست، بەیات، سێگا، سەبا، چوارگا، عەجەم، نەهاوەند، کورد، حیجاز، حیجازکار).

٢- مەقامە لقەکان:

(هومایۆن، ئەوشار، دەشت، مەسنەوی، موحەیەر، خەنەبات، نەوا، هوزام، ئورفە، موحەیەر، موخالیف، خەلوەتی، پێنجگا هتد........)

٣- مەقام و فۆرم و ئاوازە کوردییەکان:

شان بەشانی مەقام‌و پەیژە سەرەکییەکان چەندین ئاوازو مەقامی کوردی ڕەسەن لەناو ئەم مەراسیمانەدا ئاوێتەی قەسیدەو شیعرو هەڵبەستە ئایینییەکان دەبن کە وەکو ئەرشیفێکی مۆزیکی ئایینی چەندین ئاوازی ئاوازەی تێدایە، ئەمەیش ناوی ئەو ئاوازە مەقامییە کوردییانە (قەتارو خاوکەر، خورشیدی، هیجران، ئای ئای، سەفەر، ئەڵڵاوەیسی، نیوەشەوی، هۆرە، موحەیەر) هەروەها چەندین ئاوازی مەقامی هەیە کە تایبەتە بە شاری کەرکوك لێرەدا دەخوێندرێت نموونەی (قۆریات، مەنسوری، قەزاز، مەسنەوی، بەیاتی کەرکوك).

زیکر لە تەکێی تاڵەبانی تایبەتمەندی خۆی هەیە بەچەند خاڵێك لە زیکری تەکییەکانی دیکە جیا دەکرێتەوە:-

ا- لە تەکێی تاڵەبانی دەقی ئاوازی تەنزیلەکان (گۆرانی ئایینی) بەچوار زمان تا ئێستا دەخوێندرێت تەنانەت بەزمانی فارسیش.

ب - ئەنجامدانی زیکر دادەبەسترێت بۆ (٧) بەش (فصل) کە هەموو ڕۆژانی هەینی لە دوای نوێژی هەینی کۆڕی زیکر ڕێکدەخرێت، هەروەها هەموو شەوانی دووشەممە لەسەر سێشەمەیش دیسان هەر بەردەوام دەبن، بەڵام بە قەوارەیەکی بچووکتر.

ج - ڕیتم ئاوازو مەقامەکانی تەکێی تاڵەبانی تارادەیەك جیاوازیان لەگەڵ تەکییەکانی تردا هەیە، چونکە ئاوازی ئاوازەو تایبەت بەشاری کەرکوك لەوێدا بەرجەستە دەکرێت لە تەکییەکانی تری عێراق بەکاری ناهێنن.

* سەرەتای دابەستنی ڕێورەسمی زیكر:-

ڕێورەسمی زیكر لە تەكیێ تاڵەبانی دابەش دەبێت بۆ حەوت بەش(فصل)، مەبەست لە دابەشبوونی زیكرەكە بۆ جوڵەو حەرەكەی دەروێشەكانە لەسەر كێش و ڕیتمەكانە كە لەسەر خێرایی زرمەو گوشمی دەفەكان ڕەوت و جوڵەكان دابەش دەبێت كە پێی دەڵێن(فصل) لە ڕێگەی ئەم مەراسیمە ئایینییەوە لەگەڵ بەكارهێنانی چەند ئامێرێكی ڕیتمی وەكو (دەفی دەروێش) ٤ بۆ ٥ دانە بەكاردەهێنن (ئامێری دووتەپڵی یان دووتاس) بەدوو دەسكی دارین لێدەدرێت كە لەدێرزەمانەوە لە تەكیێ خانەقاكانی كوردستاندا بەكاردەهێندرێت ئیتر هەر فەسڵێك بۆخۆی ڕیتم و كێشێكی تایبەتی هەیە لەنێو ڕیتمەكانی (دەروێشی یاخود ڕیتمی وەحدە كە لە چوار ترپەیەكانە ٤/٤ یاخود ڕتیمی سەنگین سەماعی واتە ٦/٤ هەروەها سواری ٢/٤ ئەیوبیشی پێدەڵێن لەگەڵ ڕیتمی جۆرجینە ١٠/١٦ هەروەها چەندین ڕیتمی قورس و لێكدراویش دەخەنە ناو كۆڕی زیكرەوەو ئیدی دەروێشەكان لەسەر ئەو ڕیتم و ئاوازانە دەچنە حاڵەتی تەسەوفەوەو تەنزیلەو ئاوازەكانیان لەگەڵ جوولەی لەشیان ئاوێتە دەبێت و دەچنە ناو دنیای خواپەرستی و عیبادەتەوە بەم جۆرە مەراسیمی زیكرەكەیان لە حەوت فەسڵی دوابەدوای یەكدا ئەنجام دەدەن .

فەسڵی یەكەم: (فصل التوحید) ناوی فەسڵی تەوحیدە سەرەتا دەست دەكەن بەخوێندنەوەی ئەم دوعایە لەسەر ئاوازی ئەفشار یان بە ئاوازی خورشیدی دەیخوێننەوە دیارە دوعای تریش دەخوێندرێتەوە بەهەمان ئاواز.

(اللهم صلي علی سیدنا محمد وعلی آل سیدنا محمد بعدد كل داء ودواء و بارك علیه وسلم تسلیم)

ئەم دوعایە موریدو دەروێشەكان بە كۆمەڵ و زۆر بەجوانی وەكو یەك كەس دەیڵێنەوە لە شێوەی كۆراڵێكی ئایینی بێ پاش و پێشكردن دێتە بەرچاو لە شێوەی ئاوازێكی مەقامی بێ ڕیتمدایە چەند جارێك دووبارەی دەكەنەوە لە پێش بەستنی زنجیرەی زیكر وەكو لە نموونەی ژمارە یەكدا دەیبینین.

نموونەی ژمارە (1)

پاشان دەنگخۆشان و مەقامبێژان و دەروێشەكان بە سەرپەرشتی شێخی سەرپەرشتیاری تەكێ لەژێر قوبەی هۆڵی زیكرەكە بە خڕی كۆدەبنەوە لە تەنیشتیشیانەوە شوێنی ڕاوەستانی دەف ژەنەكانە، ئیتر دەست دەكەن بە خوێندنی (تەهلیلەكان) كە ناوی خوای گەورە (الله تعالی) دەهێنن بەشێوەی ئاوازی ڕێكخراو لە (یەك مییانە دەنگیدا) واتە یەك پلەدەنگی تەواو(٢th).

دیارە من وەكو توێژەر دەقی ئەو ئاوازانە وەكو خۆی دەنووسمەوە ڕەنگە هەندێ جاری تر ئاوازەكان بەشێوەیەكی تر بێت، ئاوازی ئەم تەهلیلیلانەیش وەكو ڕستەیەكی مۆزیكی تەواو دارێژراوە لە هەشت باری تەواو پێكدێت پێنج جار ئەم ڕستەیە دووبارە دەبێتەوە كەواتە بریتییە لە تیمەیەكی چل باری لەسەر ڕیتمی ٣/٤ بەترپەی خاو وەكو لە نموونەی ژمارە (٢) دا بە نۆتەی مۆزیك نووسیمانەتەوە.

نموونەی ژمارە 2



پاش ئەم تەهلیلەیەیش بە ئاماژەی شێخ یوسف ڕیتم دەگۆڕێ بۆ كێشی چوار ترپەیی ٤/٤ خوێندنی تەهلیلەكە بەردەوام دەبێت بەشێوەی (Restativ)واتە دەقی ئاوازدار بەناو هێنای خوای گەورە (یا الله) نزیكەی چل جار وەكو لەم نموونەی ژمارە ٣ نوسراوەتەوە.

Largo　　نموونەی ژمارە 3



پاشان ناوهێنانی خوای گەورە (یا الله) بە ڕیتم و كێشێكی لێكدراو دەیخوێنن كە بریتییە لە تێكەڵ كردنی كێشی ٣/٤ لەگەڵ كێشی ٥/٤ لەگەڵ ترپەی هەشتەمدا (حی) بۆزیاد دەكرێت بەشێوەیە (یا الله یا یا الله حی) ئەم ڕستەیەیش زیاتر لە دەجار دووپات دەكرێتەوە بە ئاماژە كردنی شێخ یوسف ڕادەوەستن نموونەی ژمارە ٤ بەنۆتەی مۆزیك تۆماركراوەو نووسیومانەتەوە.

نموونەی ژمارە 4

لەپاش كێشی ٨/٤ ئیتر تەهلیلەكە دەگۆڕێ بۆشێوە ئاوازێكی تر لەسەر كێشی (٢/٤) و پەیژەی مەقامی عەجەم بەخێرایی ترپەكانی مام ناوەندیە زیاتر لە بیست جار ئەم

نموونەیە دووبارە دەکەنەوە تا کۆتایەکەی لەسەر دەستی شێخ هەموو بێدەنگ دەبن کۆتایی بەشی یەکەمی یاخود فەسلی یەکەمی زیکرەکە دێنن کە ژمارە (٥) نموونەی ئاوازەکەیە.

نموونەی ژمارە 5

**فەسڵی دووەم: فەسڵی قادری**

سەرەتای ئەم فەسڵە بە خوێندن و چڕینی مەقامی سەبا دەست پێدەکات بە شێوەی مەقامخوانی تەواو هەر لەدەسپێک (تحرير) و ناوبەندو (ميانه) سرەوتن (تسليم) بە قەسیدەیەکی ئاینیی هەر جارەو بەزمانێک دەخوێندرێت بەزمانەکانی (کوردی عەرەبی تورکمانی)، دوا بەدوای چڕینی مەقامەکە یەکێک لە تەنزیلە تایبەتەکانی تەکیی تاڵەبانییە بەناوی (ما مەحرەمی سوڵتانیم) وەکو حاڵەتێکی نەگۆڕ دەبێت بخوێنرێت کە لەشیعرێکی تەسەوفی (شێخ عەبدولڕەحمان خاڵسییە) و ئاوازێکی ڕەسەنی کوردییە لەسەر پەیژەی مەقامی ئەو شارە لەسەر کێشی چوار ترپەیەکی قورس و سەنگین و خاوە (وحدة الكبيرة) وەکو لە نموونەی تۆمارکراوی ڕیتمی ژمارە ٦بەرچاومان دەکەوێت.

نموونەی ژمارە 6

کاتێ دەست بەوتنی تەنزیلەی مامەحرەمی سوڵتانیم دەکرێت سەرەتا دەفەکان دەست پێناکەن تەنیا دەستەواژەکانی (الله حی هو) لەلایان بەشێك لەدەروێشەکانەوە وەکو هاوشانی کردنی ئاوازە سەرەکییەکە دەیڵێنەوە بەشێوەی ڕیتمی ڕێك و پێك نزیك ٣٢ بار ئەمە بەردەوام دەبێت نزیکەی دوو خولەك و نیو دەبێت ئینجا دەف و ئامێرە ڕیتمییەکان دێنە ناوەوە. تەنزیلەکە بەردەوام دەبێت، بۆیە ئاوازەکە دەبێتە سێ هێڵی مۆزیك لەیەك کاتدا بەم چەشنە:

* هێڵی سەرەکی ئاوازەکە (مامەحرەمی سوڵتانی) دەقەکەی دەوترێتەوە.

* هێڵی دووەم دەروێشەکان (الله حی هو) بەشێوەی ڕیتمی دەیڵێنەوە وەکو لایەنی بەهێزی ڕیتمەکە هاوشانی (acent) ئاوازەکە دەکات.

* هێڵی سێیەم ئامێرە ڕیتمییەکانە وەکو هەموو ئاوازەکانی تر. ئەمەیش نموونەی تەنزیلەی (مامەحرەمی سوڵتانیم)

نموونەی ژمارە 7

ما مەحرەمی سوڵتانیم، مصاحب الديوانی، های های جبل قوم قوم، های های جبلی قوم قوملەشیعری شێخ عەبدولڕەحمان خاڵسی

پاشان دەست بەچڕینی چەند تەنزیلەیەك تر دەکرێت لەسەر مەقامی (سەبا) بۆ نموونە تەنزیلەی (شمسی بورجی) تەنزیلەی (صلى الله عليه وسلم)

شەمسی بورجی نیکتیفا بولبولی باغی و ضحی
ئەی گوڵی گوڵزاری هدی جەنابی ئەحمەد مصطفى
گەوهەری تاجی ئەنبیاء ڕەهبەری فیرەقی الضیاء

نموونەی ژمارە 8

* تەنزیلەی (صلى الله عليه وسلم)

صلى الاله وسلم على النبي المكرم
ما ناح طير يا طير الحمام
على الارائك ورنم
يا مصطفى انت حبي
كذا امالي وذخري
صل عليه يا رب
ما سار حج ويمم

نموونەی ژمارە 9

لەپاش ئەو چەند تەنزیلەیەی لە پەیژەی مەقامی سەبا دەخوێندرێت دەستدەکەن بە خوێندنی مەقامی حیجاز لەلایان مەقامخوێنێکەوە چەند برگەیەکی قەسیدەیەکی

ئایینی ئاوێتەی مەقامی حیجاز دەکات و ئیتر دەست دەکەن بە چڕینی چەند تەنزیلەیەك هەر لەسەر پەیژەی مەقامی حیجاز دەبێت لەگەڵ زیکری دەروێشەکان و ئاوازو هەڵبەستەکان ئاوێتەی یەك دەبن هەندێ جاریش سوود لە هەندێ ئاوازو گۆرانی شێوازی کلاسیکی ڕۆژهەڵاتی وەردەگیرێت دەکرێت بە تەنزیلە، هەرچەندە لای هەموو میللەتانی دەوروبەرمان بە کوردی خۆیشمانەوە لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە زۆر میلۆدی گۆرانی ئایینی کراوە بە گۆرانی دنیایی دواتریش حاڵەتەکە پێچەوانە بووەوە گۆرانی و بەستەو موەشەح کرا بە تەواشیحی ئایینی. نموونەی ژمارە ١٠ تەنزیلەیەکە

صلاة الله ذو الكرم

نموونەی ژمارە 10

لەمەقامی حیجاز:

ئەم تەنزیلەیە لە بنەرەتدا موەشەحە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی کۆتایی عوسمانییەکان، ئەم ئاوازە لە کوردیدا لەلایان مەلا کەریمەوە بە (کە دەڵێن ئەمڕۆ دەشت و کێو شینە) وتراوە بە عەرەبییش بە (قدك المياس) وتراوە، ئیتر لەم فەسڵەیشدا بەچەند تەنزیلەکی یەك لەدوای یەك لەسەر پەیژەی حیجاز بەردەوام دەبن کاتێکی درێژ تێدەپەڕێنن لەگەڵ زیکر کردندا تاکو کۆتایی فەسڵەکەو دیسان بە ئاماژە کردن لەسەر دەستی شێخ ڕادەوەستن.

*** فەسڵی سێیەم: فەسڵی دائیم (فصل الدائم)**

لە فەسڵی دائیمدا ڕۆڵی ئاوازی ئورفە (دیوان) دێت لەلایان یەکێك لە مەقام خوێنەکانەوە ئەم ئاوازە دەخوێندرێ دەکرێت بە بەری قەسیدەیەکی ئایینیداو وەکوو پشوویەکیش دەبێت بۆ دەنگبێژەکانی کۆڕی زیکرەکە، چونکە وەکو ئاشکرایە مەقامخوانی ئازادە لەوتندا یاخود کێشی نییە، ئاوازی ئورفەیش لقی مەقامی بەیاتە جۆرێکە لەمەقامخوانی و ئاوازێکە لەپەیژەی مەقامی گەورەی بەیاتەوە سەرچاوە دەگرێت، لەپاش ئەم مەقامخوانییە دووبارە لەسەر دەست و ئاماژەی شێخی تەریقەت و ئیرشادی تەکیەکە وەکو (مایسترۆ) دەروێشان و دەنگبێژان دەست بەخوێندن وچڕینی چەند (تەنزیلە) یەك دەکەن هەر لەسەر پەیژەی مەقامی بەیاتەوە دەبێ سەرچاوە بگرێت، بەڵام لە تەنزیلەی دووەمەوە ڕیتم و کێش لە ٤/٤ دەروێشی (وحدە) دەگۆڕێت بۆ کێشە دوانێکان ٢/٤ (سواری) بە کوردی لە عێراقیش پێی دەڵێن ئەیوبی یاخود ڕیتمی (مقسوم)، لێرەدا کۆڕی زیکر بەخێرایی کێش و ڕیتمەکان گەرمتر دەبێت و دەروێش وزیکرگێڕان دەکەونە حاڵەوەو هەموو جەستەیان لەسەر ترپەو زرمەی دەفەکان دەجووڵێت، من وەکو توێژەرێك ئەونموونانەم لەکاتی زیکرو بەدەنگی هونەرمەندانی مەقامبێژ (میقداد عومەر، هیوا هادی) بەجیایش تۆمارکردووە، هەندێ لەم ئاوازەنەیش (تەنزیلە) لەڕێورەسمی یادی مەولودی پێغەمەریش (د.خ) بۆنە ئایینییەکانی تریش ئەم ئاوازانە دەخوێندرێت و ئەدا دەکرێت، لێرەدا چەند تەنزیلەیەکمان بەنۆتەی مۆزیك تۆمارکردووە کە لەفەسڵی دائم دەیخوێنن.

نموونەی ژمارە 11 — يا سيد الكونين يا مصطفى — Moderato

يا سيد الكونين يا مصطفى
ارجو النجا يوم حلول الوفا
فكن ناصري سيد الثقلين امام البشر
شفيعنا غدا يوم المحشر
صلو مع عثمان على النبي
احمد محمد زاكي النسب
فكن ناصري سيد الثقلين امام البشر
شفيعنا غدا يوم المحشر

نموونەی ژمارە 12 — اللهم صلي وسلم وبارك — Moderato

اللهم صلى وسلم وجد وبارك
على النبى محمد وآلى محمد
سيد الرجال المفضل
يا بحر الكمال يا محمد

نموونەی ژمارە 13 — ئەی خاڵۆی ڕێبوار — Moderato

ئەی خاڵۆی ڕێبوار
ڕێگا نازانم
لەدوورەوە هاتم
خەڵکی کوێستانم

لە کۆتایی فەسڵی دائیمدا بەهێزی زرمەی دەفەکان و خێرایی جووڵەی دەروێشەکان و خێرایی کێشی ئاوازەکان دەگەنە لوتکەی هەڵچوون کە لێرەدا دەردەکەوێت دەروێش و سۆفییەکان چۆن دەگەنە لوتکەی جیهانی سۆفیزم و نزیك بوونەوەیان لە لوتکەی نزاو خواپەرستی و لەپڕ دەفەکان بە ئاماژەی مامە شێخ دەوەستێت و کۆڕی زیکر دەگۆڕێ بۆ جۆرێکی تر لە دنیای تەریقەتی خواپەرستی.

*** فەسڵی چوارەم: فەسڵی حەدادی یەکەم**

لە فەسڵی حەدادی یەکەم هەموو دەنگبێژەکان رادەوەستن وەکو پشوویەك) Rest(<لێرەدا رۆڵی ئامێرە ریتمییەکان دێتە پێشەوەو ناڵەی دەفەکان بەشێوە تەکنیکێکی نوێوە کۆڕی زیکر گەرم دەکەن، لێرەدا کێش و ریتمی نامۆو ریتمی ئاڵۆزو لێکدراو سەیر لە گۆشم و پێکهاتەی ریتمی دێتە مەیدان، زرمەو پڕی دەنگی دەفەکان بەدەستی دەروێشانی دەفژەن دەبیستین، لەلایەکی تریشەوە جۆرێك لە جووڵەو نواندن دەکەوێتە ناو کۆڕی زیکرەکەوە کە نمایشکردنی کارەکتەری پیشەی ئاسنگەرانی جارانە کە چۆن ئاسنی گەرم دەکوتن بەدەست ئاماژە بەو جووڵەیە دەکەن.

لێرەدا دەروێشەکان بە شێوەی پرسیارو وەڵام یەکێکیان لەسەر ئەو کێشە قورس و ئاڵۆزە یەك بەیەك ناوەجوانەکانی خوای گەورە (اسماءالله الحسنى) لەسەر ئەوریتمە دەڵێتەوەو وەکو(سۆلۆ، تاك) سۆفی‌و دەروێشانی دیکەیش هاوشێوەی (کۆرس) بە وشەی (الله) وەڵامی تاکە دەروێشەکە دەدەنەوە، کە وەکو دەنگبێژێك و کۆرس خۆی دەنوێنێ بەڵام لەسەر یەك دەنگ (ریستاتیڤ) واتە دەقی ئاوازدار. بەردەوام دەبن لەناوهێنانی (٥٠) ناو لە ناوە جوانەکانی خوای گەورە وەکو باسمان کرد بە ووشەی (الله) وەڵامی دەدەنەوە ئەم کردارە لەسەر کێشی ١٢/٨ لێدەدرێت وەکو لە نموونەی ژمارە ١٤ ئەو ریتمانە نووسراونەتەوە.

نموونەی ژمارە 14

پاشان ریتمەکە دەبێتە کێشی ٩/٨ وەکو لە هێڵی دووەمی نموونەکەی سەرەوەدا هاتووە چەند بارێك و چەند ساتێك دەفەکان لەسەر ئەم کێشەی دیکەیان بەردەوام دەبێت تاکو لەپڕ کێش و ریتم دەگۆڕێ بۆ فەسڵی دووەمی حەدادی.

*** فەسڵی پێنجەم/ فەسڵی حەدادی دووەم**

لە فەسڵی حەدادی دووەم رەوتی ریتمەکان دەبێتە جۆرێك لە کێشی ٦/٤ بەڵام ئەم شەش چوارە جیاوازە لە کێشی سەماعی سەنگین ئەویش لە ناوەرۆکی ترپەکاندا یاخود شوێنی (دم و تەکەکاندا) جیاوازن وەکو ئەم نموونەی ژمارە ١٥.

نموونەی ژمارە 15

لەگەڵ خوێندنی مەقامی (موخالیف بەغداد) هەر لە سەرەتاوە دەفەکان بەردەوام دەبن، دیارە ئاوازی ئەم مەقامە کە لەم فەسڵەدا دەخوێندرێت مۆرکی بەغداو خواری عێراقی پێوە دیارە، دیارە مەقامی موخالیف دوورە لەرەسەنایەتی کوردی و مەقامەکانی تایبەت بەشاری کەرکوك، رەنگە هاتنە ناوەوەی موخالیف حەزو ئارەزووی مەقام خوێنان بێت وەکو مۆدێلێك لەمەقام خوێنە بەغدادییەکانەوە وەریان گرتبێت.

ئیدی دوای مەقامخوانەکە دەست بە تەنزیلەکان دەکەن، بەڵام لەپەیژەو مەقامی جیاواز بەردەوام دەبێت.

*** فەسڵی شەشەم/ (فەسڵی ریفاعی)**

لەم فەسڵەدا رەوتی کێش و ریتمی تەنزیلەکان پشت بە کێشی جۆرجینە ١٦ /١٠ دەبەستنن، زۆرینەی پەیژەو مەقامەکان لەسەرەکی و لقەکانی پەیژەی مۆزیکی کوردی رۆژهەڵاتی لەناو فەسڵی ریفاعیدا خۆی دەبینێتەوە، بەڵام بەکێشی جۆرجینە، ئەم کێشە ئاوێتەی قەسیدەکانی (في البردة المديح) دەبێت کە کۆمەڵ قەسیدەی مەدح و سەنای پێغەمبەری خۆشەویستە(د.خ). لێرەدا نمایشی چەند تەنزیلەیەك دەکەن لەسەر ئەم کێشە کە جۆرجینە (١٦/١٠) کە مۆرکێکی رەسەن و شێوازێکی میللی گورج و گۆڵ لەخۆ دەگرێت کە جیاوازن لە ئاوازی فەسڵەکانی تر. بۆیە لێرەدا جووڵانەوەی جەستەی دەروێشەکان لەگەڵ زرمەو ناڵەی دەفەکان دەگۆڕێت نیوەی جەستەیان دەچەمێننەوە بەرەو خوارەوە بەرەو سەرەوە وەکو لای دەروێشان باوە.

بە پێویستم زانی ئاماژە بەناوی ئەو تەنزیلەو ئاوازانە بکەم کە لە فەسڵی شەشەم کە فەسڵی ریفاعیە وەکو ئاماژەمان پێکرد ئاوازەکانی تەنزیلەکان لەسەر کێشی جۆرجینەن، بەڵام لەسەر پەیژەو مەقامی جۆراو جۆرن ئاماژە بەناوی چەند تەنزیلەیەك دەکەین کە لەهەمان کاتدا لە یادو مەولودی پێغەمبەر (د.خ) لەگەڵ بۆنەکانی شەوی قەدرو یادی شێخ عەبدولقادری گەیلانی گوێبیستی ئەم ئاوازانە دەبین کە بەزمانی عەرەبی تورکیش دەوترێن:

١- (مولای صلی وسلم) بە چەندین ئاوازی جۆراوجۆر گوێبیستی دەبین.

٢- یا رەسول الله یا شای مەدینە

٣- چەند خۆشە بچینە مەدینە

٤- پێغەمبەر نازدارە

٥- في طاعة الغفار

٦- انشكوت الهوى فما انت منا

٧- یامحمد الله سێوەر

٨- الف وصلاة والسلام على النبي خير الانام

نموونەی چەند تەنزیلەو ئاوازێك بەنۆتە تۆمار دەكەین كە لە فەسڵی ڕیفاعی دەیخوێنن، لەكێشی جۆرجینەیەو لە تەكێ بە ڕیفاعی ناوی دەبەن وەكو نموونەكانی ژمارە ١٦، ١٧، ١٨:

مولای صلی وسلم

نموونەی 16

نموونەی ژمارە 17

نموونەی ژمارە 18

الف صلاة والسلام

الف صلاة والسلام     على النبي خير الأنام

* فەسڵی حەوتەم:

دووبارەبوونەوەی فەسڵی یەكەمە واتە (فەسڵی قادری)، بەڵام وەكو خاتیمەو كۆتایی مەراسیمی كۆڕی زیكرە.

ئەم فەسڵە تەنیا وەكو كێش و خێرایی ئاوازەكان هاوشێوەی فەسڵی یەكەمە كە كێشی چوارترپەییە ٤/٤، بەڵام هەندێك لە فەسڵی یەكەم خێراترە، ئەم ڕیتمە لە مۆزیكی كوردیدا بەتایبەتی مۆزیكی ئایینی كوردی پێی دەڵێن (دەروێشی) وەكو نموونەی ژمارە ١٩ لە دووباردا تۆمارمان كردووە:

نموونەی ژمارە 19

ئاوازو تەنزیلەكانی ئەم فەسڵە لەسەر زۆرینەی پەیژەو مەقامەكانی وەكو (ڕاست، سێگا، بەیات، عەجەم، حیجاز، موحەیەر، كورد، نەهاوەند، هتد.......) بەكار دەهێنن.

بۆ ئاشنابوون بەو چەندین تەنزیلەو ئاوازانە لە فەسڵی حەوتەمدا دەیچڕن دوو نموونەی جیاواز كە ژمارە ٢٠ - ٢١ بەنۆتەو قەسیدەكانیانەوە نووسیمانەتەوە

* تەنزیلەی (موسڵمانان) لەپەیژەی مەقامی ڕاستە ئەم قەسیدەیە شیعری شێخ عەبدولڕەحمان تاڵەبانییە نازناوی (خالسی)یە بە زمانی فارسی نووسراوەتەوە كە باوكی شێخ

ڕەزای تاڵەبانییە:

موسڵمانان چە حالەست این زكارخویش و حەیرانم

نەراهی شرع می بویم نەكافر نەموسڵمانم

گاهی درعشق شیەدایم گاهی درمجنون ریسوایم

گاهی دەروێش وبیجایم گاهی سوڵتانی دەوەرانم

شراب عشق تا خوردم شدم كافر بە بوتخانە

ندانم مذهبمیللەت نباشد هیچ سامانم

موسلمانان

نموونەی ژمارە 20

Allegro

* تەنزیلەی (دزە رب الانام) لەمەقامی (موحەیەرە) كەلقی مەقامی بەیاتە ڕیتمەكەیشی دەروێشیە٤/٤

دزە رب الانام

سید ماحي الظلام

بالله الانام

نظرة فانظر عليه

يارب يارب

يارب فارحم عليه

نموونەی ژمارە 21 دزە رب الانام

Allegro

* لێكۆڵینەوەی توێژینەوەكە:-

كۆكراوەی توێژینەوەكە بریتییە لە ئاوازو تەنزیلەی ئایینی لە تەكێی تاڵەبانی قادری.

*نموونەكان: نموونەكان لە دوو تەنزیلە پێكهاتووە كە ڕاستەوخۆ تۆمارمان كردووە بەنۆتەی مۆزیك ڕاستەوخۆ ئەم دوودانەیەمان هەڵبژاردووە:-

نموونەی ژمارە(١)
ناو: تەنزیلەی مامحرمی
دەنگخۆشی جێبەجێکار: هونەرمەندی مەقامبێژ (میقداد عومەر)
بەرواری تۆمارکردن: ٢٢ی ئاداری ساڵی٢٠١٤
شوێن: گەرەکی ئیسکان
دەقی نموونەی مامحرم:-
مامحرم سولتانیم
مصاحب الدیوانی
های های جبل قوم
های های جبلی قوم قوم

تنزيلة ما محرم سلطانيم

Moderato

نموونەی ژمارە (٢)
ناوی نموونەکە: تەنزیلەی مەولایا صلی
دەنگخۆشی جێبەجێکار: هونەرمەندی مەقامبێژ (میقداد عومەر)
دەنگخۆشی جێبەجێکار: ٢٢ی ئاداری ساڵی ٢٠١٤
شوێن: ناو شاری کەرکوك گەرەکی ئیسکان
دەقی نموونەی مامحرم:

مولايا صلي وسليم

دەقی نموونەی تەنزیلەی دووەم:
مولایا صلی وسلیم
لدائم الابد
علی حبیب کخیر
خلق کل الهم

* ئامرازەکانی توێژینەوەکە:
دانانی بنەماو پێوەرەکانی زانستی مۆزیك بۆ شیکاری لە دیاریکردنی تایبەتمەندی ئاواز لە نموونە ئاوازەکانی تەکێی تالەبانی.
پێوەرەکان ئەم خاڵانە لەخۆ دەگرێت:-
١- پەیژەی مەقامی
٢ - رەگەزو گۆشەکان
٣- کێش
٤ - خێرایی رەها
٥ - دەنگی یەکەم
٦- کۆتا دەنگ
٧ - بەرزترین دەنگ
٨- نزمترین دەنگ
٩ - ژمارەی دەنگە لەدوای یەکەکان (هەنگاو)
١٠ - ژمارەو دەستنیشانکردنی بازدانی دەنگەکان
١١- ژمارەی تێکرای دەنگەکان
١٢ - رستە ئاوازییەکان
١٣- مەودای دەنگ و ئاوازەکان
١٤- رەوتی ئاوازەکان .

* شیکردنەوەی توێژینەوەکە:-

* شیکردنەوەی نموونەی ئاوازی یەکەم (تەنزیلەی مامحرمی سولتانیم)
١ - پەیژەی مەقامی: تەنزیلەی (مامەحرەمی سولتانیم) لەسەر پەیژەی مەقامی ئەوشارە کە لقی پەیژەی مەقامی سێگایە لەسەر پلە دەنگی (ئیراق - سی کاربیمۆل)

٢- رەگەزو گۆشەکانی ئاوازی نموونەی یەکەم:-
(رەگەزی سیانی سێگا) لەسەر پلەی یەکەم (رەگەزی نەماوەند) لەسەر پلەی سێیەم
٣- کێش وریتم: ئاوازی (مامحرم) لەسەر ریتمی چوارترپەییە ٤ / ٤ (وحدە) دەروێشی

٤- خێرایی رێژەیی: یەك (نوار) = ٨٢ جار لەخولەکێکدا
٥- دەنگی سەرەتا: (رێ)
٦ - دەنگی کۆتایی: (سی کاربیمول)

٧- بەرزترین دەنگ: (فا)

٨ - نزمترین دەنگ:(سی کاربیمول )

٩ - ژمارەی دەنگەلەدوای یەکەکان:(٤٩) هەنگاو

١٠ - ژمارەی بازدانی دەنگەکان: (یەك بازدان لە جۆری میانەی سیانی ڕاست)

١١- ژمارەی تێکڕای دەنگەکان:(٥٠) دەنگ

١٢- ڕستەی ئاواز: (دوو ڕستە ئاوان)

١٣- مەودای ئاوازەکە:

١٤ - ڕەوتی ئاوازەکە: لە پلەی (سیکاربیمۆل) تا پلەی (فا)

شیکردنەوەی نموونەی دووەم تەنزیلەی (مولایا صل وسلم)

١- پەیژەی مەقامی: لەسەر پەیژەی مەقامی ئەوشارە کە لقی پەیژەی مەقامی سێگایە لەسەر پلە دەنگی (نیم حەسار - فا کاردێز)

٢- ڕەگەزو گۆشەکانی ئاوازی نموونەی دووەم:

(ڕەگەزی سیانی سێگا) لەسەر پلەی یەکەم (ڕەگەزی نەهاوەند) لەسەر پلەی سێیەم

٣- کێش وریتم: کێشی ئاوازی تەنزیلەی (مولایا صل وسلم) بریتییە لە کێشی (جورجینە ١٠ /١٦) وەکو ئەم نموونەیە

٤- خێرایی ڕێژەیی: - ٨٠ ترپە لەخولەکێکدا

٥- یەکەم دەنگی سەرەتا: پلەدەنگی (لا - جوسەینی)

٦ - پلەدەنگی کۆتایی ئاوازەکە: (فا کار دیز - تەك حیجان)

٧ - بەرزترین دەنگ: پلەدەنگی (سی - ماهور)

٨- نزمترین پلەدەنگی: (فا کاردیز - تەك حیجان)

٩- ژمارەی میانەی هەنگاوە دەنگییەکان(٢٦) هەنگاو

١٠ - ژمارەی میانەی بازدا ن: (یەك میانەی بازدانی تێدایە لەجۆری سیانی سێگای

١١- تێکڕای ژمارەی دەنگەکان: تێکڕای ژمارەی دەنگەکانی(مۆلایا صل) ٢٧دەنگ.

١٢- ژمارەی ڕستە ئاوازییەکان: (دوو ڕستە لە خۆدەگر یت)

١٣ - مەودای دەنگی ئاوازەکە:

١٤ - ڕەوتی ئاوازی ژمارە دوو لەپلەی فاکاردێز (تەك حیجان) تاکوپلەی(سی سروشتی - ماهور)

* ئاکامی شیکردنەوەی توێژینەوەکە :-

ئەنجامی شیکردنەوەی نموونەی ئاوازە هەڵبژێراوەکانی توێژینەوەکە بەم شێوەیە بوو

١ - میانەی دەنگەکان لە ئاوازو گۆرانییە ئایینیەکان لە تەکێی تاڵەبانی زیاتر بریتین لە میانە دەنگییە یەك بەدوای یەکەکان (هەنگاو)

٢- بەکارهێنانی زۆرینەی ریتم و کێشە کوردی و رۆژهەڵاتییەکانی وەکو ٢/٤، ٣/٤، ٤/٤، ٦/٤، ١٦/ ١٠

٣- بەکارهێنان و چڕینی زۆرینەی مەقام پەیڕەوڕۆژهەڵاتییەکان لەناو ئاوازەکانی تەکێی تاڵەبانی.

دەرهاویشتەی توێژینەوەکە بەپێی ئاکام وئەنجامی شیکردنەوەکە گەیشتینە دەرئەنجامی ئەم چەند ئەم خاڵە:

١ - ناساندن و ئاشنا بوون بە کۆمەڵێك لە دەنگبێژو مەقامبێژان لە شاری کەرکوك کە رۆڵی بەرچاویان هەیە لەهونەری گۆرانی و مەقام بەتایبەتی مۆزیك وگۆرانی ئایینی.

٢- ئاشنا بوون بە کۆمەڵێ تەرکیبەی ریتمی کە بەشێوەی نامۆ دەکەوێتە بەرگوێ نموونەی کێشی ١٢/٨ - ٨ /٩ .

٣- هەستکردن بە جیاوازی ئەدائی لە چەندین مەقامی سەرەکی و لاوەکی وەکو مەقامەکانی (سەبا، مەنسوری، راست، قەزاز، خەڵوەتی)

٤ - جیاوازی لەفەسڵەکانی زیکر لەنێوان تەکێی تاڵەبانی و تەکییەکانی تری کوردستان و عێراق.

* سەرچاوەکان بەزمانی کوردی:-


١- ئامێرەکانی مۆزیکی کوردی - وریا ئەحمەد ١٩٨٧

٢- مێژووی دەوڵەتی ماد ا. م دیاکانیف چاپکردنی لەلایەن دەزگای(جەمال عیرفان ٢٠١٣)

٣- مێژووی مۆزیکی کوردی حەمەی حەمە باقی ٢٠٠٩

٤- گۆرانی بێژە نەمرەکان- ئەندریۆس باکوری ٢٠٠١

٥- گەڵای پایز - بیرەوەرییەکانی عەلی مەردانە. ئامادەکردنی:عەبدولقادر عەلی مەردان - ٢٠٠٨

٦- کتێبی سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی، حەمەی حەمە باقی

٧- کەشکۆڵەکانم، وریا ئەحمەد ٢٠٠٩

٨-گەنجینەی مۆزیکی کوردی،عوسمان شارباژێری ١٩٨٥

٩- مەقام و مۆزیکی فۆلکلۆری کوردی، هەردەوێڵ کاکەیی ساڵی ٢٠٠٦


* سەرچاوەکان بەزمانی عەرەبی:-


١- تكية القادرية الطالبانية التصوفية في كركوك تأليف دكتور مكرم طالباني ٢٠٠٢

٢-الموسيقيون والمغنون خلال الفترة المظلمة -تأليف الحاج هاشم محمد الرجب ١٩٨٢

٣- ملامحمد توبال قارئ المقامات العراقية في كركوك ٢٠١٣ اربيل - وكتاب دراسة حول المقامات العراقية في كركوك من تأليف وجدي مصطفى محمد ٢٠١٠

٤- المقام العراقية تأليف الحاج هاشم محمد الرجب بغداد ١٩٦١

٥- اعلام المقام العراقي -كمال لطيف سالم بغداد ١٩٨٥

٦-اعلام ومفاهيم موسيقية - حبيب ظاهر العباس بغداد ٢٠١٠

٧- منهل المتسائل عن المؤسيقا واخبار الغناء في العراق د حبيب ظاهرالعباس بغداد ٢٠١٢

٨-كركوك موطن المقام العراقي الاصيل - صلاح شاكر بيرقدار - ٢٠١١

٩-الاوتار لصفى الدين الارموي - هاشم محمد الرجب - بيروت ١٩٨٠

١٠- نظريات وطرائق تحليل المؤسيقا- دكتور طارق حسون فريد ٢٠٠٥

١١- الاغاني لابي فرج الاصفهاني بيروت ١٩٥٥

١٢ - مجلة التراث الشعبي عدد الثامن ١٩٦٤

١٣- صفي الدين الارموي، د عادل البكري، بغداد ١٩٧٨

١٤- تاريخ المؤسيقا العربية، هنري جورج فارمر ١٩٤١

١٥- كركوك وتوابعها د. كمال مظهر، اربيل

١٦- المؤسيقا العربية، د. شهرزاد قاسم ١٩٨١

١٧- محيط الفنون

١٨ - مؤسيقا والحضارة

## بەشی دووەم

# مێژووی هونەری شانۆ لە کەرکوك

سەلاح شوکور
سمکۆ بەهرۆز
محەمەد سەید

داخەکەم ئەو زانیارییانەی کە هەیە دەربارەی هونەری شانۆ لەکەرکوك زۆر کەمەو کەم و کوڕی هەیە ((مێژووی شانۆ لەشاری کەرکوك تاکو ئەمڕۆ بەتەواوی ڕوون نەبۆتەوەو نازانرێت یەکەمین شانۆگەری لەچ ڕۆژو سالێکدا پێشکەش کراوە)).

بۆیە ئەو سەرچاوانەی کە لەبەردەستمانە سەرە دەزوویەکی ئەو قۆناغە مێژوویيەمان پێشکەش دەکات لەسەر ئەو شانۆگەرییانەی کە بەزمانی کوردیو عەرەبیو تورکمانی پێشکەش کراوە.

*** قاوەخانەکانی کەرکوك وەکو سەرەتایەکی شانۆ لەکەرکوکدا :**

شاری کەرکوك لە سەدەی نۆزدەهەمو سەرەتای سەدەی بیستدا، بایەخێکی زۆریان داوە بە ڕابواردنو گەشتو گوزارو خوێندنی مەقاماتو قۆریات، لە گەلێك جاردا بەیانیان لە مزگەوتەکانی کەرکوك پێش نوێژی بەیانی مەقامیان خوێندووەو بایەخیان بە کۆڕو کۆبوونەوەی خۆش خۆش داوەو هەر لە شەوێکی درەنگەوە ئامادەیی خۆیان بۆ ئەو کۆڕو کۆبوونەوانە نیشان داوە.

لە بیستەکانی سەدەی پێشوودا لە ناوچەی (خانی قازی) جۆرە ئێزگەیەکی ناوخۆیی پەیدا ببوو کە چەند بلندگۆیەکیان بۆ دانابوو لە شوێنێکی بەرزەوە بۆ ئەوەی خەلکی ناوچەکەی گوێی لێ بێت، کە ئەم جۆرە ئێزگانە تا چلەکانی هەمان سەدە بەردەوام بوو، کە بایەخیان دەدا بە گۆرانیو قسەی خۆشو هەلپەڕکێو شانۆگەری، کە بەشێکی زۆر لە کوردو تورکمانەکانی ئەو ناوچانە بەشدارییان تێدا دەکردو کاتێکی خۆشیان بەسەر دەبرد.

دیاردەی حیکایەت خوانی، هەتا سەرەتای سالانی چلەکانیش لەقاوەخانەکانی کەرکوك هەر مابوو، دیارترین ئەو کەسانەش کە لەو نێوەندەدا ناویان هەبووە (تۆپالْ مەلا محەمەدو مەلا ئەمینو مەلا شاکیرو مەلا بۆیاغو چەندین بوونە)، هەر بۆیە نوکتە دەگێڕنەوە دەلێن خاوەنی (جووت قاوەخانە) هەرکاتێ گوێبیستی ئەوە دەبوو کە حیکایەتی عەنتەری شەداد بەخۆشی کۆتایی دێ، بەسەر کەوتنی (عەنتەر)و مارە بڕینی (عەبلە)ی خۆشەویستی، ئەوە شیرینی بەسەر دانیشتوانی قاوەخانەکەدا دابەش دەکرد.

بەلام گەڕەکەکانی وەکو (بولاغ)و (جووت قاوە)و (خان قازی) بەهەوادارانی شانۆ بەناوبانگ بوون، لە بلندایيەکی بەرامبەر خانی قازی شانۆیەکیان دروست کردبوو، پەردەیەکیان بۆ کردبوو کە بەدەست دەکرایەوەو دادەکشا، لەوێ چەندین حیکایەتی فۆلکلۆرییان تێدا پێشکەش دەکرد، لە شێوەی گالتەجاڕی بە مەبەستی بە پێکەنین هێنانی جەماوەر، کە لەدەوری شانۆکەدا گرد دەبوونەوە بۆ ئەوەی ئەو بەرهەمانە ببینن کە لەو شانۆ ساکارەدا پێشکەش دەکرا لەزۆربەی کاتدا پشتیان بەنوکتەی سەر پێییو هەلوێستی گالتە جاڕانە دەبەست، زیاتر لەوەی پشت بەدەقێك ببەسترێت کە ڕەگەزەکانی هونەری شانۆی تێدا دەستە بەر بکرێت).

لەو ئەکتەرانەی کە بەشدارییان کردووە لە شانۆگەرییەکانی ئەو کاتە وەکو (مەولود توتنچی)و (خلە گزین)، بەلام ئەوەی جێگەی داخە تاوەکو ئێستاکە دەقێکی ئەو شانۆیانەمان بۆ بە جێ نەماوە تا ببێتە بەلگە دەربارەی شانۆ لەو کاتەدا.

*** ڕۆلی تەکیەی تالەبانی لە پێگەیاندنی هونەردا :**

تەکیەی تالەبانی هەر لەسەردەمانێکی زووداو هەر لە سەرەتای دامەزراندنیەوە جێگەیەکی گرنگی خوێندنی مەقاماتو حیکایەت خوانان بووەو، هەردەم جمەی هاتووە لەهونەرمەندانو هەوادارانی هونەر دۆستانو جێگەیەکی شیاوی هەبووە لەپێگەیاندنی کۆمەلێکی زۆر لەهونەرمەندانو هەردەم جێگەی حیکایەت خوانان بووەو گەلێك چیرۆكو سەربردە خوێندراوە چ لەئاستی مەقام یان لەسەر ئاستی تەمسیلیو خەلکێکی زۆر گوێیان گرتووەو گەلێك مەقام زان بەو ئەرکە هەلساون.

*** ئاهەنگی بەهاران و چەکەرەی تەمسیلی لەکەرکوکدا :**

خەڵکی لەکاتی بەهاران و نەورۆز چوونەتە دەشت و دەرو ئاهەنگیان گێڕاوەو کاتی خۆشیان بەسەر بردووە بۆیە دەبینی لەبەهاراندا ناوچەکانی دەوروبەری کەرکوك ڕازابووە بەم جۆرە ئاهەنگانەو لەو جۆرە شوێنانەدا پۆل - پۆل ئاهەنگو تەمسیلییان گێڕاوە و بەتایبەتی شانۆی (کاوەی ئاسنگەر) یەکێك بووە لەو تەمسیلییانەی کە لەو شوێنانەدا نمایش کراوە بەتایبەتی دەستەی فەقێیانی مزگەوتەکانی کەرکوك لەو ڕۆژگارانەدا جێ پەنجەیان دیار بووەو گردو دەشتاییەکانی دەوروبەری کەرکوك زمانحاڵی گێڕانەوەی ئەو ڕووداوانە بوونە.

*** یەکەم شانۆی تۆمار کراو:**

سەرەتای چالاکی شانۆ لەکەرکوك بەشێوەیەکی سەرەتایی لەقوتابخانەو یانەکاندا لەدوای شەڕی جیهانی یەکەم دەستی پێکرد، بەشێوەیەکی تایبەتی، ئەویش لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە مامۆستاکانی قوتابخانەکان هەڵدەستان بەپێگەیاندنی قوتابیان و ڕاهێنانیان لەشانۆ لەنێو قوتابخانەکان و ئامادەکردنی هەموو پێویستییەکانیان و پێشکەش کردنی شانۆکەو بەئامادەبوونی میوانێکی زۆر کە قوتابییەکان لەبەرامبەریان پێشکەشیان دەکرد.

کۆنترین دەقێکی شانۆیی کە پێمان گەیشتووە، ئەو دەقەیە کە لەژمارە (٥٢٢)ی ڕۆژنامەی (نجمة) بڵاوکراوەتەوە لە (١١)ی تەموزی ساڵی (١٩٢١)، کە لەلایەن قوتابخانەی (ظفر) نمایش کراوە.

ئەم شانۆیە چوار قوتابی دەوری لێ بینیوە، کە ناوی شانۆکەش دەربارەی (عومەری کوڕی خەتاب و بێوەژن)ە، ئەوەی باسکراوە، کە ئەم چوار قوتابییە دەورێکی باڵایان بینیوەو توانیان ئەوەی کە مەبەستیان بووە بیگەیەننە ئەنجام.

هەروەها ڕۆژنامەکە ئاماژە بەوە دەکات کە موتەسەڕف و پیاوە گەورەکان و سەرۆکی شارەوانی و زانایان و مامۆستایان و قوتابییەکی زۆر بەشدارییان تێدا کردووە، هەروەها ئاماژە بەوە دەکات سەرەتا بەخوێندنی قورئان ئاهەنگەکە دەستی پێکردووە.

بەم جۆرە باسی دەکات:-

((احتفال في مدرسة (الظفر)... ))

لقد ارتاح قلبي بالامس واستغرقت روحي في إنشراح ومسرة بمشاهدة (الحفل) حيث انفرجت أسارير وجهي.

ففي الساعة العاشرة مع آذان العشاء وبحضور سعادة (الباشا المتصرف) والاعيان حضرات البيكات، الاشراف والعلماء ورؤساء الطوائف الروحية ومديري المدارس من الهيئات التعليمية، وكل الافندية والطبقات المختلفة في (المنطقة) ومئات من الاهالي. لقد قدم طلاب المدرسة مشكورين حفلتهم بمناسبة (عيد المدرسة) الذى ابتدا بتلاوة من القرآن الكريم.

ثم قدم اربعة طلاب (التشخيص)، ((امير المؤمنين عمر بن الخطاب والارملة)) حيث كان لهم التاثير الكبير في الحاضرين اثناء (المشاهدة) الجديىء (خصوصا اثناء المكالمة) - يقصد الحوار - التى جرت بين عمر وعباس (رضى الله عنهما). وإن الطالب الذى - مثل - دور الارملة العجوز قد اتخذ انواع الوصيفات - والحركات - والنظرات - التعابير - المؤثرة حتى وصل الامر الى (البكاء) وخصوصا حين جلست الارملة على الارض وهي تصرخ (الجائعون.. جائعون..) ثلاث مرات، ادخلت الرعشة في نفوس المشاهدين. ان تلك اللحظات، وتلك الدقائق وهي اذ تمر، كانت جدا مؤثرة وحزينة، لقد تغيرت (الوجوه) وبدأت القلوب تدق، وسيطر على المشاهدين الصمت والسكون... لقد كان هذا (التصوير - العرض) في خمس عشرة دقيقة وقد انتهى بعبارة (تحيا العدالة).. حيث الختام.. !.

بەڵام دەربارەی دەرهێنان و نووسەرو توانای شێوەی شانۆکە هیچ زانیارییەکمان نییەو، نازانرێت تا چ ڕادەیەك، ئەو قۆناغەی پێکاوە کە بڵێین، ئاستی شانۆکە لەچ ئاستێکدا بووە، بەڵام دەتوانین بڵێین یەکەم دەقە کە ئاماژە بەو شانۆیە لەکەرکوك دەکات، بۆیە دەتوانین ئەمە بەیەکەم شانۆ دابنێین.

*** قۆناغەکانی بەرەو پێشچوون لەسەرهەڵدانی شانۆ لە کەرکوك:**

ئەو ماوەیەی کە لەبیستەکاندا ئاماژەمان پی کرد، بارە سیاسیەکەی ئەوکاتە دەورێکی باڵای نەبینی لەبەرەوپێش چوونی شانۆو ئاسوودە نەبوونی هەموو ناوچەکە لەوە زیاترهەنگاوی بەرەوپێش نەبینی. چونکە گۆڕینی ماوەی بارە سیاسیەکە لەنێوان ڕۆیشتنی یان ڕووخاندنی دەوڵەتی عوسمانی و هاتنی ئینگلیزەکان و دامەزراندنی حکومەتی پاشایەتی لە عێراقدا، بارێکی ئاسوودەی نەخوڵقاند کە بتوانێت شانۆ گەلێك لایەنی تری باری پێویست بۆ خۆی بەدەست بهێنێت بۆیە لەوە زیاتر گەشەی بەخۆیەوە نەدیت.

بەڵام ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٣٠ - ١٩٤٠) یان بەمانایەکی تر ماوەی نێوان سییەکان و چلەکانی ئەو سەدەیە گەشەکردنێکی گەورەی بەخۆیەوە بینی و توانی وابکات کە قۆناغەکانی شانۆ هەنگاوی بەپێز بنێت.

ئەگەر سەرنج بدەین لەو ماوەیەدا چەند خاڵێك گەڵاڵە دەبێت لامان:

١. سەیر کردنی شانۆ (تەمسیل) وەکو پێویستییەکی پەروەردەیی لەقوتابخانەکاندا پەیڕەو دەکرا لەبەر ئەوە مامۆستاو پەروەردکاران هەڵیان دەدا کە بایەخ بەم لایەنە بدەن و هەوڵ بەرچاوی بۆ تەرخان بکەن و قوتابیانی لەسەر ڕابهێنن.

٢. بایەخ دان بەبابەتی پەروەردەیی و ئەخلاقی تا بەوەی لەگەڵ ڕێڕەوی پەروەردەو پێگەیاندنی قوتابیدا بگونجێت.

٣. بایەخ دان بەدەقی تەمسیلی کورت و سەرنجڕاکێش تا بەوەی کە قوتابیان هەست بەبێزاری نەکەن لەبینین و گوێ گرتنیدا.

٤. بڵاوبوونەوەی سینەماو یانەو ڕێکخراوە پیشەییەکان دەورێکی گەورەیان بینی لەگەشە کردنی تەمسیلی و

بڵاوبوونەوەی دەقە شانۆییەکان لە ئاهەنگەکاندا لە دەرەوەی قوتابخانەکاندا.

٥. بڵاوبوونەوەی دەقی شانۆیی بەزمانی نەتەوەکانی کەرکوك وەکو دەق بەزمانی عەرەبی و تورکمانی و کوردی.

ئەوەی دەبینین لەو ماوەیەدا گەڕۆکێکی زۆر لەتیپی شانۆیی سەردانی کەرکوك و شارەکانیان کردووە و شانۆیان لەو شارەدا پێشکەش کردووە، بەتایبەتی تیپی شانۆی (حەقی شبلی) لە کۆتایی بیستەکان و سەرەتای سییەکاندا، کە لەو ماوەیەدا ئەم تیپانە دەورێکی کاریگەرییان بینیوە لەهەستی بینەرداو گەلێك لەو ئەکتەرانەی دەورییان هەبووە لەو ماوەیەدا وەکو (زوهدی عەلی – زوهدیە درێژ، موسا زەکی مستەفا، فاتیح شاکر سەعاتچی).

یەکێك لەو تەمسیلییانەی کە پێشکەش کراوە تەمسیلی (سوڵتان عەبدولحەمید) بوو لە تەمموزی ١٩٣٠ لە ئوتێل (ئەحمەد پالاس) کە زوهدی درێژ بەشداری کردبوو تێدا، هەروەها زوهدی عەلی ئەوە دەگێڕێتەوە کە (حەقی شبلی) ناسیوە لە (کفری)و گەلێك هونەرمەند هەبووە لەگەڵیدا لەوانە (موسا زەکی مستەفا).

لەنێوان ساڵانی (١٩٣٤-١٩٣٥)و (١٩٣٧-١٩٣٨) کۆمەڵێك شانۆ پێشکەش کراوە لەوانە (الجندي الباسل)، (ماجدولين)، (سرخوشم ئامان)، (شاعیر)ی مەنفەلوتی، شانۆ لەم ماوەیە بەکۆمەڵ بەرهەم دەهێنراو تایبەتمەندی نەبووە لەنێوان ئەندامەکانی و هەریەکەی بەکۆمەڵێك کار هەستاوە لە بەئەنجام دانی شانۆکەدا.

هەروەها لەم ماوەیەدا کۆمەڵێك ئەکتەر دەوری باشیان بینیوە لە شانۆ، وەکو (ئەحمەد عەبدوڵڵا، ئەزەل هادی، ڕوفائیل حەنا، ئەشئەت عەبدوڵڵا، فاتیح شاکر سەعاتچی، ڕەحمەتوڵڵا بەیاتی).

بۆ نموونە شانۆگەی (شاعیر) کە لە نووسینی (لوتفی مەنفەلوتی) بوو لەسەر شانۆی هۆڵی سینەما غازی پێشکەش کراوە کە ڕۆڵی هەر یەکێکیان بەم شێوەیە بووە:

- ڕوفائیل حەنا لە ڕۆڵی (سیرانو).
- ڕەحمەتوڵڵا بەیاتی لە ڕۆڵی (کۆنت دی جێش).
- ڕەفعەت لە ڕۆڵی (رۆکسانا).
- موسا زەکی مستەفا لە ڕۆڵی یەکێك لە خانەوادەکان.
- زوهدی عەلی ئامادەکاری شانۆکە.

*** قوتابخانەی (مرکزی) سەرەتایی و شانۆ لەکەرکوکدا:**

لەم قوتابخانەیەدا شانۆ گەشەی کردووەو شوێنێکی بەرچاوی هەبووە، کە تەنها هەر لەلایەن دەستەی پەروەردکارانی قوتابخانەکەوە نەبووە بەڵکو لەدەرەوەی قوتابخانەکەش کەسان هەبوو یارمەتی بەرهەم هێنانی شانۆیان داوە بۆ پێشکەشکردنی.

ئەوە جێگەی سەرنجە لەو ماوەیەدا ئەوەیە کە بێجگە لە مامۆستایانی قوتابخانەکە هەندێك لەوانەی کە خۆشەویستییان هەبوو بۆ شانۆ بەشدارییان لە شانۆ کردووە بۆ قوتابخانەکان، وەکو (مولازم بەسری، زوهدی عەلی) کە هەردووکیان لە بواری پۆلیسیدا کاریان دەکرد، بەڵام خۆشەویستیان بۆ شانۆ لە قوتابخانەکان بەشدارییان دەکرد.

شانۆگەری (رسالة الى الله) یەکێك لە شانۆگارییەکانی سەر شانۆی ئامادییەکان

*** سەرەتاکانی شانۆ لە چەمچەماڵ:**

هەروەها سەرچاوەکان ئەوە دەردەخەنە ڕوو کە لە سییەکاندا لە چەمچەماڵ شانۆ هەبووە، مامۆستا محەمەد سابیر ئاوا دەگێڕێتەوە:-

"وەکو ئەوەی کە بیستوومە لە پێش ئێمەدا (بێکەس)ی شاعیر هەروەك مێژووی دانانی هەندێك لە هۆنراوەکانیدا دەردەکەوێت کە لەسییەکاندا لەم قوتابخانەیەدا مامۆستا بووەو قوتابیانی چەمچەماڵی بەگیانی کوردانە پەروەردە دەکرد.. هەروا بیستوومە کە لەو ساڵانەی لەوێ بوو، منداڵانی هانداوەو ڕایانی هێناوە لەسەر تەمسیلی کردن کە وەکو بزانم لەنێوان ساڵانی (١٩٣٠-١٩٣٥)دا بووە".

*** هونەری شانۆ لە چلەکان لەکەرکوکدا:**

ئەو ماوەیە بەتایبەتی دوای شەڕی جیهانی دووەم، گەلێك دەقی شانۆیی پێشکەش کرا کە گەلێکی ئەو دەقانەیان نووسراوە یان چاپکراوە لە چلەکاندا بایەخدان بە دەق و دەرنەچوون لێی کارێکی پێویست بوو، هەرچەندەش باری سیاسیی و ئابووری وڵات و نەبوونی هۆڵی شانۆ گیروگرفت بوو، بەڵام شانۆ هەرگەشەی کردو هەنگاوی خۆی نا بەرەو چەسپاندن و سەرهەڵدانی.

یەکێك لەو ئاستەنگانەی ئەو کاتە نەبوونی هۆڵی شانۆ بووە، ئەوەی کە هەبوو بریتی بوو لەهۆڵی قوتابخانەکان و شانۆی هاوینەیی و یانەو کۆمەڵەو ڕێکخراوەکان بوو.

بەرپرسەکانی ئەو کاتە هەوڵی پشتگیری و بانگەوازی شانۆیان نەداو شانۆیان بەلایەکی ڕابواردن دادەنا، لایەکی تریش کۆمەڵگە باوەڕی بەشانۆ کۆمەڵگەی ئەو کاتە ڕێگەی پێ نەدەدا.

ئەوەی لەو ماوەیەدا پێشکەش کرا تەمسیلی (اقدار)ی (سەلیم بەگی) بوو، تەمسیلی (عفان)، نووسینی (عبدولقادر خلوسی کفری) بوو.

ئەو لاوانەی کە لەچلەکان بەشدارییان کرد بریتی بوون لە (محەمەد تاهیر تۆفیق، حەقی شبلی هورمزی، محەمەد زەکی، ناسر ئیستیفان، عەدنان ناجی هورمزی، عەلی ئاق چای، حەمە ڕەشید حەمە عەلی، محەمەد نوری تۆفیق، حەمە سالح ڕەشید، ئەبو بەکر هەوری، حەمەلاو بەرزنجی، عەبدولقادر محەمەد بابان، ڕوفائیل حەنا، مولازم بەسری، تەلعەت سەیید شاکر، ئەنوەر حەنا شابۆ).

بۆ نموونە شانۆگەری (اقدار) کە پێشکەش کرا لەکۆتایی چلەکان و سەرەتای پەنجاکان لە دەرهێنانی (موسا زەکی مستەفا) بوو، کە لە یانەی ئاسوورییەکان پێشکەش کرا لە بەرژەوەندی قوتابییە هەژارەکان).

شانۆگەری (فلوس الدوه)

عیسمەت هورمزی

شانۆی (فلوس الدوه) لەلایەن نووسەر (وەحیددین بەهائەددین)ەوە ئاماژەی پێ کراووە، کە لە گۆڤاری (الاخاء) لە ژمارە (١٩١)دا بڵاوبووەتەوە ڕۆڵی هەر یەکێکیان بەم شێوەیە بووە:

– نووسینی (سەلیم بەتی).

– دەرهێنانی (مولازم بەسری).

– ئەکتەرەکان (حەقی جەمیل هورمزی، تۆفیق نەعوم، محەمەد زەکی، عەزیز غەفور) لەگەڵ بەشداری کۆمەڵێك لە قوتابیانی قوتابخانەی (مرکزی).

شانۆگەری (تورشچی) کە ڕۆڵی هەر یەکێکیان بەم شێوەیە بووە:

– دەرهێنانی (موسا زەکی مستەفا).

– ئەکتەرەکان (محەمەد زەکی، عەلی ئاق چای، عەدنان ناجی هورمزی، ناسر نیستیفان).

مامۆستا (محەمەد سابیر) دەگێڕێتەوە:–

"لەنێوان سالآنی (١٩٤٢ – ١٩٤٣)ێ بوو تەمسیلییەکی کۆمیدیمان لە قوتابخانەی سەرەتایی چەمچەماڵ پێشکەش کرد کە من (محەمەد سابیر)و حەمە ڕەشید حەمە عەلی و حەمە نوری تۆفیق و حەمە سالح ڕەشید، بەشداریمان تێدا کرد، کە من لەدەوری (بارام بەگ) بوو، حەمە ڕەشید حەمە عەلی لەدەوری (کچ) بوو بەڵام ناوی تەمسیلییەکەو دەرهێنەرەکەی نازانم".

بەڵام سەید هاشم سەید لە کتێبەکەی (چەمچەماڵ لە یادەوەریمدا) لە لاپەڕە (٨٥) ئاوا باسی شانۆ دەکات:

"یەکەمین چیرۆکی تەمسیلی لەلایەن قوتابیانی قوتابخانەی چەمچەماڵدا، لەساڵی ١٩٤٧ لەسەر شانۆیەکی دەستکرد پیشان درا ئەویش چیرۆکی (دڵداری پەیمان پەروەر) بوو، کە لە نووسینی خوالێخۆشبوو (ئەبو بەکری هەوری)و دەرهێنانی هەردوو مامۆستای خوالێخۆشبوو حەمەلاو بەرزنجی و عەبدولقادر محەمەد بابان بوو"، دووبارە ئەم شانۆگەرییە لە ساڵی (١٩٥٥) لە چەمچەماڵ نمایش کراوەتەوە.

بەڵام بە بۆچوونی خۆم، ساڵی ١٩٤٧ ساڵی یەکەم تەمسیلی نییە لە چەمچەماڵ بەڵکو بۆ سییەکان دەگەڕێتەوەو تاکو ئێستا بەڵگەی پێویستمان پێ نەگەیشتووە.

هەروەکو بەپێی بەڵگەکان ئەوە دەخەنە ڕوو شانۆ لە هەموو شارو شارۆچکەکانی کەرکوك نمایش کراوەو زیاتر قوتابخانەکان دەوریان هەبووە لە نمایش کردنیدا.

لە ساڵی (١٩٤٨) شانۆگەری (نوشتەو جادو)و (پەیمانی پۆرتسموس) لە چەمچەماڵ نمایش کرا.

*** زۆرخانەکانی کەرکوك و دەوریان لە پێگەیاندنی شانۆدا:**

گەلێك لەسەرچاوەکان باس ئەوە دەکەن کە گوایە کەرکوك بەناوبانگ بووە بەبڵاوبوونەوەی (زۆرخانە)و لەگەلێك شوێنی ئەم شارەدا بڵاو بۆتەوە.

زۆرخانەکان بریتی بووە لەچاڵێکی گەورە ٤م$^{2}$ بە قوڵی ١,٥م دەوری (٦–٧) کەسی دەگرت و بەشێوەیەکی بازنەیی دروست دەکرا، خەڵکی لەچوار دەوری گرد دەبوونەوەو سەیریان دەکرد.

ئەو پاڵەوانانەی لەو کاتەدا هەبوون لەزۆرخانەکان بریتی بوون لە: (شوکر پاڵەوان، فەخری نوسرەت، جەعاو قەساب، قەرە عوسمان، مەهدی پاڵەوان، هادی پاڵەوان، حاجی عومەر پاڵەوان، مەلا عەبدوڵڵا)و گەلێکی تر.

یەکێك دومبەڵەکێکی گەورەی لەمل بوو پێش هاتنی خەڵك بەفارسی مەقامی (سێگای) دەخوێن لەگەڵ (چوارگا)، هەرکەسێك بهاتایە پای پەتی دەکرد.

ئەوەی دەبینین لەزۆرخانەکان لەکەرکوکدا خەڵکێکی زۆری لەخۆی کۆ دەکردەوە لەسەر شێوازێکی دەقی شانۆیی کارەکان بەڕێوە دەچوو ئەویش لە زۆران و ململانێ و گۆرانی و تەمسیل کردنی شێوازی بەڕێوەچوونی کارەکانی زۆرخانە.

*** بڵاوبوونەوەی هونەری شانۆ لە پەنجاکاندا لە کەرکوك:**

دەتوانین بڵێین ماوەی پەنجاکان، ماوەی ڕاوەستان و نووچدانی شانۆ بووە کە هەر لە ناوەڕاستی چلەکانەوە بەردەوامی هەبووەو لەسەرەتای پەنجاکان دەرکەوتنی بەدیارکەوت، ئەویش لەبەر هۆکاری ئەو بارە سیاسییەی ئەو کاتەی عێراق کە خۆی دەبینییەوە لە هەموو بوارەکانی ژیان بە تایبەتی لە بواری هونەرو شانۆ.

ئەم کاریگەرییە بە شێوەیەکی ئەوتۆ دەرکەوت کە ئەو ئەکتەرە کۆنانەی لە بواری شانۆدا کارییان دەکرد کەوتنە بەر ئەو کارتێکردنە، ئەویش خۆی دەبینییەوە لە سەرهەڵدانی چینێکی نوێ لە لاوانی شانۆ کە پاڵپشتێکی گەورە بوون بۆ پێشکەوتنی شانۆ لە هەموو بوارەکاندا.

ئەوەی ئەم ماوەیەی پێ دەناسرێتەوە، سەرهەڵدانی

کۆمەڵێك کتێبی شانۆیی چاپکرا بوو، کە دەوری بینی لە پێشخستنی هونەری شانۆییدا، لە پاڵ ڕووماڵکردنی گۆڤارو ڕۆژنامەکان بە هەواڵە هونەریو شانۆییەکان دەوری بینی لە دەرخستنی هونەری شانۆییدا، لە پاڵ ئەمانەشدا سەرهەڵدانی ڕەخنەو ڕەخنەسازی شانۆیی دەوری بینی لە پێگەیشتنی هونەری شانۆ لە عێراق، بە تایبەتی لە ڕۆژنامەی (بشیر)و (الزمان)و گۆڤاری (قرندل) دەوریان بینی لە پێگەیاندنی ڕەخنەسازی شانۆدا.

هەر لەم ماوەیەدا بوو بە سەرهەڵدانی کۆمەڵێك تیپی شانۆیی ئەزمونگەریو بە کۆمەڵێك ئەندامو ئەکتەری شانۆیی تەواوبوو لە هەموو بوارێکدا، بە تایبەتی ئەو تیپیە شانۆییانەی کە لە بەغدادا سەریان هەڵدا کاریگەرییان بەسەر شارێکی وەکو کەرکوك بە جێما.

هەر لەم ماوەیەدا بایەخدان بە دیکۆمێنتکردنی شانۆو نووسینەوەی شانۆگەرییەکانو ئەکتەرو ناوی تیپەکان بەڵگەیەکی مێژوویی گرنگ بوون لە پێگەیاندنی کارە هونەرییەکانی شانۆ.

لە ساڵی (١٩٥٤) چیرۆکنووسو نووسەری شانۆیی (جەلیل قەیسی) هەستا بە نووسینی شانۆیەك بە زمانی ئینگلیزی بە ناونیشانی (هونەرمەند) کە هەر یەکە لە (عیسمەت نەجات هورمزی، جەلیل قەیسی) دەوریان تێدا بینی، شانۆکە لە یەکێك لە ژووریماڵەکەی جەلیل قەیسی پێشکەش کرا بە ئامادەبوونی قەحتان هورمزیو یوسف حەیدەری، کە دەتوانین بڵێین ئەم شانۆیەی بە شانۆی ڕاستیو ئەکادیمی ئەو ماوەیە دادەنرێت لە کەرکوکدا، کە هەنگاو بوو بۆ ئەوەی تیپی شانۆیی سەرهەڵبدات.

ئەوەی جێگەی ئاماژە پێکردنە ئەم کەسایەتیانەی لەسەرەوە باسمان کرد پێش ئەم مێژووە گەلێك تیپی شانۆییان دامەزراندووە، لە ساڵی (١٩٥٢) هەر یەکە لە (عیسمەت هورمزی، عەلی ئەلسعیدی) تیپی (المسرح الشعبي)یان دامەزراندووە، لە ساڵی (١٩٥٦) تیپی (مسرح كركوك الفني للتمثيل)یان دامەزراندووە بە یارمەتی (ئاتیق تانی، بەکر ئیسماعیل، ئەشئەت زەییا).

لە ساڵی (١٩٥٧) هەر یەکە لە (عیسمەت نەجاتی، ئەنوەر محەمەد ڕەمەزان، خەلیل ئەحمەد ئەلحەسەنی، ئایدن شاکر، کەمال تاهیر خانچی) تیپی (المسرح الفني)یان دامەزراند.

لەو ماوەیەدا شانۆگەرییەکانی هونەرمەندی گەورە (یوسف ئەلعانی) لە گەلێك لە شانۆکانی کەرکوکدا لەلایەن تیپەکانی هونەری شانۆی لەناو شارەکە پێشکەش کراوە، وەکو شانۆی (راس الشليله)، (فلوس الدوه)، (تؤمر بيك) لە پاڵ پێشکەشکردنی گەلێك شانۆی نووسەرە بیانیو جیهانییەکان، وەکو (ئەنتۆن تشیخۆف)، (شکسپیر)و گەلێکی تر.

لەم ماوەیەدا گەلێك شانۆ پێشکەش کرا لەم شارەدا چ وەکو دەقی تورکمانی یان وەکو دەقی کوردی کە هەر لەنێوان ساڵانی (١٩٥٠-١٩٦٠) بەردەوام بووە.

لەنێوان ساڵانی (١٩٤٩-١٩٥٠) ئەم تەمسیلییانە پێشکەش کرا:

– تەمسیلی (مێش کوڕی مەگەن) لە قوتابخانەی (ئیمام قاسم) ئەکتەرەکانی بریتی بوون لە (مەکی عەبدوڵڵا، جەمال شێخ نورەدین، چالاك شێخ حەسیب تاڵەبانی).

– تەمسیلی (دەروێش) لە قوتابخانەی (ئیمام قاسم)، لە ساڵی ١٩٥٠.

مامۆستا سەلاحەددین لە باسکردنی شانۆ لەساڵی ١٩٥٠ ئاوا باسی دەکات:–

"من کە قوتابی بووم لە قوتابخانەی ئیمام قاسم، لە ساڵی ١٩٥٠ دوو تەمسیلیمان لەو ساڵەدا پێشکەش کرد، کە مامۆستایەکی مەسیحیمان هەبوو بەناوی (ئیستیفان ئەفەندی)، مامۆستای وەرزشو ئینگلیزی بوو کە ئێمەی ڕادەهێناو مەشقی پێمان دەکرد.

یەکێك لەتەمسیلییەکان بەناوی (ژنی زۆردار) بوو، کە یەکێك لەوانەی دەوری دەبینی (مەکی عەلی) بوو لەدەوری ژن، ئەوەی جێگەی سەر سووڕمان بوو، پیاوەکە لەدەقە شانۆییەکە دەرچوو، هەتا توانی زللەیەکی لە ژنەکە دا، مامۆستا (ئیستیفان) وتی بۆ واتکرد، ئەویش لەوەڵامدا وتی لەبەر ئەوەی ژنی زمان درێژ دەبێت پیاوی لێی بدات".

هەر لەهەمان ساڵدا تەمسیلی (وێنەگر) پێشکەش کرا لەلایەن هەمان قوتابخانەو هەمان مامۆستادا، تەمسیلییەکی کۆمیدی بوو، ئەوانەی دەوریان بینی (حوسێن ناسح)و (مەکی عەلی)و قوتابییەکی خەڵکی کۆیە، هەردوو تەمسیلییەکە بەزمانی کوردی بووە، هەردوو تەمسیلییەکە لەناوەندی کەرکوکیش نمایش کرا.

– لەساڵی (١٩٥٢)دا بەڕێز نوری فەقێ ئاوا باسی تەمسیلی دەکات:–

"لە چایخانەی چوار باخ لەساڵی ١٩٥٢ تەمسیلییەکی کۆمیدیمان نمایش کرد، کە هەریەکە لە جەلال سەعیدو عەبدولحەمیدو نوری فەقێ دەوریان تێدابینی، خەڵکێکی زۆر هاتە بینینی، کە لەشوێن گەراجی ئێستای سولەیمانی بوو".

– لەساڵی (١٩٥٣)دا:–

لە هۆڵی ئامادەیی کەرکوك شانۆگەری (بووكو زاوا) پێشکەش کرا کە لەنووسینو دەرهێنانی (عەونی سەید کاکە) بوو، چوار کەس بەشدارییان لەم شانۆگەرییە کرد بوو، محەمەد عەبدولڕحمان زەنگەنە، لە دەوری قازی، حەسەن ڕەشید (لەدەوری زاوا)، بورهان نوری (لەدەوری بووك)، چەند شانۆگەرییەکی تریش پێشکەش کراوە لەوانە شانۆگەری ((نۆمەری داد پەروەر)).

لەنێوان ساڵانی (١٩٥٢-١٩٥٣)دا چیرۆکی شانۆیی (نۆمەری دادپەروەر) پێشکەش کرا لە دەوری پاشا (محەمەد عەبدولڕەحمان زەنگەنە)، لە دەوری پیرێژن (هیدایەت خالید).

هەر لە هەمان ساڵدا لەلایەن تیپی (مەشخەڵ) شانۆی (کۆتایی دەرەبەگ) پێشکەش کرا: لە دەوری ئاغا (ئازاد مستەفا)، لە دەوری پیاوی ئاغا (فەخرەددین محەمەد کەریم)، هەروەها ئەم ئەکتەرانەش بەشدارییان کردووە (غالیب ڕەشید کاکەیی، شەمسەدین نەسرەدین کاکەیی، محەمەد عەبدولڕەحمان زەنگەنە) لەگەڵ چەند ئەکتەرێکی تر.

لە هەمان ساڵدا شانۆگەری (شۆڕشی نەورۆز) پێشکەش کرا، ئەکتەرەکانی بریتی بوون لە: (غەفور عوزێری، محەمەد عەبدولڕەحمان زەنگەنە، ئەبو بەکر سدیق، فەهمی کاکەیی، نیعمەت خەیات، فەخرەدین محەمەد کەریم، جەژنی عیزەدین، عەبدوڵڵا پشدەری، عەبدولڕەحمان پشدەری، شوکریە ڕەسوڵ، پەروین عەبدولقادر، نەجیبە عەبدولقادر، شەمسەدین نەسرەدین، غالیب کاکەیی، غەریب نانەوا).

– شانۆگەری (کچە لاڵەکە): لە دەوری باوك (محەمەد عەبدولڕەحمان زەنگەنە) لە دەوری کچە لاڵەکە (پەروین عەبدولقادر)، هەر یەکە لە (فازڵ جاف)و (جەلیل زەنگەنە) بەشدارییان کردووە.

– لەساڵی (١٩٥٦)دا تەمسیلی (ئینتخابات)، بەزمانی کوردی لە قوتابخانەی ئیمام قاسم، کە مامۆستا (جەمال ساڵح) قوتابییەکانی ڕاهێنا لەشانۆکە، ئەکتەرەکانی بریتی بووە لەڕەمەزان زامدار، بورهان عەبدولڕەحمان، سەلاح ناوێك.

هونەرمەند (عەلی کەریم) دەربارەی سەرەتاکانی مێژووی شانۆی دەڵێت:

"ئەگەر بمانەوێ باسی بزوتنەوی شانۆی کوردی بکەین لەشاری کەرکوك ئەتوانین بیکەین بە سێ قۆناغەوە:

قۆناغی یەکەم قۆناغی سەردەمی پاشایەتیە بەپێی ئە زانیاریانەی کەمن دەستم کەوتوون لەو دەمە شانۆگەری پێشکەش کراوە ڕێك لە ساڵی ١٩٥٧ لە یادی جەژنی نەورۆزدا لە یاریگای تۆپی پێی کۆمپانیایی نەوتی باکوور لەکەرکوك، لەوێ کۆمەڵێ گەنجی خوێن گەرمو نیشتیمان پەروەر هەوڵیان داوە نمایشێکی شانۆیی پێشکەش بکەن بەو خەڵکەی کە هاتوون بۆ ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی جەژنی نەورۆزەوە، ئەگەر بەهەڵە نەچووبم ئەوەی کە بەکارەکە هەڵسا ناوی (جیهان سدیق شاوەیس)بوو؛ ئەو کۆمەڵە گەنجەی لەکاتی پێشکەش کردنی نمایشەکەیان پۆلیس ئەدا بەسەریانو ناهێڵێ بەشداری ئاهەنگەکە بکەنو نمایشەکە قەدەغە دەکەن".

* پێشکەشکردنی شانۆی منداڵان بەزمانی ئینگلیزی؛

لەو ماوەیەی پەنجاکاندا وەکو زیاتر بۆی بچم لەنێوان (١٩٥٣-١٩٥٤)دا لەکۆمپانیای نەوتی کەرکوك شانۆگەرییەکی منالاّن بەزمانی ئینگلیزی پێشکەش کراوە بەناونیشانی (العندليب) لەسەر شانۆی کۆمپانیاکە.

بەلاّم ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێت کە ئەم شانۆگەرییە لەسەر ئاستێکی چاكو لەتوانایەکی بەرزی دیکۆرو دەقو جلوبەرگدا نمایش کراوە کە نمونەی لەم جۆرە لەکەرکوکدا کەم بووە کە لەلایەن قوتابیانی قوتابخانەی ئینگلیزی ئەو کاتەوە نمایش کراوە.

بەلاّم دەربارەی دەرهێنەرو ئەکتەرەکانی هیچ زانیارییەکم لا نییە تا بەڕوونی شیبکەمەوەو ئاستی تەواوی شانۆگەرییەکە تاوتوێ بکەم.

چیرۆکێکی شانۆی منداڵان بە زمانی ئینگلیزی لە پەنجاکان لە کۆمپانیای نەوتی کەرکوك

*** شانۆی قوتابیانی (کوێت) و (کەرکوك):**

– لە ساڵی (١٩٥٧)دا هەندێك قوتابیانی (کوێت) هاتن بۆ کەرکوك، قوتابییەکانی قوتابخانەی ناوەندی کەرکوك، لەکاتی بەڕێوەبەرایەتی مامۆستا (فاتیح محەمەد بەگ) دا، پێشوازییان کردن‌و شانۆگەرییەکیان پێشکەش کردن بەناوی (گەشتەوان–السائح) بەزمانی کوردی کە جێی ڕەزامەندی هەموو لایەك بوو، بەڵام دوایی کە ویسترا درێژە بەپێشکەش کردنی شانۆگەرییەکە بدەن، میری لێی قەدەغە کردن‌و هەڵیان کوتایە سەریان‌و هەندێکیشیان لێگیراو دام‌و دەزگاشیان داگیر کرا.

*** شانۆی تورکمانی لە پەنجاکان:**

– هەر لە هەمان کاتدا لەپەنجاکان قۆناغێکی نوێ لە شانۆی تورکمانی دەستی پێکرد، ئەوەتا ڕۆژنامەی (ئەلبەشیر) کە بەهەردوو زمانی عەرەبی‌و تورکمانی دەردەچوو دەڵێ: "لە (٢٢)ی ئەیلولی ١٩٥٨ تاوەکو ١٧ی ئاداری ١٩٥٩، ١٥ شانۆگەری لەو شارەدا پێشکەش کراوەو هەندێك چالاکییان لەبەغداش نواندووە".

شانۆگەرییەکانی یوسف ئەلعانی وەکو پارەی دەرمان‌و ئەمر دەکەی بەگم‌و چەند شانۆگەرییەکی تر دوای پێشکەش کردنیان بەزمانی عەرەبی وەرگێڕدراونەتەوە سەر زمانی تورکمانی، ئەوەبوو لەو کاتەدا هونەرمەند عیسمەت هورمزی، بۆ یەکەمجار تیپێکی شانۆی تورکمانی دامەزراند بەهاوکاری هونەرمەندان: (ئەنوەر محەمەد ڕەمەزان‌و ئەحمەد خەلیل حوسنی‌و ئایدن شاکر)، ئەوەبوو ئەو تیپە لەماوەیەکی کورتدا سەرکەوتنێکی چاکی بەدەستهێنا، بەتایبەت لەو شانۆگەرییە جیهانیانەی کە وەرگێڕدرابوونە سەر زمانی تورکمانی، لەوانەش (یا ئیشقدە یا قرانلقدا) و چەند شانۆگەرییەکی تر کە هەر هەموویان لەدەرهێنانی هونەرمەند (عیسمەت هورمزی) بوون.

*** شانۆی قوتابخانەی ئاسوورییەکان:**

مامۆستا باکووری لە یاداشتەکانیدا ئاوها باسی شانۆ دەکات لە قوتابخانە:

"لە قوتابخانەی سەرەتایی ئاشووری ئەهلی چەندین چالاکی هونەریم پێشکەش کردو خەڵکی کەرکوك‌و ئاسوورییەکان بە تایبەتی زۆر ڕێزیان لێم گرت‌و دەستەی بەڕێوەبەرایەتیش یارمەتییان ئەدام بۆ دابینکردنی پێویستییەکان.

لەو چالاکییە شانۆییانە چیرۆکێکی تەمسیلی بوو بە زمانی ئەدەبی عەرەبی بە ناوی (شمعدان القس) کە لە چیرۆکەکەی نووسەری بەناوبانگی فەرەنسیم وەرگرت کە بەناوی (البؤساء)ی (ڤیکتۆر هیگۆ)، من ئەو فەسڵەی پێوەندی هەبوو بە پەنابردنی (جان ڤالجان)ی پاڵەوانی چیرۆکەکە بۆ ماڵی قەشەکەو دوای ئەوەی کە قەشە بە خۆی

شانۆگەری (گازنۆی پشیلەی ڕەش) بە زمانی ئاسووری

شانۆگەری (ڕوحی دایك) بە زمانی ئاسووری

بە خوشکییەوە خزمەتی دەکەن‌و خواردنی دەدەنێ، چونکە چەند ڕۆژ بوو لە بەندیخانە هەڵاتبوو‌و برسی بوو، هەروەها جێگای نووستنی بۆ دابین دەکەن لە ماڵەکەیان. بەڵام ئەو کابرایە بەیانی زوو هەڵدەستێ پێش ئەوەی خاوەن ماڵ ئاگایان لێی بێ، شەمعەدانێك دەدزێ‌و دەڕواتە دەرەوە. کە چی، پۆلیس دەیگرن‌و دوای سۆراخ پێیان دەڵێ لە ماڵی فلان قەشەی دزیوە.

پۆلیس دەیهێنن بۆ لای قەشەکە، کە چی ئەو نایەوێ ئازاری بدەن‌و بیبەنەوە بەندیخانە، پێیان دەڵـێ: نەخێر نەیدزیوە، من دامێ بچێ بۆ خۆی بیفرۆشێ‌و چەند ڕۆژێ بەو پارەیە بژێت.

ئەو تەمسیلەم ئامادە کردو ڕۆڵەکان (دەورەکان)م دابەشی سەر قوتابییەکان کرد: یەك لەوان (ماری) کچی مامۆستای رابـی جبرائیل بـوو کـە دەوری خوشکی قـەشـەم دا پێی، کچێکی تر کە هەر لە پۆلی ماری‌و ڕەفیقی بوو، ڕۆڵێکی ترم دا پێی، ناوی (ئەرپێنەك) بوو، ئەم شانۆگەرییە لە ئاهەنگی سەری ساڵی قوتابخانەدا لەگەڵ هەندێ گۆرانی‌و سەمای تر کە هەمووی من ئامادەم کردبوون، لەو ئاهەنگە پێشکەش کران بۆ دایك‌و باوك‌و خزم‌و کەسی قوتابیان‌و مامۆستاکان کە لە ئاهەنگی (تخرج)ی منالەکانیان ئامادەبوون.

هەروەها چیرۆکێکی تەمسیلی عەرەبیمان تەقدیم کرد بۆ دانیشتوانی شـاری کـەرکوك‌و لـە هـۆڵی قوتابخانەی ئامادەیی کەرکوك‌و لەسەر شانۆی هۆڵەکە بۆ مـاوەی سێ ڕۆژان نمایشمان کـرد، نـاوی تەمسیلییەکەم لـە بیر نییە بـەڵام چیرۆکـەکە باسـی گـەنجێك دەکـا کـە هـەر خەریکی ڕابـواردن‌و تێکەڵ بـوون لەگەڵ بـرادەری خـراپ‌و ڕابـواردن لەگەڵ ئارتیست‌و ئافرەتی بەدخوو بـوو، پـارەی لـەم‌و لەو قەرز دەکرد بە تایبەتی لە جوولەکەیەك بۆ ڕابواردنەکانی. جا خوشکێکی ناوی (فاطمة) دەبـێ، ئەویش لەبەر وەزعی خراپی خێزانی‌و هەژاری تووشی کاری خراپ دەبێ‌و بۆ پارە پەیداکردن ڕێگای بەدڕەوشتی دەگـرێ، بەڵام بە دزی، بێ ئەوەی براو دایك‌و باوکی ئاگادار بن جا بەتەسادوف ڕۆژێك ئەو گەنجە کە لە ڕێگای ڕاست لایدابوو، دەچێتە یەکێکە لەو ماڵانەی ئەو ئافرەتە خراپانە، کە بۆ پارە پەیداکردن، خۆیان تەسلیمی پیاوان دەکەن، یەك لەوان خوشکەکەی دەبێ کە (فاطمة)ی نـاو بـوو، ئیتر دەیبینێ لـەوێ‌و سەرخۆشیش دەبێ، دەیناسێتەوە، یەکسەر بە چەقۆ دەیکوژێ.

شایانی باسە لەم شانۆگەرییە من دەورم بینی کە یەکێکیان ڕۆڵـی جوولەکەکە بوو کە ئەو گەنجە هاتبووە لای هەندێ پارەی لێ وەرگرێ‌و جووەکە مومانەعە دەکا، لە سەرەتاوە نایداتێ، بەڵام دوایی گەنجەکە ئیقناعی دەکات، حیکمەتی کوڕی مامۆستا (وەدیع) دەوری (فاطمة)ی وەرگرتبوو، خۆی گەنجێکی سووروو سپی‌و چاوشین‌و باڵا ڕێك‌و جوان بوو، بۆ دەوری (کچ)مان هەڵبژارد، مامۆستا وەدیع، خۆی (مولەقین) بوو، دەچووە ناو ژوورێکی بچووك لە ژێر تەختەکانی سەر شانۆو لە کونێکەوە کە بەرامبەر بە ئەکتەرەکان دەیڕوانی‌و لە پێش شانۆکەدا بوو، بە درێژایی پەردەکانی شانۆ لەوێ دائەنیشت‌و وشە وشە لەگەڵ ئەکتەرەکان لە ناو کتێبەکە دەورەکانی بۆ دەخوێندن‌و ئەوانیش بەرامبەر بە خەڵکەکە قسەکانیان دەکرد، چونکە لەوانە بوو جاروبار وشەیەکیان لە بیر چووبایە، مامۆستای (ملقن) زوو، بە دەنگێکی بەسەرەخۆ بە هـێـواشـی، وشـەکـەو ڕسـتـەکـەی دەخـوێـنـدەوە، ئینجا ئەکتەرەکان بەردەوام دەبوون.

لـە قوتـابخـانـەکـەمـان ژمـارەیـەکـی بـاش شـانـۆگـەریـمـان پێشکەش جەماوەری کەرکوك کرد، هەندێ لەو (کۆمیدیا) یانە لەسەر شانۆی ئەو قوتابخانەیە پێشکەشمان کردن لە ماوەی ساڵانی پەنجاکان، ئەوانەی خوارەوەم لە بیرە، جگە لەوانەی باسم کردن، لەوە پێش:

١. (گازینۆی پشیلەی ڕەش): لە نووسینی خۆم، هەروەها خۆم ڕۆڵی سەرەکیم وەرگرتبوو کە بە ناوی (سەقریطوس) بوو، باسی مەشروب خواردنەوەو سەرخۆشی ئەنجامی ئەم جۆرە خووڕەوشتە ناسازە. شایانی وتنە، کە لە هەریەك لەو کۆمیدییانە، ماوەیەکم بۆ گۆرانییەکی لەسەر شکلی (مۆنۆلۆج)م بۆ خۆم دەخستە ناو چیرۆکەکەو لەگەڵ حیوارو سیناریۆکە دەگونجاو بەعودەوە دەمگوت.

٢. (تارمایی "وە یاخود ڕووحـی" دایـك) لە نووسین‌و دەرهێنانی، نووسەری شاعیری ئاشووری ئەوسا، (یوئەو تۆما) ئێستا لە ئوسترالیایە، ڕۆڵی سەرەکی ئەم شانۆگەرییە (کۆمەڵایەتی‌و کۆمیدیایی) من وەرمگرتبوو، دیسان ناوەڕۆکی چیرۆکەکە لە دەوری (عادەتی خراپی مەشروب خواردنەوە) دا بوو، نیشانی ئەدا چۆن ئەم خووە نائاساییە دەبێتە هۆی تێکدانی ماڵ‌و خراپ بوونی وەزعی خێزان. ئەم تەمسیلە زۆر ناوبانگی سەندو حەوت شەو لە حەوشی قوتابخانەی ئاسووری پێشکە کراو هەموو شەو جەماوەرێکی زۆر دەهاتنە بینینی، لەم شانۆگەرییەشدا ژمارەیەکی زۆر لە هونەرمەندی گەنج، نێرو مێ‌و منال لەگەڵما بوون‌و بەشداریان کردبوو، ئەم شانۆگەرییە لە پێنج پەردەدا پێکهاتبوو، ژمارەیەك کادری هونەری (فنی)ش دەستێکی باڵایان هەبوو لە سەرکەوتنی شانۆگەرییەکە، وەك نووسراوە لێرەدا:

١. بەڕێوەبەری شانۆ، سیرۆن مایکل.

پێشتر باسی ئم هونەرمەندەم کردووە کە تەمەنێکی درێژی لە پێشخستنی شانۆی (ئاسووری) تەرخان کردووەو بەسەر بردووە وەك ئەکتەرێکی لێهاتووی بەهرەداری کۆمیدیا.

٢. ماکیاج‌و جلوبەرگ، شاول حزیران.

٣. ملقن: ئیشا عەسکەر.

٤. بەڕێوبەری مۆسیقا، عەبدولئەحەد لازار.

*** یاداشت‌و بیرەوەری نووسەرانی کەرکوك لەسەر هونەری شانۆ لەو ماوەیەدا :**

– خوالێخۆشبوو مستەفا نەریمان لە هەشتاکاندا باسی چالاکییە شانۆییەکانی خۆی کردووەو دەڵێت: لەساڵی ١٩٥٧ شانۆگەری (عـەلی ئەفەندیم) نووسی‌و پێشکەشمان کرد، پاشان لەساڵی ١٩٥٨ لە چاپخانەی (الشمال) لە کەرکوك لە چاپی داوە، هەروەها شانۆگەری (ڕووخان) یشی نووسیوەو دەریهێناوە.

– مامۆستا خالد دلێریش دەڵێت:–

"... لەپاش شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ، لە هەموو قوتابخانە کوردییەکانی شۆڕیجەو ئیمام قاسمو تەپەو گەڕەکەکانی تر شانۆگەری لەنێوان قوتابیانو مامۆستاکاندا رێکدەخراو لە چالاکی قوتابخانەکاندا پیشان دەدرا... تیپێکی هونەری گشتی لەشارەکەدا پێکهێنرا بۆ گۆرانیو هەڵپەڕکێو شانۆگەری کوردی، ئەو تیپە لە هەموو ئاهەنگەکاندا بەشداری دەکرد کە یەکێتیو ڕێکخراوە نیشتیمانییەکان لەشاری کەرکوکدا دەیانگێڕاو زۆر هونەرمەندی شارەکە لە کوڕو کچ تیایدا بەشدار ئەبوون.

ئەو تیپە ناونرا (تیپی هونەری خەبات) هەر چەندە تەمەنێکی کورتی هەبوو بەڵام لە ماوەی کارکردنیاندا توانیان سێ چیرۆکی شانۆیی نایاب پێشکەش خەڵکی شارەکە بکاتو هونەر پەروەرێتی ئەندامەکانی بەخەڵکی بسەلمێنێ. ئەو سێ شانۆگەرییە (نوری هونەر) ئامادەی کردبوو، بۆ سەر شانۆ دوای دەرهێنانی پیشان درا، کە ئەمانەن:-

*** فاڵچی:**

ئەم شانۆگەرییە لە هاوینی ساڵی (١٩٥٨)دا لەقوتابخانەی شۆڕیجە پیشان درا، کە بیرۆکەی بەربەرەکانی قسەی پڕوپووچو هەڵخەڵەتێنەری خەڵکی دەکرد، ئەکتەرەکانی بریتی بوون لە برایان (نوری هونەر، جەوهەر عەبدوول، کەمال بێزار، نەجلا شێخ ڕەئوف، نازەنین بەکر)و زۆری تر.

شانۆگەری (فالچی)، لە بەرهەمەکانی تیپی هونەری خەبات لە سالی ١٩٥٨

*** ژیان لە دوو دەورا:**

ئەم شانۆگەرییە بێ دەنگ بوو (پانتۆمایم)، بەبۆنەی جەژنی کرێکارانی جیهانەوە ڕۆژی یەکی ئایاری ساڵی (١٩٦٠) پیشان درا کە هونەرمەندان (حەسیب محەمەد گلی) و (کەماڵ کەڵەمێرد)و (حەمید تاڵەبانی)و (حەمە سیروان)و (شێخ ڕەئوف - کە دەوری مەلیکی دەبینی) , (کەماڵ بێزار) و زۆری تر بوون کە هاوبەشیان تیا کرد کە باسی ژیانی کۆمەلانی خەڵکی دەکرد لەدوو دەوری پێشو پاش شۆڕشی چواردەی تەموزدا.

*** شەوی کۆتایی:**

لەنووسینی کەماڵ قەرەداغیو دەرهێنانی (نوری هونەر) بووە، بۆ ماوەی دوو شەو (١٩ - ٢٠)ی حوزەیرانی ١٩٦٠ پێشکەش کرا، لە پاییزی هەمان ساڵ لە هەولێر دووبارە کرایەوە لەسەر شانۆی هۆڵی گەل، بۆ ماوەی دوو شەو، شەوێك بۆ پیاوانو شەوێك بۆ ژنان، ئەکتەرەکانی (کاکە مەم فەخریو کەماڵ کەڵەمێردو خوشکە فەریدە حەسەنو محەمەد سیروانو ئەمین شوانو شێرکۆ محەمەد)و زۆری تر بوون.

* مامۆستا جەلیل زەنگەنە باسی شانۆگەری ئەو سەردەمەمان بۆ دەکاتو دەڵێت، شانۆگەری (شەوی کۆتایی) تیپی لاوانی کەرکوکیش لەساڵی (١٩٥٩)دا پێشکەشی کرد، کە مامۆستا خالید دلێر نووسیبووی، هەروەها ئەم تیپە چیرۆکی شانۆگەری (کاوەی ئاسنگەر)ی لەهەموو بۆنەیەکدا،

بەتایبەتی لە جەژنی نەورۆزدا پێشکەش کردووە.

لە ساڵی (١٩٥٩ – ١٩٦٠)، ئافرەتانی کەرکوك، شانۆگەرییەکیان لە کۆبوونەوەیەکدا نمایش کرد کە باسی نووشتەو جادوو ئافرەتی ساویلکە دەکات کە بە ڕای حەسەن تەنیا لەوانەیە شانۆگەری ئافرەت و نوشتەی (کامل ژێر) بێت.

* هونەرمەند (فەخرەدین نەجار) کە ئێستا لەشاری هەولێر دەژی و وەچەی شەستەکانەو بەشداری لەکاری شانۆدا کردووە دەڵێت:–

((لە شەستەکاندا من لەکەرکوك بەشداری چەند شانۆگەرییەکم کردووە کە بەزمانی عەرەبی پێشکەش کراون لەوانە)):–

* جسر ئارتا:

لە ساڵی ١٩٦٥ پێشکەش کراوە، لەدەرهێنانی ئەنوەر محەمەد ڕەمەزان، بەرهەمی چالاکی قوتابخانەکان.

* بائع الزبادي:

نووسین و دەرهێنانی تەحسین شەعبان لەساڵی ١٩٦٧.

* رأس الشليلة:

لە نووسینی (یوسف العاني)، لە دەرهێنانی ئەنوەر محەمەد ڕەمەزان لە ساڵی ١٩٦٥، بەرهەمی چالاکی قوتابخانەکان.

* الطبيب:

دەرهێنانی (تەحسین شەعبان)، لەساڵی ١٩٦٥.

بۆیە لەماوەی ئەو ساڵانە بەدەردەکەوێت جوڵانەوەی شانۆی کوردی زۆر سست بووە یان قەدەغە کراوە، لە هەمان کاتدا هانی ئەو شانۆگەریانەیان داوە بەزمانی عەرەبی.

لە ساڵی (١٩٦١)دا تیپی شانۆی مامۆستایان دامەزراوە بەسەرپەرشتی هونەرمەند ئەنوەر ڕەمەزان، هەر لە ساڵی ١٩٦٢ دەستی کرد بەپێشکەش کردنی بەرهەمەکانی کە هونەرمەندەکانی پێك هاتبوو لە: (خەلیل ئەحمەد ئەلحەسەنی، سوعاد عیزەت ئەرسەلان، سەلاح شێخلەر، کەمال تاهیر، نوئیل بەهجەت) و گەلێکی تر کە ئەو بەرهەمانەی پێشکەشیان کرد بریتی بوو لە:–

(انتصار الحرية، عەرزو حاڵچی، دموع ابليس، اهل الكهف، التيكونا، ثورة ١٤ رمضان، فتح مكة، المخادع، يوليوس قيصر، عائدون، گهوه العزاوي، المدمن، الزبون المزعج، داء النسيان، الاصدقاء، جسمان ومظلة واحدة، قتلة المسيح يتكلمون).

لە ساڵی (١٩٦٢)دا تیپی شانۆی قوتابیان دامەزرا، لەلایەن چالاکی قوتابخانەکان بەسەرپەرشتی ئەنوەر ڕەمەزان، هەر لە ساڵی (١٩٦٣)دا دەستی بەکارەکانیان کردووە.

ئەو شانۆگەرییانەی کە پێشکەشیان کردووە:–

(انتيكوت، مدرسة الامية، تاجر البندقية، نهاية الطاغية، الابرياء المجرمون، المعركة الكبرى).

هەروەها لە سییەکاندا سەلاح شێخلەر تیپێکی شانۆی دامەزراند بەناوی تیپی شانۆی قوتابیان، کە ئەم شانۆگەرییانەیان نمایش کرد (نوادر جحا)، (الطرشان).

لە قوتابخانەی ناوەندی (غەربیە)ش تیپێکی شانۆی بەناو تیپی ناوەندی غەربیە بۆ شانۆ دامەزرا بەسەرپەرشتی سوعاد عیزەت ئەرسەلان، کە گرنگترین بەرهەمیان:– (ثورة الموتى)، بوو.

لە شەستەکانیش تیپی شانۆی (الذهب الاسود) دامەزرا بەسەرپەرشتی هونەرمەندی خوالێخۆشبوو خەلیل ئەحمەد ئەلحەسەنی، بەڵام دووبارە دایمەزراندەوە لە بەغدا لەنێوان ساڵانی (١٩٦٧ – ١٩٦٨)، بەڵام لەکەرکوك هەر لە ساڵی (١٩٦٤)ی دامەزراندنیەوە هیچ چالاکییەکی نەبوو، ئەو هونەرمەندانەی لەم تیپە بوون:– نەجات بەیاتی، فازڵ حەلاق، عەبدوڵلاجومعە، محەمەد قاسم.

لە ساڵی ١٩٦٥ هونەرمەند (تەحسین شەعبان) هەستا بەدامەزراندنی (المجددون في المسرح العراقي)، ئەویش دوای دەرچوونی لەپەیمانگای هونەرە جوانەکان، لەئەندامەکانی ئەم تیپە:– عەدنان ئیسماعیل، کەمال تۆفیق، جەودەت محەمەد لەبەرهەمەکانیان (رجال وفئران، الحقيقة عارية جدا).

لەساڵی (١٩٦٩) یش تیپی (یکی تمسیل طاقمی) دامەزرا بەسەرپەرشتی کۆمەڵێك قوتابیانی ئەکادیمیەی هونەرەجوانەکانی بەغدا لەوانە فازل حەلاق، یەڵماز شکور، حوسێن عەلی غالب، عیرفان سدیق، عیماد بهجەت، زین ئەلعابدین حەسیب، حوسێن ئەمین میخائیل.

هونەرمەند عەلی کەریم دەربارەی هونەری شانۆ لە شەستەکان وا باس دەکات:

"لەم قۆناغە دیسانەوە هەوڵی شانۆی شاری کەرکوك هەبووە، ئەویش لە ڕێگەی کۆمەڵێ ڕۆشنبیرو هونەرمەندو ئەوانەی کە ئارەزووی هونەرو ئارەزووی پێشکەشکردنی شانۆیان هەبووە، لە سەرووی هەموویانەوە ڕۆشنبیرو سیاسەتمەداری کورد مامۆستا (خالید دلێر) لەگەڵ(زێبا)ی خوشکی لەگەڵ کۆمەڵێ گەنج کە ئەوانەشی کە بەبیرم بێ ئەو شانۆگەریانەی کە پێشکەشکراون، باسی شانۆگەری (فاڵچی) دەکرێت کە لە دەرهێنانی (نوری هونەر)بوو، لەگەڵ شانۆگەرییەکی کە ئەگەر بە هەڵا نەچوو بم لە هاوینی ساڵی ١٩٦٠ بوو، واتا پێش شۆڕشی ئەیلوول، من ئەو دەمە منداڵ بووم لە تەمەنی ٩ ساڵان ئەبووم دەستم بەدەستی باوکمەوە بوو.

بە پێوەش خەڵکەکە وەستابوون لە باخچەکە باخچەی پارتی دیموکراتی کوردستان. ئەو دەمە پێیان ئەوت بارەگای خەبات.

ئا لەوێ من شانۆگەری شەوی کۆتایم بینیوە، دەرهێنانی فۆتۆگرافەرو هونەرمەند (نوری هونەر)بوو، لەگەڵ کۆمەڵێ ئەکتەر یەکێکیان (حەسیب محەمەد بەگ) (حەسیب گلی) ئەوەی تریان (شێخ مەلیك شێخ ڕەئوف خانەقا) ئەوەی تریشیان (کەمالی حوسێن کەڵەمێرد) شەوی کۆتایی سەر گوزشتە بوو بۆ ئەو چوار ئەفسەرە پاڵەوانەی کە لەو دەمە لە

سەردەمی پاشایەتی لە سێدارە درابوون.

ئەگەر سەرنجێکی نەخشەی شانۆی کوردی بکەین لە کوردستانا ئەبینین شانۆی کوردی شاری کەرکوك، گرنگی خۆی هەیە کە ئەڵێم گرنگی خۆی هەیە مەبەستم لە ڕووی نمایشەوە بێت یان وەك دەق توانیویەتی ئەو قۆناغە کەمەی کە ئەتوانم بڵێم پڕاوو پڕ بووە لە چالاکیو ئیشێکی جوان لەو قۆناغە کەمە یان ئەو ماوە کەمە کەماوەیەکی کەمە لەچاو سەرهەڵدانی شانۆی کوردی لە کوردستان بە بەراورد لەگەڵ شارەکانی وەك هەولێرو دهۆك ماوەی ئیش کردنی شانۆی شاری کەرکوك کەم بووە، بەڵام بایەخو گرنگی خۆی هەبووە.

زۆربەی ئەو دەقانەی پێشکەش کراون لەو قۆناغە ئەتوانم بڵێم یان هی نووسەری کورد بووە یان هی تورکمان بووە، بەڵام کراوە بە کوردی ئەگەر هی تورکمان بووبێ".

هەر لە شەستەکاندا چالاکی هونەری قوتابخانەکان دەمەزرا بە سەرپەرشتی هونەرمەندی شێوەکار (مەحمود ئەلعوبێدی) کە بەشێکی گرنگی بۆ شانۆ کرایەوە بە سەرپەرشتی (ئەنوەر محەمەد ڕەمەزان)، کردنەوەی ئەم بەشە هەنگاوێکی گرنگ بوو بۆ ئەوەی بەشێکی زۆر لە هەوادارانی شانۆ لە مامۆستایان پێشوازی لێ بکەنو بەرهەمەکانی تێدا پێشکەش بکەن.

هەر لەو ماوەیەدا کۆمەڵێك شانۆگەری لە چالاکی قوتابخانەکان پێکشەش کرا بە سەرپەرشتی مامۆستایانی هونەرمەندو بەشێك لە مامۆستایان، گرنگی ئەم بەشە لەوەدا بوو کە شانۆکار بتوانێت هاوگونجاوی لەگەڵ مامۆستاو قوتابیدا دروست بکاتو بتوانێت کەسی شایستە هەڵبژێرێت لە پێناو شانۆو دەقێکی شانۆی گرندا.

*** ئەو تیپە شانۆیانەی لە قوتابخانەکان دروست بوون ئەمانە بوون:**

**١. تیپی شانۆی (مامۆستایان):**

ئەم تیپە لە ساڵی (١٩٦١) بە سەرپەرشتی هونەرمەند (ئەنوەر ڕەمەزان) دروست بوو لە چالاکی هونەری قوتابخانەکان، لە ساڵی (١٩٦٢) دەستی کرد بە هونەری شانۆ نواندن، کە ئەندامە چالاکەکانی پێکهاتبوو لە: (خەلیل ئەحمەد ئەلحەسەنی، سوعاد عیزەت ئەرسەلان، سەلاح شێخلەر، کەماڵ تاهیر خانچی، نوئێل بەهجەت).

شانۆگەرییەکانیان لە ساڵی (١٩٦٢) بریتی بوو لە:

- (انتصار للحرية)، لە ئامادەو دەرهێنانی (ئەنوەر ڕەمەزان).
- (العرضالچی)، لە دەرهێنانی (ئەنوەر ڕەمەزان).
- (دموع ابليس)، نووسینی (فەتحی ڕەزوان)، دەرهێنانی (ئەنوەر ڕەمەزان).
- (اهل الكهف)، نووسینی (تۆفیق حەکیم)، دەرهێنانی (ئەنوەر ڕەمەزان).

شانۆگەرییەکانیان لە ساڵی (١٩٦٣) بریتی بوو لە:

- (انتيكونا)، نووسینی (جان کوکتو)، دەرهێنانی (ئەنوەر ڕەمەزان).

شانۆگەرییەکانیان لە ساڵی (١٩٦٤) بریتی بوو لە: (فتح مكة)، (المخادع)، (يوليوس قيصر)، (عائدون)، (گهوه عزاوي)، (المدمن)، (العرضالچی)، (الزبون المزعج)، (داء النسيان)، (الاصدقاء)، هەموو ئەم شانۆگەرییانە لە دەرهێنانی (ئەنوەر ڕەمەزان).

شانۆگەرییەکانیان لە ساڵی (١٩٦٥) بریتی بوو لە:

- (جسمان ومظلة واحدة)، نووسینی (سەعدون ئەلعوبیدی)، دەرهێنانی (ئەنوەر ڕەمەزان).

شانۆگەرییەکانیان لە ساڵی (١٩٦٩) بریتی بوو لە:

- (قتله المسيح يتكلمون)، دەرهێنانی (هاشم زەینەڵ).

**٢. تیپی شانۆی (قوتابیان):**

ئەم تیپە لە ساڵی (١٩٦٢) لەلایەن چالاکی قوتابخانەکان بە سەرپەرشتی هونەرمەند (ئەنوەر ڕەمەزان) دامەزرا، هەر لە ساڵی (١٩٦٣)ەوە بەشداری فیستیڤاڵی شانۆیی کردووە لە وەزارەتی پەروەدە لە بەغدا.

شانۆگەرییەکانیان لە ساڵی (١٩٦٣) بریتی بوو لە:

- (انتيكونا)، نووسینی (جان کوکتو)، دەرهێنانی (ئەنوەر ڕەمەزان).
- (مدرسة الامية)، دەرهێنانی (ئەنوەر ڕەمەزان).

بەشێك لە شانۆگەری (تاجر البندقية) پێشکەش کراوە لە دەرهێنانی (ئەنوەر ڕەمەزان)، کە لەسەر شانۆی ئامادەیی (کرکوك)ی کوڕان پێشکەش کراوە بە توانای دیکۆرێکی جوانو جلوبەرگێکی شایستە، هەر لەو شانۆییەدا هونەرمەند (حەقی شبلی) ئامادە بووە.

شانۆگەرییەکانیان لە ساڵی (١٩٦٦) بریتی بوو لە:

- (نهاية الطاغية)، ئامادەکردنو دەرهێنانی (تەحسین شەعبان).
- (الأبرياء المجرمون)، ئامادەکردنو دەرهێنانی (تەحسین شەعبان).
- (المعركة الكبرى)، ئامادەکردنو دەرهێنانی (تەحسین شەعبان).

**٣. تیپی شانۆی (قوتابیان):**

ئەم تیپە لەلایەن هونەرمەند (سەلاح شێخەلەر)ەوە لە ناوەڕاستی شەستەکاندا دامەزراوە، کە ئەکتەرەکانی بریتی بوون لە کۆمەڵێك قوتابی بەهرەمەند، لەو شانۆگەرییانەی کە پێشکەشیان کرد: (نوادر جحا، الطرشان) هەردووکی لە دەرهێنانی هونەرمەند (سەلاح شێخلەر) بوو.

**٤. تیپی شانۆی (ناوەندی الغربية):**

ئەم تیپە لە ناوەڕاستی شەستەکان دامەزراوە لەلایەن هونەرمەند (سوعاد عیزەت ئەرسەلان)، لە شانۆگەرییەکانیان کە پێشکەشیان کردووە بریتی بووە لە (ثورة الموتى) لە نووسین (ئاروین شۆ)و لە دەرهێنانی (سوعاد عیزەت ئەرسەلان).

**٥. تیپی شانۆی (الذهب الأسود):**

ئەم تیپە لە ساڵی (١٩٦٤) لەلایەن هونەرمەند (خەلیل

ئەحمەد ئەلحوسێنی) دامەزراوە، بەڵام دووبارە لە بەغدا لە ساڵی (١٩٦٧-١٩٦٨) دامەزراوەتەوە، ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەم تیپە شتێکی ئەوتۆی لە هونەری شانۆ لە کەرکوك پێشکەش نەکرد، بەڵام لە بەغدا گەلێك شانۆگەری جۆراوجۆریان پێشکەش کرد، هەر یەکە لە هونەرمەندان (فازڵ حەلاق، عەبدوڵڵا جومعە، محەمەد قاسم) بەشداری شانۆگەرییەکانیان کردووە، ئەو شانۆگەرییانەی کە پێشکەشیان کردووە بریتیە لە:

- (سیرکە دعوەسی)، ئامادەکردنی (فازڵ حەلاق)و دەرهێنانی (عەبدوڵڵا جومعە).
- (داء النسیان)، دەرهێنانی (عەبدوڵڵا جومعە).
- (عرضحالچی) دەرهێنانی (محەمەد قاسم).
- (یول)، ئامادەکردنی (عەبدوڵڵا جومعە)و دەرهێنانی (فازڵ حەلاق).

### ٦. تیپی شانۆی (المجددون في المسرح العراقي):

لەلایەن هونەرمەند (تەحسین شەعبان) لە ساڵی (١٩٦٥) دامەزراوە لە دوای دەرچوونی لە پەیمانگای هونەرە جوانەکان، هەر یەکە لە (عەدنان ئیسماعیل، کەماڵ تۆفیق، جەودەت قادر)و چەند کەسێکی دیکە ئەندامی ئەم تیپە بوون.

شانۆگەرییەکانیان بریتی بوو لە:

- (رجال وفئران)، لە ڕۆمانێکی (تشاینبك) وەرگیراوە، دەرهێنانی (تەحسین شەعبان).
- (الحقیقة عاریة جدا)، دەرهێنانی (تەحسین شەعبان).

### ٧. تیپی شانۆی نوێ (یني تمثیل طاقمي):

ئەم تیپیە لە ساڵی (١٩٦٩) لەلایەن کۆمەڵێك قوتابی ئەکادیمیای هونەرە جوانەکان لە بەغدا دامەزراوە، لەوانە (فازڵ حەلاق، یەلماز شکور بەگ ئۆغلو، حوسێن عەلی غالیب، عیرفان سدیق دایلە، عیماد بەهجەت)، شانۆگەرییەکانیان بریتی بوو لە:

- (السواعد الجریحة)، لە ئامادەکردن و دەرهێنانی (فازڵ حەلاق)، لە ڕۆژی (١٤-١٥)ی تەمموزی ساڵی (١٩٦٩) لەسەر شانۆی هاوینەیی چالاکی قوتابخانەکان نمایش کرا.
- (رجیلە بالشمس) ئامادەکردنی (ئەنوەر ڕەمەزان)، دەرهێنانی (فازڵ حەلاق)، لە (٧)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٦٩) لەسەر شانۆی هاوینەیی چالاکی قوتابخانەکان نمایش کرا.
- (سختەچی دوختور)، لە ئامادەکردن و دەرهێنانی (فازڵ حەلاق)ن لە ساڵی (١٩٦٩) لە شانۆی (نادي الاخاء الترکماني) لە بەغدا نمایش کرا.

ئەمیش ناوی کۆمەڵێك هونەرمەندانی شانۆیە لە شەستەکان لە کەرکوك:

(عیسمەت ئەلهورمزی، ئەنوەر محەمەد ڕەمەزان، ئایدن ئەلعیراقی، خەلیل ئەحمەد ئەلحەسەنی، فاتیح محەمەد جۆمەرد، سوعاد عیزەت ئەرسەلان، سەلاح شێخلەر، کەماڵ تاهیر خانچی، نیهاد ئاق قۆینلو، عیزەددین جولحە، غازی بازرگان، جاوید ئەلموفتی، نیهاد ئەجیب ئاوچی، نۆئیل بەهجەت، کەماڵ شکرچی، ئەمین زەکی، عەلی یەعقوب، عەباس عەبدولجەبار، ڕەمەزان ساڵح، ئیلیا حەسیب، ڕەعد عەبدولهادی، تەحسین شەعبان، سەلمان فایق، هاشم زەینەل، جەلیل ڕەجەب، محەمەد قاسم، فازڵ حەلاق، غازی میخائیل، کەماڵ تۆفیق، جەودەت محەمەد، باقر تاریق، سەعید حەمید، عەدنان ئیسماعیل، نوری جاسم، موەفەق جۆمەرد، یلماز شکور، زرار حەمید، فاروق شەفیق، یەشار عەلی غالیب، تاجەددین حەمید، سەباح حەمید، یاووز ئەلهورمزی، هیلال شەهاب، ئومێد ئەلهورمزی، جەمیل ئەحمەد، هیجران سادق، نیازی قایەچی، مەحمود قلنچی)و هی تر.

### * هونەری شانۆ لەنێوان ساڵانی ١٩٧٠ - ١٩٧٤:

ڕێککەوتنامەی (١١)ی ئاداری ساڵی (١٩٧٠) لەسەرتاسەری کوردستان زەمینەیەکی لەباری بۆ هەموو بوارەکانی ژیانی کۆمەڵگای کوردەواری ڕەخساند، شاری کەرکوك لە ماوەی (١٩٧٠-١٩٧٤) درەوشاوەترین قۆناغی شانۆیی بەخۆیەوە بینیووە.

سەرەتا بەشانۆگەری (دایکی شەهید) شانۆی ئەم شارە هەژا نووسەری ئەم شانۆگەرییە برای شاعیر مستەفا پەژار بوو کە ئاوا باسی دەکات:-

"دوای تێپەڕبوونی دوو مانگ بەسەر ڕێککەوتننامەکەدا داوایان لە (غەفور عوزێری) کرد کە پێشتر بەشداری شانۆی هەبوو، شانۆگەرییەك لەبارەی ڕێککەوتن بنووسێ، ئەو بۆی نەکرا، پاشان داوایان لەمن کرد، بەڵام من بیرۆکەکەم بەدڵ نەبوو، خۆم شانۆگەری (دایکی شەهید)م نووسی. دەقەکە باسی خێزانێك دەکات، باوکەکە لە شۆڕشی ئەیلول شەهید بووە، کوڕێکی لەپاش بەجێ ماوە، ناوی دلێر بوو، دایکەکە کوڕەکەی بەخێو دەکات تا گەورە دەبێت، پاشان کوڕەکە بەشوێن باوکیدا دەکەوێت و دەبێتە پێشمەرگە، لەگەڵ ڕێککەوتنامەکەدا دەبێتە ئاهەنگ و پێشمەرگە دەگەڕێتەوە، دایکەکەش بەدوای کوڕەکەی خۆیدا دەگەڕێ، بەڵام نایدۆزێتەوە، پاشان دەزانێت کە کوڕەکەی شەهید بووە، دایکەکەی لەجیاتی ئەوەی بگیرێت لەگەڵ خەڵکەکەدا ئاهەنگ دەگێڕێت و دەڵێت:- دلێریش چووە ڕێگەی باوکی، مادام کورد بەمافی خۆی دەگات دەبێت ئێمە هەموومان دڵمان خۆش بێت، ئێوە هەمووتان لەجێگەی دلێرن..".

دەقەکە فەوتاوە، دوو جار لەسەر شانۆی (بەهو)ی شارەوانی کەرکوك نمایش کراوە پاشان براوەتە سلێمانی و سەلمان فایق شانۆگەرییەکەی دەرهێناوە، لقی (٣)ی پارتی ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی کارەکەی دەکرد، (تیپی شانۆی مەشخەڵ)ی یەکێتی قوتابیانی کوردستان - لقی کەرکوك بەم شانۆگەرییە دروست بوو، بینەرانیش بە پلیت دەهاتنە ژوورەوە، ئەم تیپە بەڕەسمی مۆڵەتی وەرنەگرتووە، بەڵام وەکو تیپێك کاری کردووە و ڕۆڵی بەرچاوی خۆی هەبووە لە بوژاندنەوەی شانۆی کوردی لەم شارەدا، هەروەها (تیپی یەکێتی لاوانی دیموکراتی کوردستان) لەسەرەتای قۆناغەکە ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو بەسەر جووڵانەوەی شانۆ و جەماوەرێکی باشیان بۆ خۆیان دروست کردبوو.

*** شانۆگەرییەکانی ساڵانی (١٩٧٠ - ١٩٧٤):**

١. شانۆگەری (ئەمرەکەی بەگم) نووسینی یوسف ئەلعانیو دەرهێنانی سەلمان فائق، بەرهەمی چالاکی قوتابخانەکان، لە ساڵی ١٩٧٠ نمایش کرا.

٢. شانۆگەری (هەرچی کردی حەسیر کردی)، نووسینو دەرهێنانی مەهدی ئۆمێد، بەرهەمی یەکێتی لاوانی دیموکراتی کوردستان، ساڵی ١٩٧٠.

٣. ئۆپەرێتی (گلکۆی تازەی لەیل)، دەرهێنانی مەهدی ئومێد، ساڵی ١٩٧١.

٤. شانۆگەری (کاوەی ئاسنگەر)، نووسینو دەرهێنانی مەهدی ئومێد، بەرهەمی یەکێتی لاوان، ساڵی ١٩٧١.

٥. شانۆگەری (کچە لاڵەکە)، نووسینو دەرهێنانی سەلمان فائق، ساڵی ١٩٧١، پاشان لەهەولێریش نمایش کراوە.

٦. شانۆگەری (خاکمان)، نووسینو دەرهێنانی سەلمان فائق، ساڵی ١٩٧١ نمایش کراوە.

٧. شانۆگەر (کۆتایی دەرەبەگ) بەرهەمی یەکێتی لاوان، ساڵی (١٩٧٠-١٩٧١) نمایش کراوە، دەرهێنانی سەلمان فائق.

٨. شانۆگەری (شۆڕشی نەورۆز)، نووسین فەرەیدون عوسمان، دەرهێنانی سەلمان فائق، ساڵی ١٩٧١ نمایش کراوە.

٩. شانۆگەری (پێشمەرگە)، نووسین غەفور عوزێری، دەرهێنانی سەلمان فائق، ساڵی ١٩٧١.

١٠. شانۆگەری (برسیەتی)، نووسینی جەلیل زەنگەنە، دەرهێنانی سەلمان فائق، ساڵی ١٩٧١.

١١. شانۆگەری (خێزانێکی شلەژاو)، نووسینی جەلیل زەنگەنە، دەرهێنانی سەلمان فائق، بەرهەمی کچانی قوتابخانەی ئامادەیی کوردستان ساڵی ١٩٧٢.

١٢. شانۆگەری (کاوەی ئاسنگەر)، ئامادە کردنی جەلیل زەنگەنە، دەرهێنانی سەلمان فائق، ساڵی ١٩٧٢.

١٣. شانۆگەری (داستانی هونەر)، نووسینو دەرهێنانی مەهدی ئومێد، ساڵی١٩٧٢.

١٤. شانۆگەری (ڕێـڕەوی ژیان)، ئامادە کردنی جەلیل زەنگەنە، دەرهێنانی سەلمان فائق، بەرهەمی تیپی شانۆی مەشخەڵ، ساڵی ١٩٧٣.

١٥. شانۆگەری (دڕكو داڵ)، نووسینو دەرهێنانی مەهدی ئومێد، ساڵی١٩٧٢ بەرهەمی یەکێتی لاوان، ساڵی ١٩٧٣.

١٦. شانۆگەری (دکتۆر)، نووسینو دەرهێنانی سەلمان فائق، بەرهەمی یەکێتی لاوان، ساڵی ١٩٧٣.

١٧. شانۆگەری (سواڵکەر)، نووسینی جەلیل زەنگەنە دەرهێنانی سەلمان فائق، ساڵی ١٩٧٣.

١٨. شانۆگەری (زیانی توتن)، نووسین چێخۆف، دەرهێنانی سەلمان فائق، ساڵی ١٩٧٤.

١٩. شانۆگەری (چاوی ڤیتنام)، دەرهێنانی سەلمان فائق، ساڵی ١٩٧٤.

٢٠. شانۆگەری (بووکی بەفر)، نووسینو دەرهێنانی مەهدی ئومێد، ساڵی ١٩٧٤

٢١. شانۆگەری (کۆتایی دەرەبەگ)، دەرهێنانی سەلمان فائق، ساڵی ١٩٧٤.

٢٢. شانۆگەری (گومەزێك لەدووکەڵ)، نووسینو دەرهێنانی مەهدی ئومێد، بەرهەمی یەکێتی لاوان، ساڵی ١٩٧٤.

لە ساڵی (١٩٧٠ - ١٩٧١)دا لقی کۆمەڵەی هونەرو وێژەی کوردی لە کەرکوك کرایەوەو جەمیل جێماو ئەندامی سەرەکی دەستەی دامەزرێنەری لقی کەرکوك بووە، ئەندامە سەرەکییەکانیش بریتی بوون لە: (عەبدوڵڵا پشدەری، جیهاد دلپاك، عەلی کەریم، خالد ئیسماعیل، قاسم عەلی فەرزە، مەحمود مەلا عەبدولڕەحمان)، کۆمەڵە دوای ١٩٧٤، پارێزگای کەرکوك بۆ ماوەی ساڵێك ماوەی کارکردنی پێ نەدا پاشان مەلەفەکانیان پێچایەوەو کۆمەڵە بەتەواوی داخرا.

لە ساڵی (١٩٧١)دا کۆمەڵی هونەرو وێژەی کوردی توانی چیرۆکی شانۆگەری (کەبابخانەی خولە شەل) پیشانی خەڵکی بدات کە لەئامادەکردنی (جەمیل جێماو) بوو.

لە ساڵی (١٩٧٢)دا شانۆگەری (بەهاری دزراو)ی لەسەر شانۆ پێشکەش کردو لە ساڵی (١٩٧٣)دا لەتەلەفزیۆن تۆماری کرد.

ئینجا هەر لەساڵی (١٩٧٣)داو لەشاری چەمچەماڵ شانۆگەری (١، ٢، ٣)ی بەبۆنەی نەورۆزی ئەو ساڵەوە پیشانداو لەمانگی نیسانی هەمان ساڵا شانۆگەری (تێکۆشانی مرۆڤ)ی پیشانی خەڵکی ناوچەی قەرەهەنجیر دا، هەر لەو ساڵەشدا چیرۆکی (مەرەزە)ی بەسەرکەوتوویی لەتەلەفزیۆندا تۆمار کرد.

بەرزترینو جوانترین شانۆگەری کوردی لەمیهرەجانی هونەری کوردییدا لەبەغدا لەساڵی (١٩٧٤)دا شانۆگەری (تەقینەوە) بوو کە کۆمەڵەی هونەرو وێژەی کوردی پێشکەشی کردو خەڵاتی یەکەمی میهرەجانەکەی پێ بڕا بۆ باشترین دەرهێنانو بەرهەمو نووسینو ئەکتەرو جێگەی سەرسووڕمانی هەموو لایەکی میهرەجانەکە بوو، بۆ یەکەم جاریش بوو لەمێژووی شانۆی کوردیو برای دەرهێنەر سەلمان فائق هەندێ بینراوی سینەمای تێکەڵ بەشانۆگەرییەکە کرد بوو، (تیپی مەشخەڵ)یش لەساڵی (١٩٧٠)دا دروست بوو، شانۆگەری (دایکی شەهید)ی کردە دیاری دەستی بۆ خەڵکی شاری کەرکوكو هەر لەو ساڵەشدا ئەم دیارییەی پێشکەش خەڵکی سلێمانی کرد، ئەم شانۆگەرییە لە نووسینی مستەفا پەژارو دەرهێنانی سەلمان فائق بوو، ئەکتەرەکانی بریتی بوون لە فازڵ جافو خوشکە پەروین ئەحمەدو هەندێ خوشکانو برایانی تر.

هەروەها لە هەمان ساڵ چیرۆکی شانۆی (کۆتایی دەرەبەگ) ی پێشکەش کرد، کە دەتوانین بڵێین یەکەم شانۆگەری بوو زۆربەی ئەکتەرەکانی ئافرەت بوون، لەهەمان ساڵا لەسلێمانیش پیشان درا.

دوای ئەوەی، لە ساڵی (١٩٧١)دا، شانۆگەری (یەك) ی لەنەورۆزی ئەو ساڵەدا پێشکەش کرد لەئامادە کردنو دەرهێنانی مامۆستا سەلمان فایەقو نواندنی (غەفوور عوزێریو محەمەد عەبدولڕەحمان)و خوشکان (پەروینو

نەجیبە)و زۆری تر بوون، هەر لەو ساڵەدا دوو چیرۆکی تری پێشکەش کرد بەناوی (ژیان – کچە لاڵەکە) لەئامادە کردنی سەلمان فایق‌و نواندنی (فازیل جاف‌و جەلیل زەنگەنە)و خوشکە (چنور ئەحمەد) بوو، لەگەڵ (خاکەکەم) لە نووسین‌و ئامادەکردنی سەلمان فایەق‌و نواندنی هەمان کۆمەڵ بوو، دوای ئەمانە لە ساڵی (١٩٧٣)دا شانۆگەرییەکی پێشکەش بەقوتابیانی قوتابخانەی ئامادەیی چەمی رێزانی کچان کرد لەژێر ناوی (برسێتی)داو شانۆگەرییەکی تریشی بۆ قوتابییەکانی ئەو قوتابخانەیە ئامادە کرد کە (خێزانێکی شڵەقاو) بوو، هەموو ئەکتەرەکانی بریتی بوون لەکچە قوتابییەکانی ئەو قوتابخانەیە.

شانۆگەری (هەرچی کردی حەسیر کردی) قوتابییە کچەکانی قوتابخانەی ناوەندی یانزەی ئاداری کچان لەژێر سەرپەرشتی ئەم تیپەدا، مەشخەڵ لە مانگی ئابی (١٩٧٠) دا پێشکەشیان کرد.

*** ڕای هونەرمەندان لەسەر شانۆی ساڵانی حەفتاکان لە کەرکوك:**

*** هونەرمەندی ( جەلیل زەنگەنە ) دەڵێت:**

"لە ساڵی (١٩٦٧– ١٩٦٨) من چیرۆکێکم نووسی بەناوی (برسێتی) شانۆگەری بوو، پاشان دەستم کرد بە (ژاڵە) بەڵام ژاڵە بە ڕەشنووسی، لە ساڵی حەفتا دوای بەیاننامەی ١١ ئادار کە لە هەموو کوردستان تەقییەوە چی وەکو ڕۆشنبیری چی وەکو شیعر چی وەکو گۆرانی چی وەکو شتی تر یەکێك لەوانە دراماو یەکێك لەوانەش شانۆگەری بوو، شانۆگەری لە کەرکوکدا بەڕاستی لەسەر دەستی هەندێك کادری چاك، یەکێك لەوانە مامۆستا (سەلمان فایەق) بوو کە توانی تەکان بدات بە بزوتنەوەی شانۆی کوردی لە کەرکوك لە حەفتاکانەوە.

شانۆگەرییەکی بە دەستەوە بوو بەعەرەبی پێشکەشی کردبوو بە تورکمانیش پێم وابێ پێشکەشی کردبوو ویستی بە کوردیش بیکات من وەرمگێڕایە سەر زمانی کوردی ئەوە بوو شانۆگەرییەکەمان پێشکەش کرد، (کچە لاڵەکە) دەنگێکی چاکی دایەوە، چونکە من دەوری باش حەمالم ئەبینی لە کەرکوك ناوم دەرکرد دەورەکە ڕای سەرەکی بوو ئەوە بوو شانۆگەرییەکەمان برد بۆ هەولێر کە من بووم هونەرمەند فازڵ جاف بوو هونەرمەندانی تر جیهاد دڵپاك بوو عەلی کەریم بوو هەندێ کەسانی تر حەمە ڕەزا یادی بەخێر ئەو بوو مامۆستا محەمەد ڕەزا گۆرانی ئەوت‌و عودو مۆسیقاشی لێ ئەدا هەندێ هونەرمەندی تریش بوون لەگەڵمان ئەوانیش هاتن.

لە هەولێر دەنگێکی سەیری دایەوە هەولێر لە هۆڵی گەل پێشکەشمان کرد دڵنیابە ئەو دەمە بە زۆر خەڵکمان ئەهێنا بۆ بینینی شانۆگەرییەکە کە شانۆگەرییەکەمان پێشکەش کرد لە بیرمە هەزار ڕەحمەت لە گۆڕەکەی فوئاد ئەحمەد لەگەڵ تایەر تۆفیق ئەوانە هاتن فوئاد ئەحمەد سەمای ئەکرد لەگەڵ ئەو گۆرانیەی لەناو شانۆگەرییەکە بوو کە بەڕەحمەت بێ شەوکەت ڕەشید دایبنابوو ئێمە ئەمان وتەوە، کەسانی تر لەناو شانۆگەرییەکە ئەیان وتەوە، شانۆگەری (کاوەی ئاسنگەر) لەگەڵ (برسێتی) کە پێشتر باسم کرد کە چیرۆکی من بوو شانۆگەری من بوو ئەمانەمان پێشکەش کرد

جەلیل زەنگەنە لە شانۆگەریی مەرەزەدا

ئەو دوانە مامۆستا جیهاد دڵپاك دەوری تیا ئەبینی لەگەڵ هەندێ کەسانی تر لەیاد نەماوە ئەویش لە دەرهێنانی سەلمان فایەق بوو دەنگی زۆری دایەوە دوا بەدوای ئەوە من دەرهێنانی شانۆگەرییەکم نووسی لە دەرهێنانی خۆم بوو (ڕەوڕەوی مێژوو) ئەوش بوو بەهۆی ئەوەی کە ئەمن و موخابەرات چاویان لەسەرم بێت.

ئەوە بوو دوای ئەوە (بەهاری دزراو) پێشکەش کرا من دەوری ڕۆستەمی نەوت فرۆشم (١١) ڕۆژ بینی لە ناوەندی سەلاحەدین خوا لێخۆش بوو مامۆستا لەتیف حامد ئەو بەڕێوبەر بوو ئیتر بەهۆی ناکۆکی و ناخۆشی لەنێوان من و مامۆستا سەلمان فایەق ئەوە بوو من بۆ تەلەفزیۆن نەڕۆیشتم مامۆستا جیهاد دڵپاك ڕۆیشت دەوری ڕۆستەمی نەوت فرۆشی بینی بەڵام خەڵکی ئەیان زانی دەورەکەی من چۆن دەورێك بوو چۆن دەورێکی ڕۆستەمی نەوت فرۆشم بینی چ هەرایەکی نایەوە.

لە شانۆدا پەروین محەمەدمان هەبوو دوایی عالیە مان هەبوو عالیە ئەحمەد ئەمانە توانیان کارێکی گرنگ و چاك لە تەمسیلی و شانۆگەری هەبێت هەر ئەوە نەبوو بەس بۆ ئەوەی بوونیان هەبێ نا پەروین و عالیە دەوری باڵایان گێڕاوە لە بابەتەکانی نواندن کردنیش بۆ شانۆگەری کوردی، من بۆیە ئەڵێم سەردەمی ئێمە یان سەردەمی ئەو کە سەلمان فایەق دەرهێنەر بوو ئێمە ئەکتەر بووین تیایدا ئەتوانم بڵێم سەردەمی زێڕینی دراما و شانۆی کوردی بوو.

بە تایبەتی کە (کچەلاڵە)کەمان پێشکەش کرد لە ناوەندی ١١ ئادار هاوین بوو لە بیرمە لە ساڵی ١٩٧١ خەڵك وا لەگەڵمان هاندەر بوو وا لە گەڵمان هاتبوونە پێشەوە ناوێتەی ناو شانۆگەرییەکە بوون وایان ئەزانی ئێمە بەڕاستی ئەو کەسانەین، من کە دەوری باش حەماڵم ئەبینی کە فەردە ئاردەکانم یان هەندێ شتم ئەگواستەوە تەنانەت وایان ئەزانی حەماڵی ڕاستیم وتی کاکە تۆ لە چ شوێنێك حەماڵی؟ وتم بۆ وتی وەڵڵا ئەوەندە جوان شتەکان ئەهێنی و ئەبەی وەرە بۆ ئێمەش ئیش بکە من مەمنونت ئەبم چیت ئەوێ ئەدەمێ یانی خەڵك ئەوەندە لەگەڵمان بوو کە تێکەڵ ببوو لەگەڵمان بەڵام لەهەمان کاتدا هاندەربوون کە بە شەویش پێشکەشمان ئەکرد هەر ئەهاتن خەڵك لەگەڵمان بوو خەڵکێکی چاك بوو بۆ ئەو سەردەمە ئەڵێم سەردەمی ساڵی (١٩٧١) کە خەڵك ئەیان وت شانۆگەرییە خەڵکی گەڕەك هەموو ئەچوون بۆی هەندێ جار لە شوێنی ترەوە بۆی ئەهاتن تەنانەت جێگا نەدەما سەر دیوارەکان پڕ ئەبوو بۆ سەیرکردن خەڵکی وا هەبوو ئەگەر شانۆگەرییەکە سەعات شەش پێشکەش بکرایە ئەوە لە سەعاتی چوارەوە خەڵك لەسەر کورسییەکان دانیشتبوون جگە لەوەی پێشوازییەکی گەرمیان لێمان ئەکرد.

دەرگای کۆمەڵەیان داخست و منیان لە شاری کەرکوك دەرکرد بەبێ هیچ هۆیەك وتیان ئەگەر بمێنی لێرە یا ئەتکوژین یا ئەگیرێت، ئەوە بوو بیانوویەکیان بۆم دۆزیەوە تەنانەت نفوسەکەشمیان نەقڵی سلێمانی کرد لە سلێمانی گیرسامەوە ئیتر لە بواری هونەری خۆم وەك دراما و وەك شانۆ وەك نووسین لە سلێمانی زیاتر پێش کەوت".

*** هونەرمەند ( جیهاد دڵپاك ) دەڵێت:**

"دوای ساڵی ١٩٦٨، دوای ئەوەی بەیانی مەکتەبی سیاسی پارتی لەگەڵ ڕژێمی ئەو کاتە توانی مافی ڕۆشنبیری بۆ کورد دەستەبەر بکات لە هەموو بوارەکان نەك تەنیا لە بواری شانۆ لە بواری شیعر لە بواری چیرۆك لە بواری مۆسیقا، وردە وردە هەموو شارەکانی کوردستانی گرتەوە دیارە کەرکوکیش لێی بەری نەبووە.

لە ساڵی ١٩٦٨ توانیمان بەهرەیەکی شانۆیی، مۆسیقی، ئەدەبی لەو کاتە دروست بکەین، بوونی گۆڤار هاتە ئاراوە، شانۆگەری و ئەوانە پێشکەش ئەکرا.

بەڵام قوناغی دووەم لە ساڵی ١٩٦٨ بۆ ١٩٦٩ قۆناغی وەچەرخان بوو لە شانۆ لە کوردستان بەگشتی و لەکەرکوك بەتایبەتی ئەگەڕێتەوە سەر ساڵی ١٩٧٠ دوای دەرچوونی بەیانی ١١ ئازارو دانان بە مافی ئۆتۆنۆمی بۆ گەلی کورد ئەمە زیاتر بواری ڕۆشنبیری و هونەری ڕەخساند بۆ گەلی کورد، ئازادیەك پەیدا بوو لە هەموو کوردستان دیارە لە کەرکوکیش لەو دەمانەدا، ئەوانەی کە زۆر ڕۆڵیان هەبووە لە شاری کەرکوك مامۆستا سەلمان فایەق یەکێك بووە لەوانەی لە بواری شانۆ بەزمانی کوردی پێشکەش ئەکردو بەزمانی عەرەبیش پێشکەشی ئەکرد، یەکێك بوو لەوانەی زۆر چالاك بوون و مەهدی ئومێد بیرمە ئەو لە لاوان کاری ئەکرد هەرچەندە ئەو کاتە تیپی مۆڵەت دراو نەبوو بەڵام ئەو تیپە هەبوو بەناوی مەشخەڵ ئەم تیپە بۆ نموونە ڕێکخراوەکان دروستیان ئەکرد حیزب دروستیان ئەکرد ئەوە نەبوو سەر بە وەزارەتی بێ یان سەر بە دامەزراوێ بێ ئەمەش لە ئاهەنگ و بۆنەکان شتەکانیان پێشکەش ئەکرد.

جیهاد دڵپاك

لەو زەمانەدا ئەو کادرانەی کە زۆر گران بوون و چالاك بوون و ئیشیان ئەکرد لە شاری کەرکوك یەکێك لەوانە مامۆستا (سەلمان فایەق) بوو کە ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو بەڕاستی لەبەر ئەوەی تاکە کەس بوو دەرچووی پەیمانگای هونەرە جوانەکان بوو، بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی بەرهەمی پێشکەش ئەکرد لە چالاکی قوتابخانەکان یان هەندێ جار لە ڕێگەی ڕێکخراوەکان، بۆ نموونە لە ساڵی ١٩٧٠ بیرمە لە یەکێتی قوتابیان ئەوکاتە من و عەلی کەریم ئەندامی لق بووین لەیەکێتی قوتابیان لەگەڵ جەلیل زەنگەنە هاتبوو وتی ئەمەوێ بەرهەمێ پێشکەش بکەم ئێوەش یارمەتی بدەن منیش زۆر حەزم لە شانۆ بوو وە توانیمان پێشکەشی بکەین کە یەکەمین بەرهەممان پێشکەش کرد بەناوی (کچە لاڵەکە) ژیانی کچە لاڵەکە کە لە هەردوو شاری کەرکوك و هەولێر نمایش کرا.

لە کەسە دیارەکان کە لەو بوارە ئیشیان ئەکرد مەهدی ئومێد بوو لە یەکێتی لاوان ئیشی ئەکرد زیاتر مەهدی ئیشەکانی بە شانۆی گۆرانی یا شێوەی ئۆپەریەتی لەگەڵا تێکەڵاو بوو.

بەڵام یەکێك لەوانەی توانی بەڕاستی تەئسیرێکی گەورە بکات هەوڵ و ماندووبونی کەسێکە خۆمان بە قەرزار باری ئەزانین وە شارەکە خۆی بە قەرزار ئەزانێت (جەمیل جێماو) بوو ئەگەر کادرێکی ئەکادیمی نەبوو بەڵام کەسێکی ئارەزوومەندو حەزوو عەشقی بەرهەمی شانۆ بوو هەوڵێکی زۆری جدی دا بۆ هاتوو چۆکردن تاکو توانی بێت بۆ سلێمانی و بتوانێ لقێکی کۆمەڵی هونەری وێژیی کوردی بگوازێتەوە بۆ کەرکوك.

تەبعەن ئەو کۆمەڵەیە دەستەیەکی ئیداری ئەوشتانەش زیاتر بە بەرنامە ئەبێ وە توانیمان لەو بوارە لە بواری دراما لە بواری شانۆ کۆمەڵێ بەرهەم پێشکەش بکەین لەوانە (بەهاری دزراو) کە لە ساڵی ١٩٧٢ (مەرەزە) ساڵی (١٩٧٣) وە شانۆگەری (١، ٢، ٣) کە لە چەمچەماڵ و لە ڕۆژێکدا چەند جارێك نمایش کرا لەو شانۆ گەریانەش کە بیرم بێ لە ساڵانی (١٩٧٠- ١٩٧٢) من لەگەڵ سەلمان فایەق کە دەورم بینی دەوری کاوەی ئاسنگەر لە شانۆگەری (کاوەی ئاسنگەر)، هەروەها دەوری شێرکۆم بینی لە (برسێتی) جەلیل زەنگەنە لەگەڵما بوو، هەروەها لەو سەردەمانەدا فازڵ جاف چونکی وەك ئەکتەرێکی دیاری کراو وەکو دەرهێنەریش کاری ئەکرد شانۆگەرییەکی تەقدیم کرد بەناوی (سەری گلۆڵەکە) هی یوسف عانی لە ڕێگەی تیپی وەرزشی سۆلافەوە.

لە کاتێکدا لە سلێمانی زۆربەی کوڕ دەوری ئەبینی یان دەوری ئافرەتی ئەبینی زۆر کەس هەبوو کە ئەو دەورانەیان ئەبینی وەك تاها خەلیل و عومەر چاوشین.

(پەروین و عالیەو ژیان) لە کەرکوك نەك هەر هاوبەشی یەکن بەڵکو ڕۆڵی سەرەکی ئەبینی دایکی شەهید کە هێنامان بۆ سلێمانی دوو کەس بوو ئافرەتێك و گەنجێ یانی بووە هۆی دەنگدانەوەیەکی گەورەی خولقان چۆن لە شانۆی کوردی ئافرەتێك هەیە بەو جورئەتەو بەتوانایە یەعنی کەرکوك لەو بوارەدا دەوڵەمەندە بەڵام ئەڵێی چی وەزعە سیاسیەکە لە بەرژەوەندی نیە.

من پێم وایە ئەم وەزعە سیاسیە نەبوایە کەرکوك دەبووە پێشڕەوی شانۆی کوردی، چونکە ئەگەر سەیری کادرەکانی بکەین یانی کەرکوك لە (سەلمان فایەق، فازڵ جاف، جەلیل زەنگەنە، عەلی کەریم، جیهاد دڵپاك، حوسێن میسری، مەهدی ئومێد) ئەوانە زۆربەیان خەڵکێکی دیارن لە شانۆی کوردی، بەڵام ڕژێم زۆر بە مەترسیەوە سەیری ئەوەی ئەکرد هەوڵیدا هیچ سیمایەکی ڕۆشنبیری و هونەری لەو شارەدا نەهێڵێت و تەعریب و زۆربەی شاعیران و چیرۆك نووسانی ئەو شارەش شارەکەیان بەجێ هێشت شێوەکاران بەجێیانهێشت (میدحەت کاکەیی، ئاری بابان، حوسام حەکیم) هەموو ئەمانە شارەکەیان بەجێهێشت".

**- هونەرمەند (عەبدولعەزیز سابیر) دەڵێت:**

"ساڵی ١٩٧٠ دەستمان کرد ویستمان هەموو ئیشێکی شانۆی دابنێین بۆ ئەوەی کارە هونەرییەکان پێشکەش بکەین لەو بوارەدا من پەنام بردە بەر کۆمەڵی هونەری وێژەیی کوردی ئەو کاتە کۆمەڵی هونەری وێژەیی کوردی تازە دروست کرابوو چەند کەسێك بووین لەوانە من و جەمیل جێماو و شێخ کەریم و ئەحمەد عەبدولڕەحمان و دەروێش سەعدی و چەند برادەرێکی تر، لە حەلەویات جەوهەرەی ئێستا بووین کەس یارمەتیمانی نادا کەس پارەی نادا پێمان هەر لەسەر دەستی خۆمان بوو.

شانۆگەری (دڕك و داڵ)مان ئامادەکرد سەرەتا کە دەستم پێ کرد دوای ئەوە (ئۆپەریەتی شەهید)مان کرد دوا ئەوە (گوڵکۆی تازە)مان کرد لەگەڵ مستەفا محێدین خوا لێخۆش بێت بەرهەمی زۆرمان ئامادەکرد.

مرۆڤ ئەبێت ئەو مەوقیفانەی مەهدی ئومێدی لەبیر نەچێ چونکە هونەرمەندێکی بە ئەزموون بوو هونەرمەندێکی دڵ ساف بوو هونەرمەندێکی لێهاتوو بوو بەبێ هیچ چاوەڕێ کردنی لە کەسێك ئەم کارانەی ئەکرد نزیکەی (٢٠- ٢٥) شانۆگەریم لەگەڵا ئامادەکردبوو هەموو نووسینی خۆی بوو دەرهێنانی خۆی بوو یانی ئەو ئەکتەرانەی کە پێکەوە کارمان ئەکرد هەموو وەك برا وابووین شەوی وا هەبوو ئەمانەوە ناڕۆشتینەوە بە (٢- ٣) شەو ئەمانەوە هەر پرۆڤەمان ئەکرد ئەوانەی کە لەگەڵماندا بوون سەباح جیهاد، عیسا تۆفیق، سیروان کەریم، سیروان جەباری و هەندێ ئافرەتیش هەبوو.

هەرگیز ئەو یادگاریەم بیر ناچێتەوە لە ساڵی ١٩٧٢ ئێمە شانۆگەری کاوەی ئاسنگەرمان پێشکەش ئەکرد لە چەمچەماڵ، ئەوەمان زانی شاعیری گەورەی عێراقی محەمەد مەهدی جەواهیری یەك یەك هاتە لامان و قسەی لەگەڵمان ئەکرد ئەوە یەکێکە لەو یادگاریانەی هەرگیز لە بیر ناکرێت.

جەمیل جێمار وەختی سەرە مانگ هاتە پێشەوە بۆ کرێ خانوو کە خانووەکە یەك ژوور بوو گرتبومان لە قاتی سەرەوە پارەش نەبوو ئێمەش قوتابی بووین ئەوانەی تر هەر کەس فریایی خۆی نەکەوت وەڵڵا ئەو کاتە جەمیل جێماو خێزانەکەی لە ماڵەوە خەیاتی ئەکرد هەستا مەکینەکەی فرۆشت بۆ کرێی بارەگاکە".

* **هونەرمەند ( عەلی کەریم ) دەڵێت:**

"گرنگترین و دەوڵەمەندترین قۆناغ ئەتوانم بڵێم قۆناغێکی چالاکیو بەبەرهەمو دەوڵەمەندو بەپێز قۆناغی دوای رێککەوتنامەی ١١ ئازارە، لەم قۆناغە جگە لەوەی کە دەرهێنانی شانۆیی لە رووی هونەرییەوە بەبەرهەم ئەهێنرا لەهەمان کاتدا یەکێك لەو دەرهێنەرانە کە (مامۆستا سەلمان فایەق) بوو ئێستا دکتۆرای وەرگرتووە لە بواری سینەما ئەو بەرهەمە شانۆییەکانی بەپێز تربوونو جوانتر بوون زۆر جار لە فیستیڤاڵەکانی ئەو دەمە خەڵاتی یەکەمی بەدەست ئەهێنا ئەو شانۆگەریانەی کە مامۆستا سەلمان کاکەیی پێشکەشی کردوون هەر دوای رێککەوتنامەی ١١ ئادار شانۆگەری دایکی شەهیدی پێشکەش کرد ئەو شانۆگەرییە دوای ئەوەی کە رۆژانێکی زۆر لە کەرکوك پێشکەش کرا هێنرا بۆ شاری سلێمانی لەوێ پێشکەش کرا دەنگو سەدایەکی زۆری هەبوو یەکێك لە هونەرمەندە ناسراوەکان کەبەشداری ئەکردو نواندنێکی جوانی پێشکەش ئەکرد هونەرمەند (دکتۆر فازڵ جاف) بوو، کۆمەڵێ هونەرمەندی کەشیان لەگەڵا بوو راستییەکەی ئەگەر بەهەڵا نەچوویم دیسانەوە بەپێی زانیارییەکان پێم گەیشتوون، کچێکیان لەگەڵا بوو ناوی (پەروین) بوو جگە لە (دکتۆر فازڵ جاف) برایەکی کەیان لەگەڵا بوو ناوی (غەفوور عوزەیری) لەگەڵ کۆمەڵێ کەس بەشداریان کرد لە شانۆگەری دایکی شەهید دایکی شەهید بۆ خۆی و بۆ ئەو سەردەمە نەك هەر بۆ شاری کەرکوك بگرە لەسەرتاسەری کوردستان یەکێك بوو لە شانۆگەرییە جوانەکان کە جێی سەرنجی خەڵك بوون.

ئەم شانۆگەرییەمان زۆر پێشکەشکرد ماوەیەکی زۆر لە کەرکوك لەسەر شانۆی ١١ ئادار کە ئەکەوێتە گەڕەکی ئیمام قاسم دواتر بردمانە هەولێر پێشکەشمان کرد منو جیهادو جەلیل لەو بەرهەمە بەشداریمان هەبوو جەلیل دەوری سەرەکی هەبوو لەگەڵ برادەرێك خوا لێیخۆش بێت ناوی (ئازاد) بوو دەورەکانی منو جیهاد کورت بوو چونکە سەرەتای ئیش کردنمان بوو لەو بوارە وەك وتم لەشاری هەولێر پێشکەشمان کردوو جەماوەرێکی زۆری هەبوو خەڵك بەدڵی بوو بەتایبەتی لەشاری کەرکوك هەموو ئێوارەیەك کە پێشکەشمان ئەکرد خەڵکێکی زۆر ئەهات بۆ بینینی شانۆگەرییەکە ئەگەر بەهەڵا نەچوویم دووجار لە کەرکوك پێشکەشمان کرد لە دوو کاتی جیاواز.

لە دوای ١١ ئادار مەهدی ئومێد یەکێك بوو لەو هونەرمەندە چالاکانەی کە لە دوو بواردا کاری ئەکرد یەکەمیان وەك نووسین هەموو ئەو بەرهەمانەی کە پێشکەشی کردوون لە نووسینی خۆی بوون یانی دەقەکانی شانۆ لە نووسینی خۆی بوو ئەوانەشی کە بیرم بێت (کۆتایی دەرەبەگ، گومەزێك لە دووکەڵ) لە رۆژگاری تێك چوونی بارودۆخی سیاسی لەنێوان هێزی پێشمەرگەو رژێمی ئەوسا، بەشداری کرد لە فیستیڤاڵی یەکەمی هونەری کوردی لە بەغدا.

بە شانۆگەری (گومەزێك لە دووکەڵ) هەردوو هونەرمەند واتا مامۆستا سەلمان کاکەییو هونەرمەند مەهدی ئومێد

**عەلی کەریم**

بەردەوام بوون لە ئیشکردن لەبواری شانۆی کوردیدا ئەو تیپەی کە مامۆستا سەلمان فایەق ئیشی تیا ئەکرد ناوی (تیپی مەشخەڵ) بوو، کە راستەوخۆ پەیوەندی هەبوو بە لقی (٣)ی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئەو دەمە، مەهدی ئومێدیش زیاتر لە رێکخراوەکان ئیشی ئەکرد، بەرهەمە شانۆییەکانی کە پێشکەشی ئەکرد لە بۆنەو موناسەباتەکانی ئەو دەمە زیاتر بۆ یەکێتی قوتابیانو یەکێتی لاوانو ژنانو مامۆستایان بوو.

هەر لەو دەمە دوای دامەزراندنی کۆمەڵی هونەری وێژەیی کوردی لە سلێمانی وەك مەڵبەندی گشتی هونەرمەندی خوالێخۆش بوو جەمیل جێماو پەیوەندی کرد بە مەڵبەندی کۆمەڵی هونەری وێژەیی کوردی لقێکیان کردەوە لە کەرکوك بە بیریشمە یەکەم جار بارەگای ئەم کۆمەڵەیە لەگەڕەکی شۆڕیجەی شاری کەرکوك بوو دواتر ئێمەش پەیوەندیمان بە کۆمەڵی هونەری وێژەیی کوردیەوە کرد منو هونەرمەند جیهاد دڵپاكو جەلیل زەنگەنەو دکتۆر فازڵ جافو عەبدولرحمان مەلا سەعیدو عەبدوڵڵا خدر پشدەریو عەبدولرحمانی برای، ئێمە هەموومان چووینە ناو کۆمەڵو کۆمەڵیشمان هێنایە ناو شار.

ئەوە بوو لە رێگەی کۆمەڵی هونەری وێژەیی کوردییەوە چەندین کاری شانۆیی کوردیمان پێشکەش کرد بیرمە یەکێك لەو شانۆگەریانەی کە پێشکەشمان کرد لەیادی جەژنی نەورۆز بوو ئەو دەمە جەژنی نەورۆز لەنێوان بانی مەقانو

چەمچەماڵدا بوو ئاهەنگەکانی جەژنی نەورۆزو جەژنەکانی سەرهەڵدانی شۆڕشی ئەیلول دەگێڕدرا.

لەوێ بۆ یەکەمین جار شانۆگەرییەکمان پێشکەش کرد ئەوانەی کە لەگەڵمابوون ئێستا ناویانم لە بیر نیە بەڵام ئەوەندە ئەزانم سێ جار لەیەك ڕۆژ ئەو شانۆگەرییەمان پێشکەش کرد، جارێکیان لە سەربانی ماڵێك، جارێکیان لەسەر شەقامە گشتییەکە، جارێکیشیان لەناو خەڵکی ئاهەنگ گێڕانەکە کە ئاهەنگیان ئەگێڕا وتنی گۆرانیو وتارو دواتر یەکێك لە برگەکان ئەم شانۆگەرییە بوو کەناوی (١، ٢، ٣) بوو من دەوری سەرەکیم ئەبینی هەر بۆ یاد کردنەوە حەز ئەکەم ئەوەش بگێڕمەوە لەبەر ئەوەی دەنگم نەئەگەیشتە هەموو جەماوەر بە بیرما ئەهات لەسەر شانۆ بچمە خوارەوە دیالۆگێکی زۆر درێـژم هەبوو دیالۆگەکەشم ڕاستەوخۆ ڕووبــەڕووی خەڵك بوو چوومە خــوارەوە بۆ ناو خەڵکی ئاهەنگ گێڕانەکە بیرمە ئەو کاتەی من ئەدوامو دیالۆگەکەی خۆم ئەوتەوەو وەك کارەکتەرەکەی خۆم گوێم لێی بوو ژنێك وتی ئەیەڕۆ ئەو پیاوە شێت بووە.

لە ژێـر ڕێنماییو کاریگەری فـەرەیـدون عەبدولقادرو خوێندنەوەی خۆمان هەوڵماندا شتێك پێشکەش بکەین کە دوو چین، چینی کرێکارو چینی جوتیار یەك بگرن بۆ تێپەڕاندنی قۆناغی ڕزگاری نیشتیمانی کەواتە بەڕێوبەری کرێکاران لەگەڵ جوتیاران ڕاپەڕینێك دژ بە دەسەڵاتی ئەو دەمە بۆ تێپەڕاندنی قۆناغی ڕزگاری نیشتیمانی بەشێوەیەکی گشتی ئەمە بیرۆکەی ئەو شانۆگەرییە بوو.

دەورە سەرەکییەکە منو هونەرمەند جیهاد بووین بیرمە ئەوانەی لەگەڵمان بوون عەبدوڵلا پشدەری بوو عەبدولڕحمانی برای بوو کە دەورێکی جوانی بینی هەروەها عەبدولڕحمان ڕەوانـدوزی هەبوو ئەویشمان لەگەڵ بوو خێزانەکەشیمان لەگەڵ بوو خوالێخۆشبوو جەمیل جێماو ئەمانە هەموویان بەشداریان کرد لە شانۆگەرییەکە بەڕاستی جێی خۆی کردەوە ئێمەش زۆر بە دڵ خۆشیو سەربەرزی هاتینەوە شاری کەرکوك کە توانیمان لە ڕووداوێکی گەورەی ئاوها هەموو خەڵاتەکانی فیستیڤاڵەکە بۆ خۆمان بەدەست بهێنین.

(بەهاری دزراو) لە ساڵی ١٩٧٢ بوو چونکە دوا بەداوی ئەوە بردمان بۆ تەلەفزیۆنی بەغدا لەوێ تۆمارمان کرد جاری یەکەم دەوری کارەکتەری یەکەمو سەرەکی هونەرمەند جەلیل زەنگەنەم بینی بەڵام جاری دووەم بۆ تەلەفزیۆن هونەرمەند جیهاد دڵپاك بوو لەجاری یەکەمدا منو هونەرمەند جیهاد دڵپاك تیانەبووین بەڵام وەك تۆمار کردنی تەلەفزیۆنی ئەوانە کە بیرم بێ بەشداریان تیا ئەکرد من بووم، جیهاد دڵپاك بوو گەنجێکی تر هەبوو ناوی یادگار محەمەد بوو لەگەڵ برادەرێکی دیکە ناوی قاسم عەلی بوو کە دەوری ژنەکەی ئەبینی.

ئەوەنـدەی ئافرەتو ژن کۆبیونەوە لـەدەوری شانۆی کوردی لە کەرکوك (٢-٣) جار بەقەدەری شارەکانی تریوو یانی شانۆگەری پێشکەش کراوە بە ناوی (تێکۆشانی ئافرەت) ئەگەر بەهەڵە نەچووبم هی مەهدی ئومێد بوو لەسەر هۆڵی (بەهوبەلەدیە) هەموو ئەکتەرەکانی کچ بوون زۆربەی ئەکتەرەکانی کۆتایی دەرەبـەگ کچ بوون ڕاستە لەتۆمار کردنی بەهاری دزراو ئێمە تووشی شکستی بووین لە دۆزینەوەی کچ، کچ ئەهات بۆ بەشداری کردن لە شانۆ بەڵام نەئەهات بۆ بەردەم کامێرا ئەوەبوو بەهاری دزراو لەکاتی وێنە گرتنا قاسم کە دەوری خێزانەکەی ڕۆستەمی نەوت فرۆشی ئەبینی ئەگینا بۆ شانۆ هەرگیز بێ کچ نەبووین یان ئەگەر کچێك بەشداری لەگەڵمان بکردایە کچەکە نەخۆش بکەوتایە یان سەفەری بکردایە یان نەهاتایە بەئاسانی کچێکی کەمان دەست ئەکەوت بەشداریمان لەگەڵ بکات واتا بەشێوەیەکی گشتی لە شاری کەرکوك ڕۆڵـی ژنانو کچانی کەرکوك لە نمایشی شانۆیی ڕۆڵێکی گرنگیان هەبوو نابێ لەبیر بکرێتو دوای ئەوەندە ساڵە من دەست خۆشیان لێ ئەکەمو دەست خۆشی بۆ هەموو ئەو ژنانەی کە بەشداریان کرد لەبەرهەمە شانۆییەکانمان.

لـە کۆتایـی قۆنـاغی دوای ڕێککەوتنـامـەی ١١ ئـادار گەورەترین فیستیڤالی هونەری کـوردی لە بەغدا سازدرا ئـەوەنـدەی بـزانم بەپێی دەلیلی کە هەم بوو چـوارده تیپی کـوردی لە هەموو کوردستان هـەر لە زاخۆ هەتا خانەقین بەشداریان کرد لەو فیستیڤاڵەی کە لە بەغدا سازدرا.

لە ساڵی ١٩٧٤ لەو کاتەی کە نێوان هێزی پێشمەرگەو ڕژێم لە لوتکەی ناخۆشی بوو ئەو فیستیڤاڵە لە بەغدا سازدرا لەکەرکوکەوە دوو بەرهەم بەشدارییان کرد یەکێکیان هی یەکێتی لاوانـی دیموکراتی کوردستان کە دەرهێنەرەکەی مەهدی ئومێد، بەرهەمی هێنابوو ناوی شانۆگەری (گومەزێك لە دووکـەڵ) بـوو، هـەروەها تیپەکەی ئێمەش کە کۆمەڵی هـونـەری وێــژەی کـوردی بـوویـن بەشانۆی (تـەقینـەوە) لە ئامادەکردنی بەندە یەکەمین ئەزمونیشم بوو لە نووسینا بـەڵام مامۆستا سـەلمـان کاکـەیـی یـارمـەتـی زۆری دام لە داڕشتنی دیالۆگەکە ئەم بەرهەمە لەو فیستیڤاڵە گەورەیە کە بە چاودرێری سەرۆك کۆماری ئەو کاتە بوو ئەحمەد حەسەن بەکر ڕۆڵێکی گرنگی بینی دەنگو سەدایەکی زۆری هەبوو کاتی دابەش کردنی خەڵاتەکان هەموو خەڵاتەکانی شانۆی کوردی بەدەست هێنا باشترین ئەکتەر من بووم باشترین دەق من بووم باشترین دەرهێنەر مامۆستا سەلمان کاکەیی بوو باشترین بەرهەم کۆمەڵی هونەری وێژەیی کوردی بوو.

خەڵکێکی زۆر ئەهات بۆ دەست خـۆشیو پیرۆزبایی کردن لێمان ئەتوانم بلێم بوو بەڕووداوێکی هونەری لەناو فستیڤاڵەکە وەك چۆن دواتر بە ١-٢ ڕۆژ واتا چەند سەعاتێك شـانـۆی سیاسی کوردستانیش تـەقیـەوە، تەقینەوەیەك لەبواری هونەر تەقینەوەیەك لەبواری سیاسی ئەو دەمە منو جیهاد لەناو شاشەکانی کۆمەڵی ماکسیمیلی کوردستان کـارمـان دەکـرد لەکەرکوك کە ئەکاتە سـەرەتـای کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان.

شانۆگەری تەقینەوە کە لە فیستیڤاڵی یەکەمی هونەری کـوردی پێشکەشمان کرد بـوو، یەکەمین جار بوو گرتەی سینەمایمان لەناو شانۆگەرییەکە نمایش کرد لەسەر ئاستی کوردستان یەکەمین ئەزموون بوو لەو چەشنە.

دوای شکستی شۆڕشی ئەیلول دەست کردن بە پرۆسەی

تەعریب کردنی کەرکوك ئێمەی هونەرمەندان زۆربەمان بەر شارەکانی تر کەوتین، سلێمانیو دهۆکو هەولێر بەڵام منو جیهاد دڵپاکو جەلیل زەنگەنەو مەهدی ئومێد لەهەولێر توانیمان، دکتۆر فازڵ جافیش تاڕادەیەك لە سلێمانی جێی خۆمان بکەینەوە بەبەشداری کردن لە زۆربەی بەرهەمە شانۆییەکانی تیپی نواندنی سلێمانیو هەروەها بەرهەمە درامایەکانیش ئەو نمایشانەی کە پێشکەشمان ئەکرد ئێمەش بەشداری گرنگمان تیا هەبوو (دکتۆر پالمێ) دەرهێنانی جیهاد دڵپاك نواندنی من لەگەڵ کۆمەڵێ هونەرمەندی تری سلێمانی، (مانگی ئاوا بوو) دەرهێنانی جەلیل زەنگەنە چەندین نمایشی شانۆی دەرهێنانی حوسێن میسری چەندین نمایشی کە ئێمە وەك ئەکتەر ڕۆڵمان تیا بینیوە منو جیهاد دڵپاك بەتایبەتی وەك ئەکتەر گرنگی خۆی هەبووەو توانیومانە شانۆی کەرکوك بەردەوامی پێی بدەین بەڵام لەناو کەرکوك نا لە دەرەوەی".

*** هونەرمەند ( مەحمود گلی ) دەڵێت:**

"یەکەم کارم کە من دەستم پێکرد شانۆیەك بوو بەناوی (بەهاری دزراو) کە بە شانۆ پێشکەش کرا لە ناوەندی شۆڕیجە، سەلاحەددین برادەرێکی تر دەوری دەورەکەی منی بینی دەوری نۆك فرۆشی، ئیتر بۆ تەلەفیزیۆن من خۆم دەورەکەم بینی بەڕاستی ئەو کاتە واستەیان ئەکرد بۆ وەرگرتنی بیتاقە جمهورێکی چاکمان هەبوو.

لە ساڵی (١٩٧٤) بیستو پێنج ڕۆژ پێش فیستیڤاڵەکە ئێمەیان ئاگادار کردەوە بۆ شانۆگەری (تەقینەوە) پێشکەش بکەین شانۆگەری (تەقینەوە)ش دکتۆر سەلمان وەتی چی بکەین بیست ڕۆژ ماوە، وتی کاکە شەوو ڕۆژ پرۆڤە ئەکەین ئەو کاتە ئەو رۆحیەتە هەبوو.

بەو بیستو پێنج ڕۆژە کە چووینە بەغدا لەوێ لە فندق جوندیان خەوتین لەوێ ئەو شانۆگەرییەی (تەقینەوە)مان پێشکەش کرد بەڕاستی ئێمە لەو بڕوایە نەبووین کە باشترین دەقو دەرهێنەرو باشترین ئەکتەر مامۆستا عەلی کەریم بوو ئەویش هەر لە شانۆگەری (تەقینەوە) بوو.

*** هونەرمەند ( مەهدی ئومێد ) دەڵێت:**

"سەردەمێکی زۆر زێڕین پڕ لە چالاکی بوو ئەگەر شانۆی کوردی لە کەرکوکدا وەکو خۆی بمایەتەوە لەو بیروڕایەدام کەرکوك ئەبوو بە سەنتەرێکی باش بۆ پێش خستنی شانۆی کوردی، من ناتوانم بڵێم پێش حەفتاکان شانۆ لە کەرکوکدا چۆن چۆنی بووە، هەڵبەتە هەبووە بەڵام واتێدەگەم لە قوتابخانەکان ئەگەر هەبووبێ چەند کەسایەتیەکی سیاسی لە بۆنەکان لە نەورۆزدا شتێکیان کردبێ، من سەردەمی منداڵیشم لە بیرمە خەڵکانێك هەبوو کە شێوە جموجۆڵێکی کۆمیدیان هەبووە وەکو (مستەفا، برا گەورەکەمان حوسێن) ئەمانە خەڵکانێك بوون توانایەکی هونەریان هەبوو بەڵام پەروەردە نەکرا شانۆ خۆی لەخۆیا سرووشتی شانۆ ئەبێ پەروەردە بکرێت هەر ئەوە نیە کە تۆ حەزی لێ ئەکەیو بتوانی نمایشێ پێشکەش بکەی بەڵام پەروەردەی بکەی تا ئەگاتە ئاستی ئەکادیمیانە.

ئەم ڕێککەوتنە خۆی لەخۆیدا ئازادییەکی هێنا جگە لە ئازادییەکە خۆشییەکی هێنا بۆ گەل جگە لە خۆشییەکە ئەوەی هێنا کە کوردایەتیو کورد پەروەری کەرکوك بوونی وەك شارێکی کوردستانی ئەمانە هەموو وای لە خەڵکی ڕۆشنبیر ئەکرد ئەبێ ئێمە جموجۆڵمان لە خەڵکەکە زیاتر بێت ئێمە خۆمان بچەسپێنین ئێمەین خاوەنی شاری کەرکوك.

لە شاری کەرکوکدا لەسەرەتایی حەفتاکانەوە جموجۆڵی هونەری ئیتر لەبوارەکانی مۆسیقا لەبواری شانۆ لەبواری ئەدەب بە گشتی شیعری کوردی هونەری ئەمانە هەموو هۆیەك بوون بۆیی کە کۆمەڵگای کوردەواری لە شاری کەرکوکدا مانگانە لە هۆڵەکاندا یەك ببینن لە موناسەباتەکان یەك ببینن.

تیپەکەی ئێمە لەگەڵ مەشخەڵ جیابوونەوە ئەم مەشخەڵە بۆ خۆی ئیشی ئەکرد ئێمەش بۆ خۆمان ئیشمان ئەکرد ئەو کاتە سێ سەنتەرمان هەبوو ئەوەی ئەتوانێ باسی شانۆی لێ بکەی یەکێتی لاوان چالاکیمان زۆر بوو ئێمە لەو کاتەدا توانیمان کۆمەڵێ ئۆپەرێت بکەین، ئۆپەرێتی شانۆی ئاهەنگ ئامێز یەکێ لەوانە (ئۆپەرێتی کرێکار، ئۆپەرێتی کوڕیەکەم) کە خانمی هونەرمەند (سەعدیە) دەوری تیا بینی کە خۆی براکەی شەهید بوو لەبەر ئەوە دەورەکەی بینی چەندەها جار ئەم بینی ئەگریا لەسەر شانۆ یادی براکەی ئەکردەوە، هەڵبەتە ئەو کارانە هەموو خەڵکی نەك تەنها بێت بۆ بینینی نمایشی شانۆیی بەڵکو بە هۆی ئەوەی کە زیاتر بیسەلمێنیت کە ئێمە میللەتێکین کە شانۆ ئەتوانێ دەوری خۆی ببینێ بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆشنبیری نەتەوەکەمان.

یەکێتی لاوانی دیموکراتی کوردستان کە کۆمەڵێ لاوی لە خۆ گرتبوو سەنتەرێکی ڕۆشنبیری بوو سەنتەرێك بوو بۆ نمایش کردنی شانۆگەری مانگانە ئەتوانم بڵێم ئێمەی لاوان،

مەهدی ئومێد

نمایشی شانۆمان هەبووە هەمووکات پرۆڤە هەبووە جگە لەوە تیپی مەشخەڵ پەیدا بوو، هەروەها کۆمەڵی هونەری وێژەیی کوردی یادی بەخێر جەمیل جێماو توانیمان پێکەوە ئیش بکەین من لەو بڕوایەدام یەکێکە لەو کەسانەی ئەبێ لەبیر نەکرێ.

بڕوام بەوەش هەیە شانۆی کوردی لەو ماوەیەدا توانی خەڵکی لە مەسەلە نەتەوایەتییەکان نزیك بخاتەوە، نمایش کردنی شانۆ ئەگەر شانۆگەریمان هەبووایە لە دە ڕۆژ کەمتر نابوو نمایشکردنمان ئەبوو دوو هەفتە پێش ئەوەی شانۆکە نمایش بکرایە ئەبوایە تیپێکی مۆسیقا ئەهات هونەرمەندێکی ئەهێنا گۆرانی ئەوت.

لەگەڵ جەمیل جێماو بەڕەحمەت بێ ئێمە شانۆگەرییەکمان شانۆگەری (کەباب خانەی خولە شەل) لەگەڵ (ئۆپەرێتی شەهید) لە شۆڕیجە نمایشمان کرد هاوین بوو لە یەکێك لە مەکتەبەکانی شۆڕیجە هەر لە دەرەوە پێشکەشمان کرد، زۆربەی شانۆگەرییەکانمان بێجگە لە بەهوبەلەدیە پێش کۆتایی دەرەبەگ، دایکی شەهید نمایش کرا، فازڵ جاف دەوری تیابینی پاش ئەوە کۆتایی دەرەبەگ بەڵام دوای ئەوە ئێمە نەمان توانیوە لە بەهوبەلەدیە شانۆکانمان پێشکەش بکەین لەبەر ئەوەی حوکمەت نەی دەهێشت و ڕێگر بوون بۆیە ئێمە هەموو چالاکییەکانمان گواستەوە بۆ هۆڵی ئیمام قاسم.

ناوەندی ئیمام قاسم، پاشان لەوێ لە بارەگای لاوان لەوێ شانۆگەریمان نمایش ئەکرد ئەو چالاکیانەی کە ئەکران زۆربەیان ئاهەنگ ئامێزبوون، هەوڵی ئەوەشمان داوە بتوانین بەرەو شانۆی جیهانی بڕۆین ئەگەر لە بیرم بێت (دڕك و داڵ) مان پێشکەش کرد کە فەخرەددین دەوری تیا بینی خەلیل بێکەس دەوری تیا بینی هەروەها عەبدوڵڵا هەیە مۆسیقا ژەن ڕۆڵێکی باشی تیا بینی.

عالیەخان باشترین ئەکتەر بوو کەمن بیرم بێتەوە لە یەکێك لە شانۆگەرییەکانی فازڵ جاف ئیشی ئەکرد بەناوی (دوو ڕەگ) من کەبینیم توانایەکی زۆر باشم لە عالیە بینی یەعنی یەکێك بوو لەو کچە باشانەی کە لە مێژووی شانۆی کوردی ئەبێ باس بکرێ هەڵبەتە لەگەڵ ئێمە ئەکتەری باش هەبوو (سروە) هەبوو لە (گڵکۆی تازە) لەگەڵ منا کاری ئەکرد ئەکتەرێکی زۆر باش بوو (سەبریەخان و جەمیلەخان) ئەمانە بەڕاستی لە کاتێکدا هاتن کە شانۆی کوردی لەو کاتەدا پێوستی بە ڕۆڵی ئافرەت هەبوو.

ئێمە (گومەزێك لە دووکەڵ)مان پێشکەش کرد بەشداریمان کرد لە میهرەجانی هونەری کوردی لە بەغدا لەو کاتە هونەرمەندانێك ئەوانەی ئێستا لە دەرەوەن وەکو (جەلیل بێکەس، عەزیز زەنگەنە، سیروان جاف) زۆر لەو هونەرمەندانەی کە نازانم ئێستا لە کەرکوك ئیش دەکەن یان نا بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەو ماوەیە هەمووی ئەوانەی لای من ئیشیان ئەکرد کۆمەڵێ لاوی خوێن گەرم بوون.

بیرەوەری زۆرن یەکێ لەوانە شێخ بایز تاڵەبانی کە ئێستا وەزیری داراییە، ئەو کاتە ئەندامی لقی یەکێتی لاوان بوو پەیوەندی ئێمە هەموو کاتێ خۆش بووە ئەو لەگەڵ منا لە شانۆگەری ناوەکەی نازانم کە بەبۆنەی نەورۆزەوە دەوری بینی دەوری ئەژدیها یان زووحاکی بینی ئەحمەد مەلا کەریم دەوری کاوەی ئاسنگەری ئەبینی ماوەیەکی زۆر پرۆڤەمان کرد پاش ئەوە لە چەمچەماڵ ئێمە شانۆگەرییەکەمان پێشکەش کرد لەسەر شانۆ، ئەحمەد مێکوتێکی گەورەی بەدەستەوە بوو جا پێش ئەوە وتی کورە ئەحە ڕجات لێ ئەکەم بەڕاستی لێم نەدەی لەسەر شانۆ کاوە هاتە سەر شانۆ گوێم لێ بوو ئەی وت کورە ئەحە نەکەی بەقوربانە وەڵڵا ئەحە ناماقوڵی نەکرد کێشای بە زەویا.

لە کۆتای ئەو چوار ساڵەدا شانۆگەری، هەنگاوی بەرەو ئەوە ئەنا دەست بەری بۆ بەرهەمی جیهانی بەڵام لەبەر ئەوەی دوای ڕێککەوتنامەکەی ١١ ئادار کۆتایی پێ هات هەمووی لەگەڵ ئەودا کۆتایی هات".

*** هونەرمەند (نیعمەت خەیات) دەڵێت:**

"لە ساڵی ١٩٧٠ ئێمە دەستمان کردە شانۆگەری لە کەرکوك شانۆگەری نەورۆزمان پێشکەش کرد لەگەڵ دایکی شەهید لەگەڵ پێشمەرگە ئەم (٤- ٥) شانۆگەرییەمان پێشکەش کرد لە کەرکوك دەرهێنەری ئەم شانۆگەرییە مامۆستا (سەلمان فایەق) بوو کۆمەڵێ بووین ئێمە لە ئەکتەرەکان کە دەستمان کرد بە ئیشکردن لە بەهوبەلەدیە ئەم شانۆگەرییەمان (١٠) ڕۆژ پێشکەش کرد، ئەم شانۆگەرییە تیپی مەشخەڵ بوو دەرهێنەرەکەی سەلمان فایەق بوو، هەموو ڕۆژێ کچ و کوڕ پرۆڤەمان ئەکرد لە کاتی پێشکەشکردنی شانۆگەرییەکە (٤)ی ئێواران دەبوو بۆ ماوەی (١٠) ڕۆژ، دوای (١٠) ڕۆژەکە چووینە سلێمانی (١٠) ڕۆژ ئەم شانۆگەرییەمان پێشکەش کرد بینەرێکی زۆرمان هەبوو دایکی شەهید، کۆتایی دەرەبەگ ئەمانە هەموو لە سلێمانی پێشکەشمان ئەکرد.

ئەکتەرەکانیش کوڕی شەهید (فازڵ عەلی جاف)و دایکی شەهید (پەروین عەبدولقادر)، لەگەڵ ئەکتەرەکانی تریشا (فەهمی کاکەیی، غەفوور عوزێری)، (بەکر سدیق) کە ناوی (کاکە ڕەش) بوو لە دەورەکەیا و خۆم بووم (نیعمەت خەیات) دەوری (کاکە شین)ینم دەبینی.

ئیتر تیپی (مەشخەڵ) ڕاوەستا هەستاین خۆمان تیپێکمان کردەوە لە ئیمام قاسم، (کۆمەڵی هونەری وێژیی کوردی) من و چەند ئەکتەرێك جەمیل جێماو بەڕەحمەت بێ دامان نا.

لە ئیمام قاسم بەرامبەر قەڵا، جێگامان زۆر ناخۆش بوو گواستمانەوە خانویەکمان گرت لە شۆڕیجە لەوێ (١٥٠) ئەندامان هەبوو ئەکتەرمان هەبوو هەڵبژاردنمان کردوو هەر کەسەو هەقی خۆی و دەوری خۆی وەرگرت.

نزیکەی بیست کچ و بیست کوڕ بووین لە بەهوبەلەدیە لە سەعات ٤ پرۆڤەمان ئەکرد تاکو بەیانی هەر لەوێش ئەخەوتین هەندێکی ناڕۆیشتنەوە لەبەر ئەوەی شتەکە زۆر خۆش بوو ڕۆحێکی کوردیمان هەبوو دڵمان پاك بوو لە ئاستی یەکدا پرۆڤەمان ئەکرد بە دڵ و بەگیان، مامۆستا سەلمان فایەق هەرماڵی خۆی نەدەبینی هەر لەگەڵمان بوو دواتر نان خواردنمان بۆ ئەهات لە دەرەوە نانمان ئەخواردو دەستمان ئەکردەوە بە پرۆڤە هەر کەسەو دەوری خۆی وەرئەگرت و پرۆڤەی ئەکرد ئیتر بەو جۆرە بردمانە سەر.

نیعمەت خەیات

(پەروین عەبدولقادر) دەوری دایکی شەهیدی وەرگرتبوو ئەکتەرێکی زۆر باش بوو دەورەکانی زۆر بەجدی ئەهێنا (شوکریە) هەبوو (عالیە)ش هەبوو دەورێکی زۆری هەبوو بەڕاستی زیرەك بوو لەگەڵمانا هەموو کاتێ حازر بوو لە هەموو جێگایەك لە هەموو شانۆگەرییەك لەگەڵمان بوو.

چەند ساڵێك ئاوا بردمانە ڕێوە ئیتر لە کاتێکدا وەزعەکە شێواو تێکچوو بەناو یەکدا ئیتر ئێمە ترسمان لێ پەیا بوو نەختێك سارد بووینەوە لە ئیش کردنا ئیتر دوا بەدوای ئەوە لە ئەمنەوە کۆمەڵێك کەس هات دەستی خستە سەرمان وتی نابێ ئێوە ئیش بکەن لەبەر ئەوەی بۆ لایەکی تر ئیش دەکەن لەم ڕۆ بەدواوە نابێ کاری شانۆیی بکەن، ئیتر پێمانی داخست، لەو کاتەوە ئەندامانی کۆمەڵی هونەری وێژەی کوردی بڵاوەمان لێ کرد ترسمان پەیا کرد ئیتر هەر کەسێ بەلای ئیشی خۆیەوە ڕۆشتو نەمان وێرا هیچ شتێ پێشکەش بکەین، وەزعەکە گۆڕا".

* **هونەرمەند (یادگار محەمەد) دەڵێت:**

مامۆستا سەلمان فایەق ئەو کاتە دەرهێنەر بوو لە تەلەفزیۆنی کەرکوك کە تەمسیلی (بەهاری دزراو)مان پێشکەش کرد ئەویش یارمەتی داین کە بینی شتەکە جوانەو ئەنجام دێنێ. نووسینی عەدنان ئیسماعیل بوو هەستاین کۆمەڵێ لە قوتابیان لە ناوەندی شۆڕیجە دەستمان پێ کرد دوای ئەوە کۆمەڵی هونەری وێژەیی کوردی کە لە کەرکوك هەبوو ئەو کاتە لە ساڵی ١٩٧١ تازە دروست ببوو.

کۆمەڵی هونەری وێژەیی کوردی دروست بوو لە شاری کەرکوك مامۆستا جەمیل جێماو کە سەرۆکی کۆمەڵە بوو ئەو کاتە داوایان لە ئێمە کرد دوای ئەوەی کۆمەڵێ مامۆستای چاکی تیا بوو وەکو کەماڵ مەجید عەبدولڕحمان سەعید کە سکرتێر بوو داوایان لە ئێمە کرد کە ئەوانیش بەشدار بن لەم شانۆگەرییە ئێمەش لەگەڵ ئەوان بچینە ناو کۆمەڵەوە یانی شانۆگەرییەکە ببێ بە هی کۆمەڵی هونەری وێژەیی کوردی ئێمەش ڕازی بووین دواتر بۆ (٢– ٣) مانگ پرۆڤەمان نەکرد دوای ئەوە توانیمان ئەو کاتە کە تەواومانکرد شانۆگەرییەکەمان تەواو کرد شانۆ نەبوو لە هۆڵی قوتابخانە مامۆستا سەلمان فایەق کە دەرهێنەر بوو وتی بۆ نایەن هەر لەم هۆڵەدا لە ناوەندی شۆڕیجە بە هەوڵی خۆتانو ئێمەش یارمەتیتان ئەدەین با شانۆیەك دروست بکەین هەر لە هۆڵی قوتابخانەکە ئێمەش وتمان ڕێگریمان نییە هەموو ئامادەین بە هەوڵو کۆششی خۆمان قوتابیان هەموو پێکەوە توانیمان شانۆیەك دروست بکەین لەناو هۆڵی قوتابخانەی ناوەندی شۆڕیجە هەتا لە بیرمە مامۆستا سەلمان فایەق دوای ئەوەی تەواومان کرد دەستی کردە پێکەنین وتی: ئافەرم ئافەرم قوتابیانی شۆڕیجە ئێوە لەم ڕۆژە توانیتان شۆڕشێکی ڕۆشنبیری لە شۆڕیجە دروست بکەن.

من دەوری وریا شێتم ئەبینی کە دەورەکان بەش کران مامۆستا سەلمان فایەق دای پێم چونکە لە سەرەتادا دەورەکانمان وەرگرت چەند قوتابییەك دەورەکەیان وەرگرت دوای ئەوە چەند ڕۆژێك نمایشمان کرد، مامۆستا سەلمان فایەق گۆڕانی کرد لە دەوری کەسەکان، بەڵام ئەوەی منی پێ باش بوو نەی گۆڕی.

توانیمان بۆ ماوەی یەك مانگو سێ ڕۆژ ئێمە نمایش بکەین لەسەر شانۆی هۆڵەکە کە هەموو ڕۆژێ هۆڵەکە پڕ ئەبوو خەڵکی وا هەبوو ئەهات بە پێوە ئەوەستا ئەوەندەیان پێ خۆش بوو لەو کاتەدا شتێکی وا بوو ناوی دابۆوە نەك هەر بۆ شۆڕیجە بەڵکو لە گەڕەکەکانی ترەوە ئیسکان، ڕەحیماوا لە شوێنی ترەوە خەڵك ئەهات بۆ سەیر کردنی شانۆگەرییەکە.

دوای تۆزێ دەستکاری کردنی ئەم درامایە توانیمان تۆماری بکەین بۆ تەلەفزیۆن، مامۆستا سەلمان فایەق وتی من لاریم نییە بەهەموو شێوەیەك یارمەتی ئێوە ئەدەم چۆن ئەتانەوێ دەستی پێ بکەن عەلی کەریمو جەلیل زەنگەنە هەستان تۆزی دەستکاریان تیا کرد توانیان هەندێ شت گۆڕانکاری تیا بکەن بیکەنە درامایەك بتوانین پێشکەشی بکەینو تۆماری بکەین بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوك جا ئەو کاتە مامۆستا سەلمان فایەق فەرمانبەرو دەرهێنەریش بوو لە تەلەفزیۆنی کەرکوك زۆر یارمەتی داین هەتا بۆ یەکەم جار بوو لە درامای کوردی مامۆستا سەلمان فایەق گرتەی سینەمایی تێبکات، کامێرای سەر شانی هێنا چووینە چەمچەماڵ ئەو گرتانەمان گرت هەمووی بە کامێرای سەرشان، گرتەی سینەمایی کردە ناو دراماکەوە, دوای ئەوە چووینە ستۆدیۆی بەغدا تۆمارمان کرد بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوك.

بەشداربووان لەو شانۆگەرییە لەو درامایە مامۆستا جیهاد دڵپاك بوو دەوری نەوت فرۆشێکی ئەبینی ڕۆستەمی نەوت فرۆش، عەلی کەریم دەوری بڵندی ئەبینی، من خۆم دەوری وریا شێتم ئەبینی مامۆستا سەردار فەتاح هەبوو دەوری شەریفی ئەبینی، خالید پشدەری هەبوو دەوری شێرەی سەگ کوژی ئەبینی عەبدولڕەحمان پشدەری هەبوو دەوری بارامی چایچی ئەبینی، مامۆستا کەماڵ خۆی ئەو کاتە سەرۆکی کۆمەڵ بوو دەوری ئەفسەرێکی ئەبینی ئەفسەری پۆلیس لە

مەرکەزەکە، عومەر جەباری ئێستا حاکمە لە چەمچەماڵ ئەو دەوری شەقاوەیەکی ئەبینی یەکێکی کەشمان هەبوو سێ شەقاوەی تیابوو یەکێکیان عومەر بوو ئەوی تریان ڕەشید خەیات بوو لە شۆڕیجە بوو ئەوەی تریشیان عوسمان دەروێش بوو، مەحمود گللی هەبوو دەوری نۆك فرۆشی ئەبینی منالّی ڕەشید خەیات بوون دوو منالّی لەوێ دەوریان ئەبینی بەداخەوە هەردووکیان شەهیدکران وابزانم پێشمەرگە بوون ئەو دوانەی جاسمێکمان لەگەڵا بوو ئەو قوتابی بوو ئەو دەوری خاوەنی بارەکەی ئەبینی خەڵکی ئەهات مەشروبی تیا ئەخواردەوە عەبدولڕەحمان سەعید لەگەڵمان بوو سکرتێری کۆمەڵە بوو ئەویش دەوری شایەتێکی ئەبینی کە ڕۆستەمی نەوت فرۆش تەعدای لە شەریف کردبوو لە مەرکەزەکە کە لەلای ئەفسەرەکە چۆن شایەتی ئەدا بەناحەقی کە ڕۆستەم تەعدای لە شەریف کردووە".

شانۆگەری (سەری گلۆڵەکە)، سالی ١٩٧٠

نوێنەرانی کۆمەلی هونەرو وێژەی کوردی لقی کەرکوك و یەکێتی نووسەرانی کورد لقی کەرکوك

*** گەشەکردنی شانۆی تورکمانی لەکەرکوک:**

سالآنی حەفتاکان بە پێزترین سەردەمێك بووە کە شانۆی تورکمانی بەداهێنانێکی گەورەوە پێیدا ڕابوردبێ، تورکمانەکان لە سالی ١٩٧٠ هەوڵی دامەزراندنی چەند تیپێکیان دا، لەوانەش (تیپی میللی تورکمانی)و (تیپی نواندنی بابەگوڕگوڕ)، لەو تیپەی یەکەمیاندا چەند ئەندامێکی تیپی عیسمەت هورمزی لە چەشنی ئەنوەر محەمەد ڕەمەزان، سەلاح نوری، ئایدن شاکر عێراقی، هاتنە ناو تیپەکە، دواتر عەبدوللا جومعەو محەمەد قاسم، عەبدولڕزاق هورمزی، محەمەد قۆشچو ئۆغلۆ، حوسێن دمیرچیو زۆرانی تریش هاتنە پالی.

هەروەها تیپەکە چەند چالاکییەکی نواند لە ڕێگەی دامەزراندنی تیپێکی مۆسیقایی، لەوانە کۆمەلە گەنجێکی فێری مۆسیقا کردو پاشان هەر ئەو گەنجانە هاتنە پال (کۆرال)ی تیپەکەو ئەوەبوو (جەلال وەندی) مۆسیقاژەن، بەشێوەیەکی زانستی ئەو گەنجانەی فێری مۆسیقا کرد، ئەو هونەرمەندە ڕۆلێکی ئێجگار کاریگەری هەبوو لەپێشکەش کردنی چەندین گۆرانیو ئۆپەرێتو پێگەیاندنی زۆر لەگۆرانی بێژەکان کە خزمەتێکی دیارو بەرچاویان بەگۆرانی تورکمانی کردووە.

تیپەکە چەند نمایشێکی شانۆیی پێشکەش کردووە هەر هەموویان لەنووسینی (سەلاح نوری) بوون، ئەو سەلاحە وەك شانۆ نووس بووە، لەهەمان کاتیشدا یەکێك بووە لەشاعیرە دیارە تورکمانەکان.

ئەو شانۆگەرییانەی کە پێشکەش کران بریتی بوون لە تەمبەل عەباس، بازاڕ ئاغاسی، یاراسا ، الاستاذ تاران، جاریتی السوق، حکیملەر ساغ ئۆلسون، یولچولارو زۆری تریش.

هەروەها تیپەکە چەند شانۆگەرییەکی دیکەی پێشکەش کرد کە نووسەرانی دیکە نووسیبویان لەوانەش (بیتمیەن گێجە)ی قەحتان هورمزی، (بایرام ئەقشامی)ی وەجدی کەدحو دەرهێنانی محەمەد قاسم، بەلام ئەو شانۆگەرییەی کە سەلاح نوری نووسیبوونی، لەکەسایەتی (تەمبەل عەباس) دا بوو کە سەرکەوتنێکی گەورەی تێدا بەدەست هێناو جەماوەرێکی زۆر بەپەرۆشەوە دەهاتنە بینینی.

تیپی بابەگوڕگوڕ لە سالی (١٩٧٠)دا چەندین شانۆگەری پێشکەش کرد، لەوانە (شەمەندەفەر)ی نەسرەت مەردانو دەرهێنانی (تەحسین شەعبان)، (دەللیلەر دختۆری)ی یاوز هورمزیو دەرهێنانی هاشم زەینەل، هەررەها شانۆگەری (غەیورلەر بادەسی) نووسینو دەرهێنانی تەحسین شەعبان، (ئات سیوەنلارین شارقسی) نووسینی نەسرەت مەردانو دەرهێنانی هاشم زەینەل، (یماقلەك) دەرهێنانی زەینەل عابدین، حەسیب کۆپرلو، (ئۆینبان) ئەحمەد ئۆتراقچی ئۆغلۆ، (بیندە بیر) دەرهێنانی عیماد بەهجەت، (ئیمرا دەرسی) وەرگێڕانی مەولود تەها قایاچی، ئەم شانۆگەرییە لەنمایشێکی نەهێشتنی نەخوێندەواری سەلیم بەسری وەریگێڕابوو، (غایب حەیدەر حاجی) دەریهێنابوو، (وەقت وارکێن) دەرهێنانی حوسێن عەلی غالب.

*** ئەو تیپە هونەرییەکانەی کە لە سالآنی حەفتاکان برەویان هەبوو لە بواری شانۆدا:**

**١. تیپی شانۆو مۆسیقای (بابە گورگور):**

ئەم تیپە لە سالی (١٩٦٩-١٩٧٠) لە ئەنجامی یەکگرتنی تیپی (التمثیل الجدید)و تیپی (قەرە ئالتون تاقمی) دروست بووە بە سەرپەرشتی هونەرمەندان (تەحسین شەعبان، کەمال تۆفیق، عەدنان ئیسماعیل، یەلماز شکور، جەلال سۆدەچی، ئەکرەم کەرکوکلی)، شوێنی ئەم تیپە لە ناو یانەی (الثورة الریاضي) کۆنی جاران بووە، ئەمیش کۆمەلێك لە چالاکییە شانۆییەکانێتی:

– شانۆگەری (شەمەندەفەر)، لە نووسینی (نەسرەت مەردان)، دەرهێنانی (تەحسین شەعبان).

– شانۆگەری (دەللیەر دوختوری)، نووسینی (یاوز هورمزی)، دەرهێنانی (هاشم زەینەل).

– شانۆگەری (ئالتی ئالليغ)، نووسینی (یوسف ئەلعانی)، دەرهێنانی (تەحسین شەعبان).

– شانۆگەری (غەیورلەر بادەسی)، نووسینو دەرهێنانی (تەحسین شەعبان).

**٢. تیپی یانەی (الثورة) بۆ شانۆگەریو فۆلکلۆری تورکمانی:**

ئەم تیپە لە سالی (١٩٧١) دامەزرا لە ناو یانەی وەرزشی (الثورة)، بەشێك لە ئەندامانی تیپی (بابا گوڕگوڕ) هاتنە ناو ئەم تیپەوە، ئەندامەکانی ئەم تیپە بریتی بوو لە: (ئەحمەد ئۆتراقچی، یەلماز شکور، عیرفان سدیق، غائیب حەیدەر، عیماد بەهجەت، غازی میخائیل، حوسێن عەلی غالب، شەمسەددین مستەفا تورکمن ئۆغلۆ، سەمرا کەرکوکلی، نۆرهان بەیاتی، بەحرییە چەلەبی، عەدنان ساری کەهیە، فیکرەت کەرکوکی)، چالاکییە شانۆییەکانی ئەم تیپە بریتی بوو لە:

– شانۆگەری (ئۆینباز عەزە)، نووسینی (ئەحمەد ئۆتراقچی)، دەرهێنانی (عیماد بەهجەت).

– شانۆگەری (بەیندە بیر)، نووسینی (یەلماز بەگ ئۆغلۆ)، دەرهێنانی (عیماد بەهجەت).

– شانۆگەری (الیتیم)، نووسینو دەرهێنانی (یەلماز بەگ ئۆغلۆ).

– شانۆگەری (مواطن بلا استمارة)، وەرگێڕانی (عەدنان ساری کەهیە)، دەرهێنانی (عیماد بەهجەت).

– شانۆگەری (ئەملا دەرسی)، وەرگێڕانی (مەولود تاها قایاچی)، دەرهێنانی (غائیب حەیدەر).

– شانۆگەری (نجە، نیجن، کیمیجن)، وەرگێڕانی (ئەحمەد ئۆتراقچی)، دەرهێنانی (حوسێن عەلی غالیب).

– شانۆگەری (وەقت واریکن)، نووسینی (ئەحمەد ئۆتراقچی)، دەرهێنانی (حوسێن عەلی غالیب).

– شانۆگەری (ییمان فەلەك).

– شانۆگەری (میللەت نولمز).

– شانۆگەری (سووچی نادی).

**٣. تیپی (نەتەوەیی) بۆ نواندن:**

ئەم تیپە لە ساڵی (١٩٧٠) دامەزراوە، زۆربەیان پێك هاتبوون لە تیپی شانۆی هونەری کە لە ساڵی (١٩٥٧) دامەزراوە، بەڵام گەلێك لە دەرچووانی شانۆو ئارەزوومەندانی شانۆ ئەم تیپەیان دامەزراند کە سەر بە کۆمەڵەی (الهلال الاحمر) بوو لە کەرکوك، ئەندامە دیارەکانی بریتی بوو لە: (ئەنوەر محەمەد ڕەمەزان، سەلاح نەورەس، ئایدن ئەلعێراقی، عەباس ئەرەنای، محەمەد قاسم، عەبدوڵلا جومعە، عەبدولڕەزاق هورمزی)، لە پاڵ ئەمەدا گەلێك لە هونەرمەندو مۆسیقاژان بەشدارییان تێدا کرد، وەکو: (فەتحوڵلا ئالتون سەس، یەشار مستەفا کەماڵ، جەلال وەندی، حوسێن بەهائەددین)، ئەمانەی خوارەوە بریتییە لە چالاکییە شانۆییەکانی ئەم تیپە:

- شانۆگەری (بەتمییەن گیچە)، نووسینی (قەحتان هورمزی)، دەرهێنانی (ئەنوەر محەمەد ڕەمەزان).
- شانۆگەری (تەمبەل عەباس)، نووسینی (سەلاح نەورەس)، دەرهێنانی (ئەنوەر محەمەد ڕەمەزان).
- شانۆگەری (بازار ئاغاسی)، نووسینی (سەلاح نەورەس)، دەرهێنانی (ئەنوەر محەمەد ڕەمەزان).
- شانۆگەری (یاراسە)، نووسینی (سەلاح نەورەس)، دەرهێنانی (ئەنوەر محەمەد ڕەمەزان).
- شانۆگەری (الاستاذ تاران)، نووسینی (سەلاح نەورەس)، دەرهێنانی (ئەنوەر محەمەد ڕەمەزان).
- شانۆگەری (حەسەن ئەفەندی)، دەرهێنانی (عەبدوڵلا جومعە).
- شانۆگەری (چارشی)، نووسینی (سەلاح نەورەس)، دەرهێنانی (ئەنوەر محەمەد ڕەمەزان).
- شانۆگەری (حەکیملار ساغ ئۆلسن)، نووسینی (سەلاح نەورەس)، دەرهێنانی (محەمەد قاسم).
- شانۆگەری (یولچولار)، نووسینی (سەلاح نەورەس)، دەرهێنانی (ئەنوەر محەمەد ڕەمەزان).
- شانۆگەری (بایرام ئاقماشی)، نووسینی (وەجدی گدگ)، دەرهێنانی (محەمەد قاسم).
- شانۆگەری (مردیوان)، نووسینی (وەجدی گدگ)، دەرهێنانی (عەبدولڕەزاق هورمزی).

**٤. تیپی (پەروەردە) بۆ نواندن:**

ئەم تیپە لە ساڵی (١٩٧٤) دووبار دامەزرایەوە، بەشداری گەلێك لە شانۆییەکانی وەزارەتی پەروەردەی عێراق کردووەو گەلێك خەڵاتی جۆربەجۆری لە پێناوی هونەری شانۆدا وەرگرتووە، بەرهەمە شانۆییەکانی بریتی بوو لە:

- شانۆگەری (انتیکۆنا)، نووسینی (جان کوکتو)، دەرهێنانی (سەلمان فایق)، ساڵی (١٩٧٤).
- شانۆگەری (تاجر البندقیة)، نووسینی (ولیەم شکسپیر)، دەرهێنانی (سەلمان فایق)، ساڵی (١٩٧٤).
- شانۆگەری (المصیدة)، نووسینی (عەلی حەسەن ئەلبەیاتی)، دەرهێنانی (حوسێن عەلی غالیب)، ساڵی (١٩٧٤).
- شانۆگەری (الاصوات الرافضة)، ئامادەکردن و دەرهێنانی (تەحسین شەعبان)، ساڵی (١٩٧٦).
- شانۆگەری (الافکار السوداء)، نووسین و دەرهێنانی (تەحسین شەعبان)، ساڵی (١٩٧٦).
- شانۆگەری (مرایا الشمس)، نووسین و دەرهێنانی

تیپی (نەتەوەیی) تورکمانی

(ئەنوەر ڕەمەزان)، ساڵی (١٩٧٧).
- شانۆگەری (ملف القضية)، نووسین و دەرهێنانی (تەحسین شەعبان)، ساڵی (١٩٧٧).
- شانۆگەری (تل الزعتر)، نووسین و دەرهێنانی (ئەنوەر ڕەمەزان)، ساڵی (١٩٧٧).
- شانۆگەری (سقوط وصعود ايسن)، نووسینی (فازڵ حەلاق)، دەرهێنانی (ئەنوەر ڕەمەزان)، ساڵی (١٩٧٨).
- شانۆگەری (زفير الصحراء)، نووسینی (جەلیل ئەلقەیسی)، دەرهێنانی (سەعید ئەلمالیکی)، ساڵی (١٩٧٨).
- شانۆگەری (وامعتصماه)، ئامادەکردن و دەرهێنانی (تەحسین شەعبان)، ساڵی (١٩٧٨).

**٥. تیپی (قوتابیان) بۆ نواندن:**

ئەم تیپە بەردەوامی ساڵانی تره کە لەلایەن چالاکی قوتابخانەکانەوە لە شەستەکان دامەزرا، چالاکییەکانی بریتی بوو لە:
- شانۆگەری (العروس والارض)، دەرهێنانی (سەلمان فایق)، ساڵی (١٩٧١-١٩٧٢).
- شانۆگەری (کیلوباترا)، دەرهێنانی (ئەنوەر ڕەمەزان)، ساڵی (١٩٧١-١٩٧٢).
- شانۆگەری (الناقوس)، نووسینی (نەسرەت مەردان)، دەرهێنانی (ئەنوەر ڕەمەزان)، ساڵی (١٩٧١-١٩٧٢).
- شانۆگەری (اغنية التم)، دەرهێنانی (ئەنوەر ڕەمەزان)، ساڵی (١٩٧١-١٩٧٢).
- شانۆگەری (القادم الجديد)، نووسینی (فازڵ حەلاق)، دەرهێنانی (ئەنوەر ڕەمەزان)، ساڵی (١٩٧٤).
- شانۆگەری (اوديب)، نووسینی (تۆفیق حەکیم)، دەرهێنانی (ئەنوەر ڕەمەزان)، ساڵی (١٩٧٤).
- شانۆگەری (اوبريت بطاقة الحب)، ئامادە و دەرهێنانی (ئەنوەر ڕەمەزان)، ساڵی (١٩٧٦).
- شانۆگەری (بدور)، نووسینی (فازڵ حەلاق)، دەرهێنانی (واجب سەعید)، ساڵی (١٩٧٧).

**٦. تیپی (المسرح التجريبي):**

ئەم تیپە لە ساڵی (١٩٧٨) دامەزرا، کە سەر بە بەڕێوەبەرایەتی ڕاگەیاندنی ناوخۆ بووە، کە کۆمەڵێك لە دەرچوانی شانۆ و ئارەزوومەندان دایانمەزراندووە، وەکو: (هەیسەم عەبدولڕەزاق، عەواد عەلی، عەبدولڕەزاق محەمەد عەزیز، داوود زەبیبا، جەعفەر موسا، یاووز فایق، جەلال فەتاح ڕەفعەت، فازڵ ناسر، حوسێن میسری، نیهاد شکور، لەهیب خەلیل، ڕیاز ئیسماعیل، هەنا جاسم، ئینتیسار محەمەد، گوڵشان نازم، باسم عەبدولقەهار، عەلی ڕێسان، ئیسماعیل هەورامی، سەمیرە موراد، سوعاد ستار، فاروق فایق، کەمیل شەمعون)، چالاکییە شانۆییەکانیان بریتی بوو لە:
- شانۆگەری (بزوغ القمر)، نووسینی (لیدی گریگۆری)، دەرهێنانی (هەیسەم عەبدولڕەزاق).
- شانۆگەری (استعراضات تراثية)، دەرهێنانی (هەیسەم عەبدولڕەزاق).
- شانۆگەری (البيت الذي ارتفع فوق السحاب)، نووسین و دەرهێنانی (هەیسەم عەبدولڕەزاق).
- شانۆگەری (غابة اليوتوبيا)، دەرهێنانی (ئیسماعیل هەورامی).
- شانۆگەری (الطائر والثعلب)، دەرهێنانی (جەعفەر موسا).
- شانۆگەری (الدراويش يبحثون عن الحقيقة)، نووسینی (مستەفا حەلاد)، دەرهێنانی (عەواد عەلی).
- شانۆگەری (لعبة السلطان والوزير)، نووسینی (ئەلبو سەبری)، دەرهێنانی (عەبدولڕەزاق محەمەد عەزیز).

**٧. تیپی (نقابة المعلمين):**

ئەم تیپە لە ساڵی (١٩٧٤) لەلایەن سەندیکای مامۆستایانی کەرکوکەوە دامەزرا، چالاکییە شانۆییەکانیان بریتی بوو لە:
- شانۆگەری (الصديقان)، نووسینی (هێربرت)، وەرگێڕانی (سەلاح نەورەس)، دەرهێنانی (فازڵ حەلاق).
- شانۆگەری (شلون، لويش، المن؟)، نووسینی (یوسف ئەلعانی)، دەرهێنانی (فازڵ حەلاق).
- شانۆگەری (الغرباء)، نووسین و دەرهێنانی (فازڵ حەلاق).

**٨. تیپی (یەکێتی هونەرمەندان):**

ئەم تیپە لە ساڵی (١٩٦٩-١٩٧٠) دامەزراوە، بەرهەمە شانۆییەکانی بریتی بوو لە:
- شانۆگەری (ورد جهنمي)، نووسینی (تاها سالم)،

هونەرمەندی شانۆکار حوسێن دەرچی، ناسراو بە (تەمبەل عەباس)

دەرهێنانی (سەلمان فایق).

– شانۆگەری (اللصوص السود)، ئامادەو دەرهێنانی (سەلمان فایق).

ئەوەی سەرنج دەدرێت لە هونەری شانۆو نواندن لە حەفتاکاندا خۆی دەبێنێتەوە لەم تایبەتمەندییانە:

١. زۆربەی دەقە شانۆییەکانی ئەو ماوەیە بە تایبەتی دەقە ناوخۆییەکان بە ناوبانگن کە ناوەڕۆك و دەقی شانۆییەکان زۆر بە توانا و لە ئاستێکی بەرزدا بوون، ئەوەیش لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە ئەو شانۆیانەی کە لەو ماوەیە پێشکەش کرا دەنگدانەوەیەکی گەورەی بە خۆیەوە بینی لە ڕووی ناوەڕۆکی دەقەکانەوە.

٢. هاوپەیوەستییەکەی گونجاو هەبوو لەنێوان بەرهەم هێنانی شانۆیی و ئەکتەرو دیکۆر کە هەر هەمووی تێکهەڵکێشی ئەو دەقە چاکانە دەبوو، بۆیە دەبینین هەر لەو ماوەیەدا ئەکتەری بە توانا و دیکۆری بە توانا و دەرهێنەری بە توانا سەری هەڵدا.

٣. کاریگەرییە ئابوورییەکەی ئەو سەردەمە هاوپەیوەستی بارە سیاسییەکەی ئەو کاتە بوو کە خۆی دەبینییەوە لە هاوسەنگی ڕێککەوتنە سیاسییەکانی حکومەت و شۆڕشی کورد لەلایەك و ئەو ئاسوودەییە ئابوورییە لەلایەکی تر هاوسەنگی شانۆو دەقە شانۆییەکانی دەنواند.

٤. پێشکەشکردنی شانۆییەکان لە کاتی دیاریکراودا بوو لە هەمان کاتدا خەڵکێکی زۆریش تامەزرۆی بینینی شانۆ بوون لە کەرکوکدا، کە خۆی دەبینییەوە لە ئاسوودەیی بارە سیاسییەکەی ئەو کاتە، ئەگەر سەیری ئەو بینەرە زۆرەی شانۆ بکەین لەو کاتەدا لە چاو ڕیکلام و بانگهێشتن بۆیدا دەبینین خەڵکەکە خۆیان پێشوازی زیاتریان دەکرد لە شانۆ.

٥. بوونی دەقی بە پێزو زیاتر ناوەڕۆکەکان خۆیان دەبینییەوە لە کێشە کۆمەڵایەتی و نەتەوایەتییەکاندا چونکە شانۆ چەکێك بوو لەو کاتەدا بۆ بەرەنگاربوونەوەی کێشە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان.

٦. سەرەهەڵدانی ڕەخنەسازی شانۆیی دەورێکی گەورەی بینی لە هەڵسەنگاندنی دەقە شانۆییەکان و بەراوردی کەموکوڕییەکانی بە شێوەیەکی ئەکادیمیانە و زانستییانە.

٧. بوونی بەشێکی زۆر لە تەختەی شانۆو شوێنی نمایش کردن دەوری بینی لە پێگەیاندنی هونەری شانۆ لەم شارە.

٨. بوونی زمانێکی ناوخۆیی شانۆیی بە زمانەکانی تورکمانی و کوردی و ئاسووری دەوری بینی لە پێگەیاندن و چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکان لەسەر شانۆ.

٩. **تیپی نواندنی (چرۆ) لە ناوەندی ئیمام قاسم:**

**دیمەنی هەر یەکە لە شانۆکاران عیماد بەهجەت و یەلماز بەگ**

شانۆکارانی شانۆی (تەمبەل عەباس) لە شانۆگەرییەکی تردا بە ناوی (یومیات)

ئەم تیپە لە ساڵەکانی ١٩٧٦ - ١٩٧٧ لە ناوەندی ئیمام قاسم بە سەرپەرشتی هونەرمەند (بەهجەت نەجمەددین) لەو قوتابخانەیە دامەزراوە لەلایەن هونەرمەندان (عومەر عەلی ئەمین، تاها خەلیل، قادر مستەفا) لە سلێمانییەوە سەردانیان دەکردو سەرپەرشتی کار هونەرییەکانیان دەکرد.

ئەندامەکانی ئەم تیپە لە خوێندکارانی ئەو کاتەی ناوەندی ئیمام قاسم پێك هاتبوو، بەڵام تەمەنی ئەم تیپە زۆر کەم بوو وە چالاکی نەبوو.

*** مێژووی شانۆی کوردی لە خورماتوو:**

سەلاح شوکور

هونەری شانۆ یەکێکە لە هونەرە جوانەکان و کاریگەرییەکی تەواوی هەیە لەسەر کۆمەڵگا هەمیشە ئامرازێك بووە بۆ گوزارشت کردن لەزوڵم و زۆرداری دەسەڵات وکەم وکوڕی وکارە دزێوەکانی نێو کۆمەڵگە وەبە هەمان شێوە بەبەردەوامی هەوڵدراوە لە ڕێچکەی هونەری شانۆوە کۆمەڵگە هۆشیار بکرێتەوە بۆ چەسپاندنی بیری نەتەوایەتی لەناو خەڵکیدا. گەلی کوردیش گەلێك بووە بە درێژایی مێژوو لە ژێر زەبروزەنگی دوژمناندا بووە و نەیتوانیوە مافە نەتەوایەتی و کۆمەڵایەتی و سیاسیەکان بەدەست بهێنێ بۆیە هەوڵ دراوە لەلایەن هونەرمەندانی کوردەوە تەختەی شانۆکان بکەنە مینبەرێك بۆ گەیاندنی پەیامەکانی گەلی کورد بەدەوروبەردا. شارۆچکەی خورماتووش یەکێك بووە لەو شارە کوردییانەی کە بێبەش نەبووە لە بزوتنەوەی شانۆی کوردی ولەقۆناغە جیاجیاکانداو لەلایەن گەنجانی ئەم شارەوە هەوڵێکی زۆر دراوە بەچەندین شانۆگەری نمایشکراوە. نووسینی مێژووی شانۆی کوردی لە خورماتوو تاوەکو ئێستا لەسەری نەنوسراوەو ئەگەر هەوڵ نەدرێت بنوسرێت ئەوا بەرەو فەوتانن ولە ناوچوون دەچێت چونکە ساڵانێکی دوورودرێژەو سی و حەوت ساڵ بەسەردا تێپەڕیوە ئەگەر ئێستا فریای نووسینەوەی نەکەوین ئەوە هەموو ئەو بەرهەمانە لەبیر دەچنەوەو دەفەوتێن. بۆیە بەباشم زانی بە پێی توانا هەوڵێك بدەم بۆ نووسینەوەی مێژووی شانۆی کوردی لە خورماتووداو ئەو مێژووە زیندوو بکەمەوەو لەناوچوون ڕزگاری بکەم. مێژووی شانۆی کوردی لەم شارەدا لە دوای بەیاننامەی (١١)ی ئادار ساڵی (١٩٧٠)ەوە دەست پێدەکات ولەلایەن گەنجانی ئەم شارەوە بزوتنەوەیەکی شانۆیی لەم شارە دەستی پێکردوە.

*** قۆناغەکانی مێژووی شانۆی کوردی لە خورماتوو:**

١. شانۆی کوردی لە دوای بەیاننامەی (١١)ی ئازارەوە:

دوابەدوای ڕێککەوتنی (١١)ی ئادار جوڵانەوەیەکی هونەری ڕۆشنبیری سیاسی لەسەرجەم شارەکانی کوردستان بەگشتی وخورماتوو بە تایبەتی دەستی پێکرد وتاڕادەیەك کۆمەڵێك لە گەنجانی ئەم شارە هاتنە ناو دونیای هونەری

شانۆی کوردییەوە. وەك سەرەتایەك لە هەردوو قوتابخانەی هەندرێن وسەربەستی لەقوتابیانەوە دەستی پێکردو لەبواری چالاکییەکانی قوتابخانەکاندا چەند هەوڵێکی شانۆیی دراوە. پاشان یەکێتی قوتابیان ولاوانی کوردستان لەم شارە ڕۆڵێکی گەورەی بینیوە لەم بوارەدا.

لە ساڵی (١٩٧٠) تیپێکی شانۆیان دامەزراندووەو دەستیان بە چالاکییەکانی خۆیان کردووە. یەکەم شانۆگەرییان لە نەورۆزی ساڵی (١٩٧٠)دا پێشکەش کردووە بەناوی (کاوەی ئاسنگەر) لە شوێنی قوتابخانەی سەرەتایی فەراهیدی. ئەم ئەکتەرانە تیایدا بەشدار بوونە:

١. مامۆستا عەبدولخالق حاجی ئەحمەد.

٢. شەهاب ئەحمەد وایەرمان.

٣. ڕەشید عەبدوڵڵا دزەیی.

٤. خوالێخۆشبوو مامۆستا نەجیب عەبدوڵڵا بەرغەش (نەجیب گەرمیانی).

٥. حوسێن سەید کەریم گەرمکی.

٦. عەبدولکەریم عەبدولڕەحیم.

٧. مام حەسەن کە ئەو کات شوفێری ئۆتۆمبێلی فریاکەوتنی نەخۆشخانەی خورماتوو بووە.

٨. عەسری حەمید ناسراو بە حەمید دۆشاو خەڵکی کفری بووە.

٩. مام هەرزان.

ئەم شانۆگەرییە لە شارۆچکەی خورماتوو داقوق‌و گوندەکانی باوەو مامشەو قەڵخانلوو خدر وەلی نمایشکراوەو بۆ ئەوکاتە جەماوەرێکی زۆری لەخۆ کۆکردۆتەوە، دوابەدوای پێشکەش کردنی شانۆگەری کاوەی ئاسنگەر هەمان ئەو کۆمەڵە ئەکتەرە گەنجانە لە ساڵی ١٩٧١ شانۆگەری (شێت)یان پێشکەش کردووە لەسەر شانۆی یەکێتی قوتابیانی کوردستان لە باخچەی تەعاونیە کە بەرامبەر ناوچەی خورماتووی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو، ئەم دوو شانۆگەرییە لە ساڵەکانی (١٩٧٢)، (١٩٧٣) ناوبەناو پێشکەش کراوە بەڵام لەدوای ساڵی (١٩٧٣) وە ئیتر ڕژێم لە بەڵێنەکانی خۆی پاشگەز بووەوەو هەموو دەنگەکانی ئازادی بێدەنگ کردو ڕێگەی بەکەس نەئەدا ئەم جۆرە چالاکییانە ئەنجام بدەن. پاشان شەڕ لەنێوان شۆڕشی کوردو ڕژێمی ئەوسای عێراق دەستی پێکردەوەو نائارامی و ڕەوشێکی ئاڵۆزو پڕ مەترسی باڵی کێشا بەسەر شارەکەدا تاوەکو سەرەتای ساڵی هەشتاکانی سەدەی رابردوو.

*** شانۆی کوردی لە خورماتوو ساڵی هەشتاکانی سەدەی رابردوو:**

شانۆی کوردی لە ساڵی هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو چووە قۆناغێکی ترەوە لەبەر ئەوەی لەو ساڵانەدا ڕەوشی سیاسی عێراق بەگشتی‌و شارۆچکەی خورماتوو بە تایبەتی دۆخێکی ئاڵۆزی هەبووە چونکە ڕژێمی ئەو سەردەمی عێراق لەبەرزترین لوتکەی هێزدا بووەو گەنجانی کورد بەبەردەوامی لەلایەن ڕژێمەوە سانسۆری خرا بووە سەرو کەس نەیدەوێرا بەئاشکراو بەبێ ترس چالاکی هونەری ئەنجام بدەن بۆیە ئەوەی ئەنجام دراوە لەم شارە بەرپەرچدانەوەیەك بووە بەرامبەر ڕژێم‌و بەگژا چوونەوەی دەسەڵات بووە. لەم ساڵانەدا کۆمەڵێك خوێندکاری ناوەندی لەسەرەتادا وەکو لاسایی کردنەوەی هونەرمەندە ناودارەکان‌و بەیارمەتی مامۆستاکانیان لە ساڵی ١٩٨٢ ئەم قۆناغە دەستی پێکردووە بەسەر پەرشتی هونەرمەند محەمەد زەنگەنە نمایش کراوە بەناوی (تحت موس. الحلاق) بەشدار بووان لەم شانۆگەرییەدا محەمەد زەنگەنەو رەحیم شەهاب بووە هەر لەو ساڵەدا هونەرمەند محەمەد زەنگەنە لە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی مووسڵ بەشی شانۆ وەردەگیرێ‌و لە ساڵی ١٩٨٧ بەشی شانۆ تەواو دەکات‌و چالاکییەکانی بەشێوەیەکی ئەکادیمیانە پێشکەش دەکات. هەر لە ساڵی ١٩٨٢ لەلایەن کۆمەڵێك گەنجی خوێن گەرمەوە تیپی شانۆی (پارەپارە) دەدامەزرێ. ئەندامەکانی پێکهاتبوون لە:

١. جەلال سابیر سەعید. ٢. سەلاح ئەحمەد مەحمود. ٣.فاتح ئەحمەد خوابەخش. ٤. خەلیل حەسەن ئەحمەد. ٥.عەلی شوکر ئەحمەد. ٦. فوئاد موحسین ئەمین. ٧.محەمەد عەزیز سابیر. ٨. تاهیر ئەحمەد عەبدولڕەحمان. ٩. ئەحمەد محەمەد ئەمین.

ئەم گەنجانە لە گوندی پارەپارە شوێنێکیان لە بەرزاییەك لەو گوندە تەرخان کردبوو بۆ شانۆو چالاکییەکانیان نمایش دەکرد. لەم سەردەمەدا (ڕەمەزان سابیر سەعید) هاندەرێك بووە بۆ دامەزراندنی ئەم تیپە. مەبەست لە دامەزراندنی ئەم تیپە بۆ کۆکردنەوەی لاوەکانی ئەم گوندەو گوندەکانی دەوروبەری خورماتوو بووە لە دەوری ڕێکخستنەکانی شۆڕشی نوێی گەلەکەمان، یەکەم بەرهەمی ئەم تیپە شانۆگەرییەك بووە بە ناوی (دارو دەستەی ئاغا) لە بەرواری (٢١)ی ئاداری ساڵی (١٩٨٢) نمایش کراوە ئەم بەرهەمە لە نووسینی (ئەحمەد محەمەد ئەمین)و لەدەرهێنانی جەلال سابیر سەعید بووەو لە گۆڕەپانی قوتابخانەی پارەپارە نمایش کراوە بۆ دانیشتووانی ئەو گوندەو گوندەکانی دەوروبەری، لە بەرواری (٢٠)ی ئاداری ساڵی (١٩٨٣) شانۆگەری (تەرازوو) پێشکەش کراوە: لە نووسینی (ئەمین میرزا کەریم)و دەرهێنانی جەلال سابیر سەعید لەسەر شانۆی هۆڵی دواناوەندی ئیبن خەلدوون نمایش کرا. لەم بەرهەمەدا دوو ئەکتەری تازە بەشداریان کرد لەم شانۆگەرییە: سەباح ئەحمەد مەحمودو مەسعود عەزەدین محەمەد لەپاش نمایشکردنی ئەم شانۆگەرییە سەرجەم ئەکتەرە بەشداربووەکان لەلایەن مامۆستایانی دواناوەندی ئیبن خەلدونەوە خەڵاتکران.

لە ساڵی ١٩٨٤ دوو شانۆگەری پێشکەش کرا، یەکەم شانۆگەری بەناوی (کێشەی ویژدان)و دووەم شانۆگەری بەناوی(کاوەی ئاسنگەر)لە ئامادەکردن ودەرهێنانی جەلال سابیر سەعید بووە. لە گوندەکانی پارەپارەو ئەلبوسەباح نمایش کراوە، لە ساڵی (١٩٨٥)، جارێکی تر شانۆگەری (دارودەستەی ئاغا) لە گوندی هەفتەغار نمایش کرا. لە ساڵی ١٩٨٦ شانۆگەری (پەیمان بێت) نمایش کرا ئەم شانۆگەرییە لە نووسینی(فاتیح ئەحمەد خوابەخش)و دەرهێنانی جەلال

سابیر سەعید بووە. هەر لەو ساڵەدا شانۆگەریو ئۆپەرێتی (نق وجق) پێشكەش كراوە لە ئامادەكردن ودەرهێنانی سەلاح ئەحمەد مەحمود بووە لە گوندی پارەپارە نمایشكراوە. لە ساڵی ١٩٨٧ شانۆگەری (چایچی) نمایشكرا لە گوندی پارەپارە ئەم شانۆگەرییە لە نووسینو دەرهێنانی جەلال سابیر سەعید بووە، لەم شانۆگەرییەدا ئەكتەرێكی تازە بەناوی عەدنان غەریب بەشداری كردووە. ئەبێ ئەوە لەبیر نەكەین لەوكاتە هونەرمەند محەمەد زەنگەنە خوێنكاری بەشی شانۆی پەیمانگای هونەرەجوانەكانی مووسڵ بووە وهەموو جارێكی سەردانی ئەم تیپەی كردووە لەم گوندە بۆ ئەوەی ڕێنماییان بكات تاوەكو بەرهەمەكانیان بە شێوازێكی نوێو ئەكادیمی پێشكەش بكەن.

لە ڕۆژی (٢٠)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٨٧)، گوندی پارەپارە لەلایەن ڕژێمی بەعسی ئەوساوە دەڕوخێنرێو خەڵكەكەشی ئاوارەی كۆمەڵگاكان دەكرێنو ئەمەش زیانێكی گەورەی گەیاندە بواری هونەری ڕۆشنبیریی لە ناوچەكەدا. هەر لەدوای ڕووخاندنی ئەو گوندە دوو ئەكتەری ئەو تیپە دەبنە پێشمەرگەی (ی. ن. ك.) بە ناوەكانی خەلیل حەسەنو فوئاد موحسین وپاش چەند مانگێك لە پێشمەرگایەتیو لەكاتی پرۆسەی بەدناوی ئەنفالدا خەلیل حەسەن شەهید دەكرێ. وێڕای ڕووخاندنی گوندەكەیان ئەم تیپە كۆڵی نەداو بە شێوازێكی تر دەستیكرد بە چالاكییەكانی، لە ساڵی ١٩٩٠ بەنهێنی شانۆگەری (دونیای ئارەزوو)یان لەهاوینە هەواری سەرسەنگ نمایش كرد. لە ساڵی ١٩٩٦ چیرۆكی تەمسیلی (گێلە پیاو) لە نووسینی عەزیز نەسینو دەرهێنانی هونەرمەند جەلال سابیر سەعید لەسەر قورسی سیدی تۆماركرا. لەدوای پرۆسەی ئازادی عێراقو ڕزگار كردنی شاری خورماتوو لە ڕۆژی (٣)ی تشرینی یەكەمی ساڵی (٢٠٠٣) شانۆگەری لە (بازاڕی ئەمڕۆدا) نمایشكرا لەسەر شانۆی دواناوەندی (ئیبن خەلدون). لە (١٦)ی ئاداری ساڵی (٢٠٠٦) لە ساڵیادی كیمیابارانكردنی شاری هەڵەبجە تیپی شانۆی پارەپارە بەهاوكاری نووسینگەی خورماتووی كۆمەڵەی ڕووناكبیریو كۆمەڵایەتی پارێزگای كەركوك شانۆگەری (تراژیدیای هەڵەبجە)یان نمایش كرد.

* (**تیپی شانۆی خورماتوو**):

داستانی بەرگری لەشاری خورماتوو شەڕی مان ونەمانی پێشمەرگەو خەڵكی شۆڕشگێری شارەكە بۆ ماوەی دە ڕۆژ لە ڕاپەڕینە مەزنەكەی بەهاری ١٩٩١ ئەمە وای لە ڕژێمی لەناوچووی بەعس كرد كە ڕقو قینێكی زۆری لە خەڵكی خورماتوو بێتەوەو كەوتە گیانی خەڵكیو زیاتر لە ٥٠٠ خانووی هاووڵاتیانی ڕووخاندو نیوەی زیاتری خەڵكەكەشی ئاوارەی شارەكانی كوردستان بوون ئەوەشی لەناو شار مایەوە بەترس ولەرزێكی زۆرەوە دەژیاو ژیانی لە مەترسیدا بووە بۆیە لە هەڵویستێكی بێ وێنەداو لەبارودۆخێكی زۆر نالەباردا لەلایەن كۆمەڵێك هونەرمەندی ئازاو چاونەترسەوە تیپی شانۆی خورماتوویان لە ساڵی ١٩٩٢ دامەزران. ئەم هونەرمەندانە بوون:

١. محەمەد زەنگەنە. ٢.جەلال سابیر سەعید. ٣. ساڵح عەبدوڵڵا ئەمین. ٤. شامیل فەخرەدین. ٥. سامان ستار. ٦.محەمەد جومعە. ٧.سوبحی ڕەشید. ٨.سەلاح عەزەدین. ٩. هێمن مەجید. ١٠.عومەر محەمەد ئەحمەد.

لە (١)ی كانوونی دووەمی ساڵی (١٩٩٣) شانۆگەری (فایلی ٦٧)یان پێشكەش كرد، لە نووسینی ئیسماعیل فەهد ئیسماعیلو لەدەرهێنانی محەمەد زەنگەنە بووە. بۆ ماوەی (٥) ڕۆژ لەسەر شانۆی دواناوەندی ئیبن خەلدون نمایشكراو ڕۆژانە جەماوەرێكی زۆر ئامادەی شانۆگەرییەكە دەبوون وەلەپاش نمایشكردنی ئەم شانۆگەرییە لەلایەن ڕژێمەوە سانسۆرێكی زۆر خراپ خرایە سەر ئەندامانی تیپەكەو بەبەردەوامی هەڕەشەیان لێدەكرا. زۆربەی زۆری ئەكتەرەكانی ئەو تیپە سەربازی هەڵاتوو بوونو هەندێكیان براكانیان لەناو ڕیزەكانی (ی.ن.ك.) پێشمەرگە بوون. بۆ نموونە لە یەكەم

شانۆگەری (چایچی)، ساڵی (١٩٨٧)

شانۆگەری (داستانی ئەنفال)، سالی (٢٠٠٦)

ڕۆژی نمایشکردنی شانۆگەری (فایلی ٦٧)وە کاتژمێرێك پێش نمایشکردنەکە بەرپرسی ئەمنی خورماتوو خۆی دەکا بە هۆڵەکەداو دەقی شانۆگەرییەکەیان لێدەسێنێتو دەرهێنەری شانۆگەرییەکەیش بانگێشتی دائیرەی ئەمنی خورماتوو دەکەن. بەڵام ئەوەی ئەم دەرهێنەرەی ڕزگار کرد لە چنگی ئەمنەکان بەرپرسی ئەمنەکان بوو کە خەڵکی مووسڵ بوو دەرهێنەری شانۆکەیش دەرچووی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی مووسڵ بووە چەند شانۆگەری لە شاری مووسڵ پێشکەش کردووەو ئەمەش وا لە بەپرسە ئەمنەکە دەکات کە دەرهێنەر ئازاد بکاتو ڕێگەیان پێبدات شانۆگەرییەکە نمایش بکەن. پاشان هەرلەو ساڵەدا شانۆگەرییەکی عەرەبی بەناوی (جلسة سهر) پێشکەش دەکەن. دەرهێنەری ئەم شانۆگەرییە: دەڵێت لەبەر ئەوەی شانۆگەرییەکمان بەعەرەبی نمایشکرد بەمەبەستی ئەوەی چەواشەی بە بەرپرسانی ڕژێم لەشارەکەدا بکەین. لەم شانۆگەریدا چەند ئەکتەرێکی تازە بەشدارییان کرد وەك:

١. فەرمان ئەمین عەبدوڵڵا. ٢. ئیسماعیل. ٣. بەکر شوکر کەریم. ٤. ئومێد جەبار.

لە ساڵی ١٩٩٧ ئەم تیپە شانۆگەری (شاری ئەوین) یان نمایش کرد، لە نووسینی تەلعەت سامانو دەرهێنانی محەمەد زەنگەنە بۆ ماوەی (٤) ڕۆژ لە هۆڵی دواناوەندی ئیبن خەلدون نمایشیان کرد، لەم شانۆگەرییەش چەند ئەکتەرێکی تر بەشدار بوون وەکو:

١. عامر شاکر. ٢. سامان عاسی. ٣. فوئاد موحسین. ٤.عەدنان شوکر.

لە ساڵی ١٩٩٨ تیپی شانۆی خورماتوو شانۆگەری (دکتۆر قۆڵبڕ)یان نمایشکرد کە شانۆگەرییەکی کۆمیدی بوو، لەنووسینی سەلاح عوسمانو دەرهێنانی محەمەد زەنگەنە بوو.

لە ساڵی ١٩٩٩ لە فیستیڤاڵی شانۆی کوردی لە کەرکوك هونەرمەند محەمەد زەنگەنە وەکو دەرهێنەرێکی شارەزا شانۆگەری (چراوك) بۆ تیپی شانۆی هاوڕێیان لە شاری کەرکوك دەردەکات کە لە نووسینی (غەسان کەنەفانی) بوو شاعیری گەورەی کورد شێرکۆ بێکەس کردبووی بە شانۆگەرییەکی شیعری، لە ساڵی (٢٠٠٠) تیپی شانۆی خورماتوو شانۆگەری (کلیلو تراویلکە)یان لە کەرکوك پێشکەشکردووە لە نووسینی سابیر شاکر (مەلول)ە ئەمە خۆی چیرۆك بووە بەڵام دەرهێنەر محەمەد زەنگەنە کردوویەتی بە شانۆگەری، ئەم شانۆگەرییە ئامادە کرا بوو بۆ فیستیڤاڵی شانۆی کوردی لە کەرکوك بەڵام ڕژێمی ئەوسا ڕەزامەندی نادا بۆ سازدانی فیستیڤاڵەکە.

شانۆی کوردی لە خورماتوو دوای پرۆسەی ئازادی عێراقو ڕزگارکردنی خورماتوو، هەریەك لە مامۆستایانی سکرتاریەتو ئەنجومەنی باڵای یەکێتی هونەرمەندانی کوردستان (مامۆستا فەرەیدون دارتاش، مامۆستا جیهاد دڵپاك، مامۆستا زانا مەحمود هەژار) خۆیان گەیاندە شاری خورماتوو سەرجەم هونەرمەندانی شارەکەیان کۆکردەوەو لیژنەی هونەرمەندانی خورماتوویان دامەزراند بە هەڵبژاردنێکی ئازادانە، دوابەدوای

ئەم هەڵبژاردنە هونەرمەندان بە ڕوحێکی تازەوە دەستیان کرد بە چالاکییە هونەرییەکانیان، لە ساڵی (٢٠٠٣) هەڵسان بە تۆمار کردنی قورسێکی (سی دی) کە چەند دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی لە خۆ گرتبوو. جگە لەشاری خورماتوو لە شارەکانی کفری و کەلاریش بڵاوکرایەوە. بەناوی دیاردەکانی کۆمەڵ. لە ساڵی ٢٠٠٤ لیژنەی خورماتووی هونەرمەندانی کوردستان بەشداریان لە یەکەمین فیستیڤاڵی هونەری گەرمیان لە شاری خانەقی کرد. لە ڕۆژانی (١٢-١٤)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٤) بەشانۆگەری (کلیل و تراویلکە) بەشداریان کردو لەم فیستیڤاڵەدا هەموو هونەرمەندانی خورماتوو خەڵاتکران.

لە ڕۆژی (١٤)ی نیسانی ساڵی (٢٠٠٥) لە یادی کارەساتی ئەنفالدا شانۆگەری (گەرمیانێك لە ئەنفال)یان پێشکەش کرد، کە شانۆگەرییەکی زۆر سەرکەوتوو بوو، ئەم شانۆگەرییە لە نووسین و دەرهێنانی هونەرمەند محەمەد زەنگەنە بوو. لە ڕۆژی (١٠)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٥) شانۆگەری (جەژنی شەهید)یان نمایش کرد ئەم شانۆگەرییەش هەر لە نووسین و دەرهێنانی هونەرمەند محەمەد زەنگەنە بوو.

لە ڕۆژی (٩)ی ئاداری ساڵی (٢٠٠٦) لە یادی ڕاپەڕینەکەی شاری خورماتوو هونەرمەندانی خورماتوو بە هاوکاری نووسینگەی خورماتووی کۆمەڵەی ڕووناکبیری وکۆمەڵایەتی کەرکوك شانۆگەری (تابلۆی شارەکەم)یان پێشکەش کرد، لە نووسین و دەرهێنانی محەمەد زەنگەنە بوو.

لە ڕۆژی (١٤)ی نیسانی ساڵی (٢٠٠٦) لەیادی کارەساتی ئەنفالدا هونەرمەندانی خورماتوو شانۆگەری (داستانێ لە ئەنفال)یان پێشکەش کرد لەهۆڵی دواناوەندی ئیبن خەلدون بۆ ماوەی دوو ڕۆژ نمایش کرا ئەم شانۆگەرییە لەئامادەکردنی هونەرمەند بەکر ڕەشیدو دەرهێنانی هونەرمەند محەمەد زەنگەنە بوو.

لە هاوینی ساڵی (٢٠٠٦) هونەرمەندانی خورماتوو درامایەکیان بە ناونیشانی (گەڕانەوە) تۆمار کرد ئەم بەرهەمە لە نووسین ودەرهێنانی هونەرمەند محەمەد زەنگەنە بوو، تایبەت بوو بە هاندانی ئەو گوندنشینانە کە لە شارەکاندا بوونە بە پۆلیس و سەرباز بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە گوندەکانی خۆیان ئاوەدان بکەنەوە ، بۆ جارێکی تر هونەرمەندانی خورماتوو لەساڵیادی شاڵاوەکانی ئەنفالدا لە ڕۆژی (١٤)ی نیسانی ساڵی (٢٠٠٧) شانۆگەری (کەژاوەی خوێن)یان نمایش کرد کە شانۆگەرییەکی (پانتۆمایم) بێدەنگ بوو.

لە ساڵی (٢٠٠٧) هونەرمەندانی خورماتوو تیپێکی شانۆیی منداڵانیان دامەزراندووە بە مەبەستی پێشکەش کردنی چالاکی منداڵان، لە کۆتایی نووسینەوەی ئەم بابەتەدا دەڵێم ئەم هەموو چالاکیانەی هونەرمەندانی خورماتوو پێشکەشیان کردووە، لەچاو شارەکانی دیکەی کوردستان کارێکی سەرکەوتووانەیەو ئەبێ بەرز بینرخێنین و لایەنە پەیوەندیدارەکان دەستی یارمەتیان بۆ درێژ بکەن چونکە ئەم شارەی ئێمە لە چاو شارەکانی تر تایبەتمەندی خۆی هەیەو چەند نەتەوەو مەزهەبێکی تیادا دەژێت، بە درێژایی تەمەنی دەسەڵاتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق ئەم شارە لە دۆخێکی نالەبارو ئاڵۆزدا ژیاوەو ئەمەش وای لە خەڵکەکەی کردووە کە خورماتوو بکەنە لانکەی شۆڕش وبەرگریکردن لە مافەڕەواکانی خۆیان.

*** نسکۆی هونەری شانۆ لەکەرکوك لەنێوان ساڵانی (١٩٧٤-١٩٩٢):**

ئاداری ١٩٧٤، ئاداری ترس و دوو دڵی بوو، ماوەی چوار ساڵ ئاگر بەس کۆتایی هات، دەبوایە ڕێککەوتنامەکە بچێتە قۆناغێکی تر بەڵام بەداخەوە جارێکی تر لوولەی تۆپەکان ڕوویان لە کوردستان کرد شەڕ هەڵگیرسایەوەو شاری کەرکوکیش پێش هەموو شارەکانی کوردستان بەر فشاری زۆر توووند هات، چرای ڕۆشنبیری کوردی لەم شارە بەتەواوی کوژایەوە، هونەرمەندانی ئەم شارە بە هەموو چین و توێژەکانیان بەناچاری هەندێکیان ڕوویان لەشاری سلێمانی کردو هەندێك بۆ هەولێر، پاشان چوونە دەرەوەی وڵات و بەشێکی زۆریان تاوەکو ئێستا بەپەنابەری لەهەندەران دەژین، هونەرمەندانی کەرکوك ئەوانەی هاتن بۆ شارەکانی تری کوردستان یان ئەوانەی چوونە دەرەوەی وڵات کۆڵیان نەدا.

لە شاری هەولێر هونەرمەند (مەهدی ئومێد) وەك نووسەر و دەرهێنەر برەویدا بەشانۆی ئەم شارەو توانی چەند بەرهەمێك پێشکەش بکات لەوانە شانۆگەری (نەخوێندەواری) لە نووسین و دەرهێنانی خۆی لە ساڵی ١٩٧٥ پێشکەشکرا، شانۆگەری (پێشانگا) نووسینی مەهدی و دەرهێنانی تەلعەت سامان لە ساڵی (١٩٧٨) پێشکەش کرا، هەروەها توانی دوو شانۆگەری لەچاپ بدات (مرۆڤ و چاخ و بیر) و (بووکی بەفر)، کە دووەمیان لە ساڵی (١٩٨٠) لە دەرهێنانی تەلعەت سامان پێشکەش کرا.

هەروەها هونەرمەندان عەبدوڵڵا پشدەری و ئیسماعیل سەعید ئەوانیش وەکو دوو ئەکتەر لەشاری هەولێر توانیان ڕۆڵی خۆیان ببینن، (مەحمود گلی)یش وەك ئەکتەرو فەخرەدین نەجاریش وەك دیکۆرکێش لە هەولێر کار دەکات. هونەرمەند (تەحسین شەعبان) وەکو وتمان لە شەستەکان لە کەرکوك بەزمانی عەرەبی ئیشی کردووە دوای ئەوە هاتە هەولێر جارەجارە کاری شانۆیی دەکرد.

هەروەها چەند هونەرمەندێك چوونە شاری سلێمانی و لەوێ توانیان ڕۆڵی خۆیان ببینن لەوانە جەلیل زەنگەنە، جیهاد دڵپاك، عەلی کەریم، ئەو هونەرمەندانە لە شاری سلێمانی چەندان کاری شانۆی سەرکەوتوویان بەرهەم هێناوە لەوانە شانۆگەری (دکتۆر پالمێ) ساڵی ١٩٨٢، شانۆگەری (شیرین و فەرهاد) ساڵی ١٩٨٢، شانۆگەری (هاوارێکی تاساو) ساڵی ١٩٨٣، شانۆگەری (مانگی ئاوابوو)، شانۆگەری (سروودی خۆشنوودی) ساڵی ١٩٨٩.

هەروەها لە شاری سلێمانی چەند هونەرمەندێکی تری کەرکوکی پەیدا بوون کە پێشتر لە کەرکوك کاریان نەکردبوو لەوانە دڵشاد ئەحمەدو حوسێن میسری و ئیسماعیل هەورامی و چەندی تر.

وەکو ڕاستییەك کەرکوکییەکان ڕۆڵی بەرچاویان هەبووە لەبەرەو پێشەوە بردنی شانۆی کوردی. سەبارەت بەو

هونەرمەندانەش کە چوونەتە دەرەوەی وڵاتو هەنگاوی زۆر گەورەتریان هاویشتووەو پتر چاویان کراوەتەوە.

هونەرمەند سەلمان فائق ناسراو بە سەلمان کاکەیی لەدوای نسکۆ چۆتە دەرەوەی وڵاتو توانی بڕوانامەی دکتۆرا لە هونەری شانۆدا بەدەست بهێنێ. سەلمان کاکەیی لە شەستەکان پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغدای تەواو کردووەو لە ساڵی ١٩٧٠-١٩٧٤ دەرهێنەری بەشی هەرە زۆری شانۆگەرییەکانی شاری کەرکوك بووە.

هونەرمەند دکتۆر فازڵ جاف لە ساڵی ١٩٧٨ ئەکادیمیای هونەرەجوانەکانی بەغدای تەواو کردووە وەکو دەرهێنەرێك لەشاری سلێمانی کاری کردووەو لە هەشتاکان چۆتە دەرەوەی وڵات لە ڕووسیا بڕوانامەی دکتۆرای لە شانۆی (مایرهۆڵد) وەرگرتووەو لە لەندەن شانۆگەری (تەرتومن) سۆلێری دەرهێنا، هونەرمەند شوان جەباری وەکو ئەکتەر لەسەر شانۆکانی ئەوروپا کاری کردووە، هەروەها (خەلیل بێکەس) یان (خەلیل مەشخەڵ) کە لە شاری کەرکوك نمایشی کردووە لەگەڵ دەرهێنەر فەتاح خەتاب لەسوید بەشداری شانۆگەری (کلکی مار)ی کرد، هونەرمەند (هاوڕێ حەمە عەلی) ماوەی (١١) ساڵ پتر کە لە ئەڵمانیا دەژیو ئێستا لەشاری (میونیخ) زانستی شانۆ دەخوێنێ، چەند بەرهەمێکی شانۆیی لە (هانۆڤەر)و (شتوتگارد)و (ڤیەننا) پێشکەش کردووە لە ئایاری ساڵی (١٩٩٧)یش لەنواندنی منداڵانی بۆسناو ئەفریقیا شانۆگەری (کاتی بەهار نەیدەویست بێتە زەمین) پێشکەشکرد.

هونەرمەند (مەهدی ئومێدیش) دوای ئەوەی هەوڵێری بەجێ هێشت چووە دەرەوەی وڵاتو لە ڕووسیا توانی دوو فیلم دەربهێنێ گەلە گورگ بە هاوکاری هونەرمەند تەیموری پەتاییو تۆنێل لە دەرهێنانی خۆی.

بەڵام ئەگەر سەیری شانۆی تورکمانی بکەین لەو ماوەیەدا ئەویش تووشی نووچدان هات بەڵام بەو شێوەیەی شانۆی کوردی نەبوو.

بەڵام هەموو چالاکییە تورکمانییەکانی کەرکوك لە پڕێکدا ڕووبەڕووی کارەساتێکی تاڵ بوونەوە، کاتێ هونەرمەندی شانۆیی (حوسێن دەمیرچی) کە بە شانۆی (تەمبەل عەباس) بەناو بانگ بوو لەناوچوو، ئەو هونەرمەندە دوای دەستگیر کردنی لە ئەمنی کەرکوك لەژێر ئەشکەنجەو ئازارا گیانی سپارد، پاشان جەستەکەی لە نزیك تەلەفزیۆنی کەرکوکی جاران فڕێدرا.

ئەم ڕووداوە شکستێکی گەورەی بۆ تیپی نەتەوەی تورکمانی دروستکرد، ئەو تیپەی کە هونەرمەندی شەهید حوسێن دەمیرچی، (٢٣) ساڵ ئەندامی بوو، ئەوە بوو لە دەرئەنجامی ئەو کارەساتە تاڵەدا زیاتر لە (٢٠) ساڵ ئەو تیپە دووچاری بێدەنگییەکی کوشندە بۆوە.

بەڵام دواتر ڕۆژگار بەزەیی بەشانۆی تورکمانیدا هاتەوەو دوای پێشکەش کردنی داواکارییەك لەلایەن سەندیکای هونەرمەندانی کەرکوك ڕەزامەندی وەرگیرا لەسەر پێکهێنانی تیپێکی شانۆیی تورکمانی بەناوی (تیپی قەڵا بۆ نواندن) و لەسەرەتاشدا شانۆگەری (مجالا) پێشکەش کرا. ئەم شانۆگەرییە لەنووسینی سەلاح نوریو دەرهێنانی نیهایەت جەلالی بوو.

مانگێك دوای پێشکەشکردنی ئەم شانۆگەرییە شانۆی (صومباتلی گونلەر)ی (جەلال بولات)و دەرهێنانی (یاوز فائق) پێشکەش کرا، لەئەیلولی (١٩٩٢)ش شانۆی (ئیکو ی (نەسرەت مەردان)و لەدەرهێنانی ئەحمەد قوشچی ئۆغلۆ پێشکەش کرا.

*** لەنێوان ساڵانی ١٩٩١-٢٠٠٣ ئەم شانۆگەرییانە پێشکەش کرا:**

(التبادل)، نووسینی (وەلید ئیخلاسی)، دەرهێنانی (عەبدولڕەزاق محەمەد)، ساڵی (١٩٩١).

(حاجی یادگار)، نووسینی (ئەیوب ئەبو زەید)، دەرهێنانی (سەلاح شوانی)، ساڵی (١٩٩١)، تیپی (ئاشتی) لەسەر شانۆی ناوەندی موسەڵلا نمایشی کردووە.

(موچالا)، نووسینی (سەلاح نەورەس)، دەرهێنانی (عەواد عەلی)و (نیهایەت جەلالی)، ساڵی (١٩٩٢).

(دکتۆری قۆلبڕ)، نووسینی (نەوزاد محەمەد)، دەرهێنانی (سەلاح شوانی)، ساڵی (١٩٩٢)، تیپی (ئاشتی) لەسەر شانۆی ناوەندی موسەڵلا نمایشی کردووە.

(ڕەشید کولە ڕەزا)، ئامادەکردنی (شەمسەددین تورکمن ئۆغلۆ)، دەرهێنانی (عیبادەڵلا عەبدوڵلا)، ساڵی (١٩٩٣).

(بازاڕی کچ فرۆشتن)، نووسینو دەرهێنانی (سەلاح شوانی)، ساڵی (١٩٩٣).

(اهمس في اذني السليمة)، نووسینی (ویلیەم هانلی)، دەرهێنانی (عەبدولڕەزاق محەمەد)، ساڵی (١٩٩٤).

(ئاغای زۆردار)، نووسینی (چالاك زەنگەنە)، دەرهێنانی (سیروان بێلانە)، ساڵی (١٩٩٤)، تیپی (ئاشتی) لەسەر شانۆی ناوەندی موسەڵلا نمایشی کردووە.

(کەبابخانەی عەبە فەرتەنە)، نووسینی (سەلاح شوانی)، دەرهێنانی (سیروان بێلانە)، ساڵی (١٩٩٤)، تیپی (ئاشتی) نمایشی کردووە.

(کۆمپانیای بەتران)، نووسینی (سەلاح شوانی)، دەرهێنانی (سیروان بێلانە)، ساڵی (١٩٩٥)، تیپی (ئاشتی) لەسەر شانۆی پەیمانگای تەکنیکی کەرکوك نمایشی کردووە.

(هونەرمەندان)، نووسینی (فەرهاد سۆرانی)، دەرهێنانی (عوسمان چاوشین)، ساڵی (١٩٩٥)، تیپی (هاوڕێیان) لەسەر شانۆی ناوەندی گەنجانی کەرکوك نمایشی کردووە.

(بدور والقصر المسحور)، نووسینی (فازڵ حەلاق)، دەرهێنانی (هاشم نازم)، لەسەر شانۆی (سینەمای قەڵا) نمایش کرا، ساڵی (١٩٩٦).

(افتراضات واهية)، نووسینی (قاسم حەمید فنجان)، دەرهێنانی (عەبدولڕەزاق محەمەد)، ساڵی (١٩٩٦)، لەسەر شانۆی (المسرح الوطني) لە بەغدا لە ساڵی (١٩٩٩) نمایش کرا.

(پرسیار)، نووسینی (سەلاح شوانی)، دەرهێنانی (سیروان بێلانە)، ساڵی (١٩٩٦)، تیپی (ئاشتی) نمایشی کردووە.

(ڕۆژگاری ڕەش)، نووسینی (فەرهاد سۆرانی)، دەرهێنانی

(ئیدریس حەفتەغاری)، سالّی (١٩٩٦)، تیپی (هاوڕێیان) لەسەر شانۆی ناوەندی گەنجانی کەرکوك نمایشی کردووە.

(فریشتەی ئەو)، نووسین و دەرهێنانی (وەلید عەباس)، بەشی یەکەم لە سالّی ١٩٩٦و بەشی دووەمی لە ١٩٩٨ دا پێشکەش کراوە.

(قیقلە بوغاز)، نووسینی (فازلّ حەلاق)، دەرهێنانی (محەمەد قاسم)، (١١)ی کانوونی دووەمی سالّی (١٩٩٧).

(خیول)، نووسینی (ڕەعد موتەشەر)، دەرهێنانی (عەبدولڕەزاق محەمەد)، سالّی (١٩٩٧)، لەسەر شانۆی (المسرح الوطني) لە بەغدا لە سالّی (٢٠٠٠) نمایش کرا.

(ئۆتێلی نمرە بیست)، نووسینی (کەریم زەمەد)، دەرهێنانی (عەباس عەلی)، سالّی (١٩٩٧)، تیپی سەندیکای هونەرمەندان لەسەر شانۆی چالاکی قوتابیان نمایشی کردووە، لە هەمان سالّ تیپی (ئاشتی دووبارە نمایشی کردووە لەسەر شانۆی (مرکز شباب کرکوك).

(فرمێسکی هەڵە)، نووسین و دەرهێنانی (سەلاّح شوانی)، سالّی (١٩٩٧)، تیپی (ئاشتی) لەسەر شانۆی (جمعیة الثقافة الكردیة) لە بەغدا نمایشی کردووە.

(تاوان)، نووسین و دەرهێنانی (عەباس عەلی)، سالّی (١٩٩٧)، تیپی (القلعة) لەسەر شانۆی چالاکی قوتابخانەکان نمایشی کردووە، لە خورماتوویش نمایش کراوە لە هەمان سالّ.

(فریشتالی ئەو)، لە سێ بەشدا، نووسین و دەرهێنانی (وەلید عەباس)، سالّی (١٩٩٨).

(بارێزە)، نووسین و دەرهێنانی (سیروان بێلانە)، سالّی (١٩٩٨)، تیپی (ئاشتی) لەسەر شانۆی چالاکی قوتابخانەکان نمایشی کردووە.

(فس فس پالەوان)، نووسینی (نەوزاد کاکەیی)، دەرهێنانی (عارف مەعروف)، سالّی (١٩٩٨) سەندیکای هونەرمەندان لەسەر شانۆی چالاکی قوتابخانەکان نمایشی کردووە.

(سومباقلی گونلەر)، نووسینی (جەلال پۆڵات)، دەرهێنانی (یاووز فایق)، سالّی (١٩٩٩).

(ئیکۆ)، نووسینی (نەسرەت مەردان)، دەرهێنانی (محەمەد قوشچۆ ئۆغلۆ)، سالّی (١٩٩٩).

(دوقتور دایی باقی)، لە دوو بەش، نووسین و دەرهێنانی (شەمسەددین تورکمن ئۆغلۆ)، سالّی (١٩٩٩).

(داینین تۆیی)، نووسین و دەرهێنانی (فازلّ حەلاق)، (١١) ی ئاداری سالّی (١٩٩٩).

(نسخة منه الی...)، نووسینی (ڕەعد موتەشەر)، دەرهێنانی (عەبدولڕەزاق محەمەد)، سالّی (١٩٩٩).

(ڕۆژێکی نوێ)، سالّی (١٩٩٩)، لە فیستیڤالّی تیپی (ئاشتی) لەگەلّ سەندیکای هونەرمەندان نمایش کراوە.

(ڕووبار)، سالّی (١٩٩٩)، لە فیستیڤالّی تیپی (ئاشتی) لەگەلّ سەندیکای هونەرمەندان نمایش کراوە.

(هەتا کەی)، سالّی (١٩٩٩)، لە فیستیڤالّی تیپی (ئاشتی) لەگەلّ سەندیکای هونەرمەندان نمایش کراوە.

(کازێوە)، سالّی (١٩٩٩)، لە فیستیڤالّی تیپی (ئاشتی) لەگەلّ سەندیکای هونەرمەندان نمایش کراوە.

(چیم لە دەست دێ)، سالّی (١٩٩٩)، لە فیستیڤالّی تیپی (ئاشتی) لەگەلّ سەندیکای هونەرمەندان نمایش کراوە.

(خوا وەکیلە)، نووسین و دەرهێنانی (سەلاّح شوانی)، سالّی (١٩٩٩)، تیپی شانۆی (ئاشتی) نمایشی کردووە.

(شۆستەی برینەکانم)، نووسین و دەرهێنانی (سیروان بێلانە)، سالّی (١٩٩٩)، شانۆگەرییەکی (مۆنۆدراما) بوو، تیپی (ئاشتی) لەسەر شانۆی باخچەی (الود) نمایشی کردووە.

(سێبەری کەرەکە) نووسین و دەرهێنانی (سەلاّح شوانی)، سالّی (١٩٩٩)، تیپی (ئاشتی) لەسەر شانۆی باخچەی (الرحاب) نمایشی کردووە.

(هناءات متکررة)، نووسینی (ڕەعد موتەشەر)، دەرهێنانی (زیائەلقەهار)، سالّی (٢٠٠٠).

(بلاد خارج السور)، نووسینی (ڕەعد موتەشەر)، دەرهێنانی (جەعفەر موسا)، سالّی (٢٠٠٠).

(قوشباز ئەراودی)، نووسین و دەرهێنانی (شەمسەددین تورکمن ئۆغلۆ)، لەسەر شانۆی (سینەمای قەلاّ) نمایش کرا، سالّی (٢٠٠٠).

(ئەمریکادا)، نووسینی (محەمەد هاشم)، دەرهێنانی (عیبادەللاّ عەبدوللاّ)، سالّی (٢٠٠٠).

(سعید المحامي)، نووسین و دەرهێنانی (سەلاّح شوانی)، سالّی (٢٠٠٠)، تیپی (ئاشتی) نمایشی کردووە.

(اللامبالي داخل البرمیل)، نووسین (عومەر عەلی ئەمین)، دەرهێنانی (سیروان بێلانە)، سالّی (٢٠٠٠)، ئەم شانۆگەرییە بۆ مندالاّن بوو، تیپی (ئاشتی) لەسەر شانۆی (مرکز الشباب) نمایشی کردووە.

(ساقینین کوزی)، نووسینی (عەبدولڕەزاق محەمەد)، وەرگێڕان (سیروان ساچی ئوزون)، دەرهێنانی (نیهایەت جەلالی)، سالّی (٢٠٠١).

(فرادیس)، نووسینی (قاسم حەمید فنجان)، دەرهێنانی (عەبدولڕەزاق محەمەد)، سالّی (٢٠٠١)، بەشداری کردووە لە فیستیڤالّی (المسرح التجریبي) بەغدا.

(بس تعالوا)، نووسینی تیپی (ئاشتی)، دەرهێنانی (سیروان بێلانە)، سالّی (٢٠٠١)، تیپی (ئاشتی) لەسەر شانۆی باخچەی (الرحاب) نمایشی کردووە.

(الجیلي)، نووسینی (محەمەد خدر)، دەرهێنانی (سیروان بێلانە)، سالّی (٢٠٠١)، تیپی (ئاشتی) لەسەر شانۆی (مرکز شباب کرکوك) نمایشی کردووە.

(مهر الملح)، نووسینی (ئامینە مەحمود)، دەرهێنانی (سەلام زەنگەنە)، سالّی (٢٠٠١)، تیپی پەیمانگای تەکنیکی کەرکوك لەسەر شانۆی (شباب کرکوك) نمایشی کردووە.

(لا یجوز هذا)، نووسین و دەرهێنانی تیپی (ئاشتی)، سالّی (٢٠٠١)، لەسەر شانۆی باخچەی (الرحاب) نمایش کراوە.

(وهم یعدون الخراب)، نووسینی (ڕەعد موتەشەر)، دەرهێنانی (عەبدولڕەزاق محەمەد)، سالّی (٢٠٠٢).

(ئۆیاخە سولتّانی)، نووسینی (عەبدولڕەزاق محەمەد)، وەرگێڕانی (سیروان ساچی ئوزون)، دەرهێنانی (یاووز

فایق)، ساڵی (٢٠٠٢).

(اغنیة التم)، نووسینی (تشیخۆف)، دەرهێنانی (سەلام زەنگەنە)، ساڵی (٢٠٠٢)، تیپی پەیمانگای تەکنیکی کەرکوك لەسەر شانۆی (الشباب) نمایشی کردووە.

(حدود الخوف)، نووسینی (کاردۆ محەمەد)، دەرهێنانی (سیروان بێلانە)، ساڵی (٢٠٠٢)، تیپی (ئاشتی) لەسەر شانۆی (مرکز الشباب) نمایشی کردووە.

(کۆچپێکردنی خۆزگەکان)، نووسینی (هێلین کیلەر)، دەرهێنانی (سیروان بێلانە)، ساڵی (٢٠٠٢)، تیپی (ئاشتی) لەسەر شانۆی (مرکز الشباب) نمایشی کردووە.

(عەلاو جولاو)، لە دوو بەشدا، نووسین و دەرهێنانی (عیبادەڵڵا عەبدوڵڵا).

(ئۆچ قوریات)، ئامادەکردن و دەرهێنانی (عیبادەڵڵا عەبدوڵڵا).

(عمش)، لە دوو بەشدا، ئامادەکردنی (وەجدی کدك)، دەرهێنانی (محەمەد قوشچو ئۆغلۆ).

(یالانچیلار جایخاناسی)، دەرهێنانی (عیبادەڵڵا عەبدوڵڵا)، لەسەر شانۆی (سینەمای قەڵا) نمایش کرا.

(زناو)، ئامادەکردنی (شەمسەددین تورکمن ئۆغلۆ)، دەرهێنانی (محەمەد قوشچی ئۆغلۆ).

(تالحسیزلەر محەلەسی)، نووسین و دەرهێنانی (وەلید عەباس).

(کویومون)، نووسینی (محەمەد هاشم)، دەرهێنانی (محەمەد قوشچو ئۆغلۆ).

(الجسر)، ئامادەکردنی (فازڵ حەلاق)، دەرهێنانی (محەمەد قاسم)، بەشداری کردووە لە فیستیڤاڵی قوتابیان بۆ شانۆ لە وەزارەتی پەروەردە لە پارێزگای دیوانییە.

(بیزم محلە)، نووسین و دەرهێنانی (محەمەد قوشچی ئۆغلۆ).

(مەلا نەسرەدین نین صون سفری)، نووسین و دەرهێنانی (وەلید عەباس).

(عەللاو جەلاو بازاڕی)، نووسین و دەرهێنانی (عەبدولڕەزاق محمەد عەزین).

(یارن باشقە کوندور)، دەرهێنانی (ئەحمەد قوشچی ئۆغلۆ).

(دکتۆر باقی معاینە خانەسی)، نووسین و دەرهێنانی (شەمسەدین تورکمن ئۆغلۆ).

(های.. های کەرکوك)، نووسین و دەرهێنانی (محەمەد خدر).

*** فیستڤاڵی شانۆی کوردی لە ساڵی (١٩٩٩):**

لەچوارچێوەی هیمەت و چالاکی هونەرمەندانی شاری کەرکوك و شەیدایانی شانۆی کوردی لەڕۆژانی (٩-١١)ی ئایاری ساڵی (١٩٩٩)دا لەسەر تەختەی شانۆی هۆڵی چالاکی قوتابخانەکانی شاری کەرکوك و بەدرێژایی سێ ڕۆژ، دەست بەچالاکییەکانی یەکەم فیستڤاڵی شانۆی کوردی کرا بەبەشدار بوونی تیپە شانۆییەکانی سەندیکای هونەرمەندانی پارێزگای کەرکوك و کەناڵی کوردی و تیپی هاوڕێیان و تیپی

فیستیڤاڵی یەکەمی شانۆ لە کەرکوك

یەكێك لە شانۆگەرییەكانی كەركوك لە هەشتاكان

شانۆی قەزای مەخموور.

یەكەم ڕۆژ دەستكرا بەنمایش كردنی دوو شانۆگەری بەناونیشانی (كەلەسەر) كە مۆنۆدرامایەك بوو، لەلایەن تیپی كەناڵی كەركوك لە نووسینی (محەمەد خدر)و وەرگێڕانی (شكور سالەیی) بوو، دەوری سەرەكی هونەرمەند (عادل چاوشین) بوو سەرەڕای هونەرمەندان (محەمەد عەزیزو نەشئەت حوسێن‌و فەهمی حەلاق‌و یوسف محەمەدو سەلاحەدین حوسێن) بەدەنگ دەوری خۆیان بینی.

لەدوایدا شانۆگەری (فس..فس پاڵەوان) لەلایەن تیپی سەندیكای هونەرمەندانی شاری كەركوك پێشكەش كرا، ئەم شانۆگەرییە لە نووسینی نەوزاد یوسف كاكەیی‌و دەرهێنانی عارف مەعروف‌و هونەرمەندان یوسف چاوشین‌و درەخشان محەمەدو لوقمان عومەرو عەزیز عومەرو یوسف ئەسكەندەرو هاوار تاڵەبانی‌و شەهید لایق كاكەیی‌و هیوا گەرمیانی‌و كەماڵ جەمال‌و فەرهاد یوسف‌و دلێر چالاك بەشدارییان كرد.

ڕۆژی دووەم پێكهاتبوو لە دوو شانۆگەری، یەكەمیان بەناوی (یارییەكی ئازاراوی) لەلایەن تیپی سەندیكای هونەرمەندانی كەركوك، نووسینی یوسف ئەلعانی، وەرگێڕانی نەوزاد كاكەیی، دەرهێنانی عارف مەعروف، (شێتەكانی ئەم ڕۆژگارە)ش دووەم شانۆگەری بوو كە لەلایەن هونەرمەندانی قەزای مەخموور پێشكەش كرا، ئەم شانۆگەرییە لەنووسینی (دیمتری باساتاس)، وەرگێڕانی ئازاد حەمە شەریف، دەرهێنانی سۆران قارەمان.

سێیەم ڕۆژی فیستڤاڵەكە شانۆگەری (چراوگ) پێشكەش كرا لەلایەن تیپی هاوڕێیان، دەرهێنانی محەمەد زەنگەنەو هەریەك لە عەزیز عومەرو فەرەیدون هەمەوەندی‌و دلێر چالاك‌و هیوا گەرمیانی‌و دلێر عومەرو عەباس دوزلاوی‌و ئیدریس حەفتەغاری‌و هاشم عادل‌و ئەحمەد حەفتەغاری‌و حیسام نەجم بەشدارییان كرد.

*** شانۆگەری لەدوای پرۆسەی ڕزگار كردنی عێراق:**

هەرچەندە كەركوك بۆ ماوەیەكی زۆرە ڕزگار كراوە لە چنگی ڕژێمی بەعس‌و گەلێك لایەنی ڕۆشنبیری‌و چالاكی لە كەركوكدا برەوی سەندووەو بەڵام هێشتا شانۆ لە ئاستی پێویستدا نییەو هەنگاوی جدی نەنراوەو تا ئێستا دەقێكی سەركەوتووانە نمایش نەكراوە لەسەر ئاستی ئەوەی لەحەفتاكاندا دەوری گەورەی بینی. ئەویش خۆی دەبینێتەوە لەچەند هۆكارێك:-

١. جێگر نەبوونی باری سیاسی لە كەركوك‌و عێراق كە فاكتەرێكی گرنگە بۆ گەشە كردنی باری ڕۆشنبیری لە شارەكەدا، ئەویش لەوەدا خۆی دەبینێتەوە كە ئاستی ئەو تیپە شانۆیانە پشتگیرییەكی گەورە نەكراوە تا بەوەی بگاتە ئاستێكی بەرچاو.

٢. نەبوونی دەقی سەركەوتوو بۆ پێشكەش كردنی شانۆ ئەویش لەوەی نووسەری شانۆ لە شارەكەدا زۆر كەمەو وەكو

نەبوون وایە.

٣. نەگەڕانەوەی بەشێکی زۆری هونەرمەندانی شانۆ لە سلێمانیو هەولێرو هەندەران، هەریەکە لەمانە ئاڵاهەڵگری شانۆ بوونە لە کەرکوکدا.

٤. بایەخدان بەکاری ڕۆژنامەوانی زیاتر کاریگەری لەسەر شانۆ لەکەرکوکدا هەبووەو، تاڕادەیەك بایەخی پێنەدراوە.

٥. نەبوونی هونەرمەندی بەتوانای شانۆ لەبوارەکەدا تا بەوەی گیانێکی خۆبەخشی شانۆیی هەبێت.

٦. نەبوونی کۆڕی شانۆیی بۆ تاوتوێ کردنی لایەنە چاكو خراپو ئاستەکانی شانۆ لە کەرکوکدا کە ئەمیش لە هۆکاری جێگر نەبوونی باری سیاسیدا خۆی دەبینێتەوە.

*** ئەو تیپە هونەرییانەی لەناو کەرکوکدا ڕۆڵیان بینیووە (١٩٨٩ - ٢٠١٩):**

گەلێك تیپی شانۆیی لەکەرکوك دامەزرا لەکاتی ڕژێمی بەعس تا ڕووخاندنو ڕزگارکردنی عێراق لەدەستی ڕژێمی بەعس کە هەندێك لەو تیپانە کوردی بوو هەندێکی تورکمانی بوو.

هەر چەندە ئەم تیپانە لەڕووی هونەرییەوە گەلێك کەمو کوڕییان هەبوو، بەڵام توانایەکی گەورەیان بینی لەخزمەت شانۆ لەشارەکەدا هەر چەندە هەندێکی لە ئاستێکی بەرچاو نەبووە.

لەو تیپانەی کە لەکەرکوکدا برەویان هەبوو، تیپی شانۆی تێکۆشانو تیپی شانۆی ئاشتیو هەندێك تیپی شانۆی تورکمانی.

*** تیپی شانۆی (تێکۆشان):-**

لە لووتکەی داپڵۆسینو تۆقاندنی بەعسیەکان هەندێ قوتابی بەهرەمەندو چاونەترسو کۆڵنەدەرو نیشتیمان پەروەر لە (٢١)ی ئاداری ساڵی (١٩٨٩) لەئامادەیی ئازادی (سەورە)ی جاران تیپێکی شانۆییان دامەزراند کە دەستەی دامەزرێنەری تیپەکە ئەمانە بوون:

١. وریا شەهاب محەمەد ئەمین ناسراو بەوریا کەرکوکی.
٢. ئەحمەد عەبدوڵڵا نوری ناسراو بە ئەحمەد هەستیار.
٣. شۆڕش حەمید.

هەر لەسەرەتاوە لەبارودۆخەکە دووناو لەتیپەکە نرا ناوێکی ڕووکەشو ئاشکراو ناوێکی نهێنی کە مەبەست بوو ناوەکە وابێت.

ناوی ڕووکەشو ئاشکرای تیپەکە تیپی (وریا کەرکوکی) شانۆیی بوو هەرچەندە نازناوی وریا کەرکوکی ناوە نهێنیەکەشی ناوی تیپی (تێکۆشان) بوو کە ئەوەیان مەبەست بوو.

یەکەم بەرهەمی ئەم تیپە پڕ لە سەروەریو شانازییە لە ڕۆژی پێنج شەممە ڕێکەوتی (١٣)ی نیسانی ساڵی (١٩٨٩) کاتژمێر (١١)ی سەر لەبەیانی لە هۆڵی ئامادەیی ئازادی نمایش کرا لەژێر سەر دێری (هاوڕێکانی عەبە).

ئەم بەرهەمە بیرۆکەی ئەحمەد هەستیارو سیناریۆو حیواری وریا شەهابو دەرهێنانی شۆڕش حەمید بوو لە نواندنی ئەم بەڕێزانە بوو:

١. وریا شەهاب لەڕۆڵی شێرکۆی قوتابی.
٢. ئەحمەد هەستیار لە ڕۆڵی مامۆستا هیوا.
٣. شۆڕش حەمید لە ڕۆڵی عەبە سەر خۆش.
٤. شەماڵ جەلال کاکل میوانی بەرهەم.

ئەم شانۆگەرییە دواتر زیاتر هەشت جار دووبارە کراوەتەوە دواییەنیان لە ١٩٩٩ بوو ئەم هونەرمەندانە لە نمایش کردنی ئەم شانۆگەرییە بەشداریان کردووە بە درێژایی دووبارە کردنەوەی هونەرمەندان، سەربەست ئەفەندی، بەختیار مەجید، نەوزاد قادر، جەلیل نەریمان، کامەران فەتاح، حەمزە قاسم، سەگڤان، ئەحمەد چاوڕەش.

* لە ساڵی ١٩٩٠ تیپی وریا کەرکوکی یاخود تێکۆشان شانۆگەری (مانگی هەڵنەهاتوو)ی نمایش کرد ئەم شانۆگەرییە لەنووسینو دەرهێنانی خەیروڵڵا محەمەد تاهیر ناسراو بە ئەکرەم جەباری بوو لەنواندنی ئەم بەڕێزانە بوو:

مەریوان، سالار تالیب، وریا کەرکوکی، کوردۆ محەمەد نیعمەت، نورەددین تەها حوسێن.

* لە ساڵی ١٩٩١ شانۆگەری (ساختەچیەکان) لەنووسینو دەرهێنانی وریا شەهاب لەنواندنی وریا شەهاب، سەربەست ئەفەندی، شێرزاد عەبدوڵڵا، سامان عەلی.

* لە ساڵی ١٩٩٢ شانۆگەری (ئەنجامی دواڕۆژ) نووسینی هۆشیار مەجید، پیاچوونەوەو دەرهێنانی وریا شەهاب. لەنواندنی هۆشیار مەجید، وریا شەهاب، گۆران باهیر، ئاکۆ مەلا مەهدی، کامەران فەتاح.

* هەر لە ساڵی ١٩٩٢ شانۆگەرییەکانی مستەر کلینو دیسکۆڤەری کە هەردووکی لە ئامادەکردنو دەرهێنانو نواندنی سەربەست ئەفەندی بوو.

* هەر لە ساڵی ١٩٩٢ شانۆگەری (حەلەقو بەلەق) لە فیکرەو ئامادەکردنو نواندنی سەربەست ئەفەندی بوو لە دەرهێنانی کاوە ئەجاڕ بوو.

* هەر لە ساڵی ١٩٩٢ شانۆگەری (بووكو زاوا) لە ئامادەکردنو دەرهێنانی شەماڵ جەلال کاکل، نواندنی سەربەست ئەفەندیو حەمزە قاسم بوو.

* لە ساڵی ١٩٩٣ زۆربەی ئەندامانی تیپەکەیان پەرتەوازە بوون لە هەولێرو مووسڵو بەغداو تکریتو بێجی تاکو درێژە بەخوێندنی پاش ئامادەیی بدەن لە سەرجەم ئەو شارانەش شانۆ نمایش کراوە.

لە هەمان کاتدا بەهاوکاری هۆشیار مەجید کۆمەڵێ بەهرەی تازە هاتنە ناو تیپەکەوە درێژەیان بەخەباتی شانۆیی تیپەکە دا.

* لە (١)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٩٤) تیپەکەیان بەقۆناغێکی نوێی دامەزراندن تێپەڕی ئەمجارە ئەم برادەرانە لەم قۆناغی نوێی ئەم دامەزراندنە ڕۆڵیان هەبوو:

(وریا شەهاب، دلێر محەمەد عەلی ناسراو بە (دلێر کوردۆست)، ئەحمەد عەبدوڵڵا عەبدولقادر ناسراو بە (ئەحمەد زەنگەنە)، شەماڵ پەروەر، ڕەمەزان قارەمان.

* لە (١)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٩٤) بە ئاشکرا

کردنی ناوی نهێنی تیپەکە بەناوی تیپی تێکۆشان بۆ ماوەی چوار ڕۆژی بەردەوام لەسەر هۆڵی سەنتەری گەنجانی شۆڕیجە بە زمانی کوردیو بەناو شاری کەرکووکەوە شانۆگەری (دەعوەتەکەی وەستا کشمیش) نمایش کرا ئەم شانۆگەرییە لە نووسینی وریا شەهابو دەرهێنانی دلێر کوردۆست بوو لە نواندنی:

١ – وریا شەهاب لەڕۆڵی بەگ.
٢ – عوسمان لەتیف لەڕۆڵی وەستا کشمیش.
٣ – دلێر کوردۆست لەڕۆڵی حەمەش ابو قامە.
٤ – عەباس غەمبار لەڕۆڵی کوردۆ.
٥ – شاکر عەلی ئەحمەد لەڕۆڵی چیا.
٦ – سامی عەزیز ئەلبەیاتی لەڕۆڵی ئەفسەر.
٧ – ئاری محەمەد عەلی لەڕۆڵی بۆیاخچی.
٨ – ڕەمەزان قارەمان لەڕۆڵی پۆلیس.
٩ – سالح رەنجەڕۆ لەڕۆڵی پۆلیس.
١٠ – (ئەحمەد زەنگەنە، خالید شبیب، نیهاد لەتیف، فەخرەددین، ئاڤان شەهاب) لەڕۆڵی خەڵکی شار.

* لە ساڵی ١٩٩٥ شانۆگەری (پیاوی نمونەیی) لە ئامادەکردنو دەرهێنانی وریا شەهاب لەنواندنی:

١– وریا شەهاب لەڕۆڵی (عومەری نووسەر).
٢– بەختیار مەجید لە ڕۆڵی پارێزەر.
٣– نەوزاد قادر لەڕۆڵی ئەندازیار.
٤– عوسمان لەتیف لەڕۆڵی ڕەجب بەگ.

ئەم شانۆگەرییە لە هۆڵی (سەنتەری گەنجانی شۆڕیجە) نمایش کرا.

* هەر لەساڵی ١٩٩٥ شانۆگەری (من چی بکەم) لەنووسینو دەرهێنانی هۆشیار مەجید لەنواندنی بەختیار مەجید، نەوزاد قادر، جەلیل نەریمان، ئەحمەد چاوڕەش.

ئەم شانۆگەرییە لەهۆڵی (ئامادەیی ئازادی) نمایش کرا.

* هەر لە ساڵی ١٩٩٥ شانۆگەری (مستشفى المجانين – نەخۆشخانەی شێتان) لە ئامادەکردنو دەرهێنانو نواندنی ئەحمەد زەنگەنە بەزمانی عەرەبی لە هۆڵی (پەیمانگای هونەری حەویجە) نمایش کرا.

* هەر لەساڵی ١٩٩٥ شانۆگەری (قوتابخانەکەی مامۆستا نەریمان) لە نووسینی وریا شەهابو دەرهێنانی محەمەد چاوسەوزو لەنواندنی محەمەد چاوسەوزو فەخرەدین نامیقو شوان شوانی بوو لە هۆڵی (ئامادەیی موسەڵلا) نمایش کرا.

* لە ساڵی ١٩٩٦ شانۆگەری (موشتەریەکانی حاجی فەتاح) لەنووسینو دەرهێنانی هۆشیار مەجید لەنواندنی بەختیار مەجید، نەوزاد قادر، جەلیل نەریمان، ئەحمەد چاوڕەش لەهۆڵی ئامادەیی ئازادی نمایش کرا.

* لە ساڵی ١٩٩٧ شانۆگەری (وەسیەتەکەی دایکم) لەنووسینی هۆشیار مەجیدو دەرهێنانی جەلیل نەریمان لەنواندنی یوسف حەسەن نافز، بەختیار مەجید، نەوزاد قادر بوو لەهۆڵی سەنتەری (لاوانی کەرکوك) لەڕێگای بەغدا نمایش کرا.

* هەر لە ساڵی ١٩٩٧ لەهەمان هۆڵ شانۆگەری (کەلەپووری کوردەواری) نمایش کرا لەئامادەکردنی بەختیار مەجیدو دەرهێنانی جەلیل نەریمانو نواندنی بەختیار مەجیدو نەوزاد قادر، سەگڤان.

* لە ساڵی ١٩٩٨ هەردوو شانۆگەری (کەلەپووری کوردەواری)و (هاوڕێکانی عەبە) دووبارە نمایش کرایەوە لەهۆڵی (پەیمانگای هونەری کەرکوك) لە ئامادەکردنو دەرهێنانی هاوبەشو نواندنی هەردوو ئەکتەری دوانە بەختیار مەجید، نەوزاد قادر بوو.

* لە ساڵی ١٩٩٩ شانۆگەری (قوتابخانەی ژیان) لە نووسینی هۆشیار مەجید، دەرهێنانی جەلیل نەریمان لەنواندنی بەختیار مەجید، نەوزاد قادر، ئەحمەد چاوڕەش، کامەران عەبدە، جەلیل نەریمان لە هۆڵی (پەیمانگای هونەری کەرکوك) نمایش کرا.

* لەساڵی ٢٠٠٠ دووبارە نمایشەکانیان گەڕاندەوە ناو قوتابخانە لەبەر هۆکاری تایبەت بەهونەرمەندەکانو بارودۆخی سیاسی نالەباری شارەکە.

* لە ساڵی ٢٠٠٠ شانۆگەری دەریای عاشقان لە نووسینی وریا شەهابو دەرهێنانی ئەحمەد هەستیار کە دواتر لەدوو توێی کتێبێك چاپکرا.

* لە ساڵی ٢٠٠١ شانۆگەری (ژوانـی عەشقداری) لەنووسینی وریا شەهابو دەرهێنانی ئەحمەد هەستیار، ئەمیش دیسانەوە لە ٢٠٠٥ لەدووتۆی کتێبێك چاپکرا.

* لەساڵی ٢٠٠٢ شانۆگەری (شۆڕشی عاشقان) لە نووسینی وریا شەهابو دەرهێنانی ئەحمەد هەستیار.

* لە سالی ٢٠٠٣ پاش ڕووخانی ڕژێم ڕاستەوخۆ پاش مانگێك لە فەزایەکی فراوان، ڕاستەوخۆ لەگۆڕەپانی گەڕەکی ئیسکان کە ئێستاکە وا تەلاری ڕۆشنبیری کەرکوکە، تیپی شانۆی تێکۆشان شانۆگەری (بروسکەی ئازادی) لەنووسینی وریا شەهاب ئامادەکردنی ئەکرەم جەباری نواندنی دلێر عەبدوڵڵا دەرهێنانی ئەحمەد هەستیار نمایشکرد.

* لە ساڵی ٢٠٠٤ شانۆگەری (کەرکوك دڵی کوردستانە) لە نووسینی وریا شەهابو دەرهێنانی هاوبەشی وریا شەهابو ئەحمەد هەستیار تێکستەکەی ئامادە کراو ئەو کاتە هونەرمەند لالۆ ڕەنج زۆر یارمەتیانیدا تاکو لەڕێی سەتەلایتی کوردستانەوە بیگەیەننە بەرهەم بەڵام بەهۆی سەرقاڵی هونەرمەندی ناوبراو گەڕانەوەی بۆ پیرمامو دواتر هاتنەوەی وەك بەرپرسی نوسینگەی کەرکوکی سەتەلایتی کوردستان پرۆژەکە بە ئەنجام نەگەیشت.

* لە ساڵی ٢٠٠٥ شانۆگەری (ترحێو جەنابی سەدام) لە نووسینو دەرهێنانی وریا شەهاب لەنواندنی ئەم ئەکتەرانە بوو:

١. وریا شەهاب لەڕۆڵی ڕاستی.
٢. هانۆ کەریم لەڕۆڵی سەدام.
٣. هۆزان محەمەد عەلی لەڕۆڵی عیزەت ئەلدوری.
٤. گۆران ئەحمەد لەڕۆڵی دز.
٥. ڕاستی ئەحمەد لە ڕۆڵی بیناساز.
٦. هەڵۆ جەلال لەڕۆڵی نانەوا.
٧. بورهان محەمەد لەڕۆڵی هاووڵاتی.

٨. ئیبراهیم جەبار لەڕۆڵی خاوەن خانوو.
٩. ئالان محەمەد عەلی لەڕۆڵی برای نازدار.
١٠. ڕێبوار سالح لەڕۆڵی بازرگان.
١١- گۆران شەهاب لەڕۆڵی یاساوڵ.
١٢- زانا سادق لەڕۆڵی یاساوڵ.
١٣- کاکە رەنجبەر لەڕۆڵی یاساوڵ.
١٤- هیوا عومەر لەڕۆڵی ئاسنگەر.

*** تیپی شانۆی (ئاشتی):**

کۆمەڵێك لاوی دڵگەرم لە (٢٣)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٩١)داو لە قوتابخانەی موسەڵڵا تیپی شانۆی (ئاشتی) یان دامەزراند لەسەرەتادا سەلاح شوانی و سیروان بێلانە بۆ چەند جارێك کران بە بەڕێوەبەری تیپ.

ئەم تیپە لەماوەی دامەزراندنیەوە تاکو ئێستا کۆمەڵێك شانۆی پێشکەش کردووە بەم جۆرە:-

* ساڵی ١٩٩١ شانۆگەری حاجی یادگار، لە قوتابخانەی موسەڵڵا، نووسینی ئەیوب ئەبو زەید، دەرهێنانی، سەلاح شوانی.

* ساڵی ١٩٩٢ شانۆگەری دکتۆری قۆلبڕ، نووسینی، نەوزاد محەمەد، دەرهێنانی، سەلاح شوانی، قوتابخانەی موسەڵڵا.

* ساڵی ١٩٩٣، شانۆگەری بازاڕی کچ فرۆشتن، نووسینی، سەلاح شوانی، دەرهێنانی، سەلاح شوانی، شوێنی نمایش، پەیمانگای هونەری کەرکوك.

* ساڵی ١٩٩٤، شانۆگەری ئاغای زۆردار، نووسینی، چالاك زەنگەنە، دەرهێنانی، سیروان بێلانە، شوێنی نمایش، پەیمانگای هونەری کەرکوك لە (٦)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٩٤).

* ساڵی ١٩٩٤، شانۆگەری کەبابخانەی عەبە فەرتەنە، نووسینی، سەلاح شوانی، دەرهێنانی، سیروان بێلانە، شوێنی نمایش، هۆڵی سەنتەری گەنجانی شۆڕیجە لە (٢٧)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٩٤).

* ساڵی ١٩٩٥، شانۆگەری (کۆمپانیای بەتران)، نووسینی، سەلاح شوانی، دەرهێنانی، سیروان بێلانە، شوێنی نمایش، پەیمانگای هونەری کەرکوك لە (٢٣)ی ئاداری ساڵی (١٩٩٥).

* ساڵی ١٩٩٥ شانۆگەری (جیوە - پانتۆمایم)، ئامادەکردنی، فارس عەلوان، دەرهێنانی، فارس عەلوان، شوێنی نمایش، هۆڵی چالاکی خوێندنگەکان لە (٢٠)ی نیسانی ساڵی (١٩٩٥)، ئەم شانۆگەرییە لەچوار چێوەی فیستیڤاڵی شانۆی کەرکوکی یەکەم نمایش کرا.

* ساڵی ١٩٩٦، شانۆگەری (پرسیار)، نووسینی، سەلاح شوانی، دەرهێنانی، سیروان بێلانە، شوێنی نمایش، هۆڵی سەنتەری گەنجانی شۆڕیجە لە (٢٢)ی شوباتی ساڵی (١٩٩٦).

* ساڵی ١٩٩٦ شانۆگەری (الحكاية)، نووسینی، حوسێن زیاب، دەرهێنانی، هوشام نازم، شوێنی نمایش، هۆڵی (منتدى المسرح) بەغدا لە (١٣) کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٩٦).

* ساڵی ١٩٩٧، شانۆگەری (ئۆتێلی نمرە بیست)، نووسینی، کەریم سەمەد، دەرهێنانی سەلاح شوانی، شوێنی نمایش، کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کوردی بەغدا لە(١٠-١٤) ئاياری ساڵی (١٩٩٧).

تیپی شانۆی (ئاشتی) لە کەرکوك

* ساڵی ١٩٩٧ شانۆگەری (افول-ئاوابون)، نووسینی: ڕەعد موتەشەر، دەرهێنانی، هووشام نازم، شوێنی نمایش، هۆڵی ڕەبیع مووسڵ لە (٣٠)ی تشرینی یەكەمی ساڵی (١٩٩٧)، لەفیستیڤاڵی شانۆی لاوانی عێراق بەزمانی عەرەبی نمایش كرا.

* ساڵی ١٩٩٨ شانۆگەری (هەتا كەی)، نووسین و دەرهێنانی، محەمەد خدر، شوێنی نمایش، هۆڵی چالاكی خوێندنگاكان لە (٢٧-٣١)ی تشرینی یەكەمی ساڵی (١٩٩٨).

* ساڵی ١٩٩٨ شانۆگەری (بارێژە)، نووسینی، سیروان بێلانە، دەرهێنانی، سیروان بێلانە، شوێنی نمایش، هۆڵی چالاكی خوێندنگاكان لە (٨- ١١)ی ساڵی (١٩٩٨).

* ساڵی ١٩٩٩ شانۆگەری (لووتكەی نهێنی)، (مۆنۆدراما)، نووسینی، محەمەد خدر، دەرهێنانی، محمەد خدر، شوێنی نمایش، هۆڵی چالاكی خوێندنگەكان لە (٧)ی كانوونی دووەمی ساڵی (١٩٩٩).

* ساڵی ١٩٩٩ شانۆگەری (ئەوەنین)، نووسینی، سەلاح شوانی، دەرهێنانی، سەلاح شوانی، شوێنی نمایش، سەنتەری گەنجانی شۆڕیجە (١٩- ٢٢)ی ساڵی (١٩٩٩).

* ساڵی ١٩٩٩ شانۆگەری (ڕۆژێكی نوێ)، (مۆنۆدراما)، نووسینی، سیروان بێلانە، دەرهێنانی، سیروان بێلانە، شوێنی نمایش، سەنتەری گەنجانی شۆڕیجە (١٥)ی ئاداری ساڵی (١٩٩٩).

* ساڵی ١٩٩٩ شانۆگەری (كازیوە)و (چیم لەدەس دێ)، ئامادە كردن و دەرهێنانی، سەلاح شوانی، شوێنی نمایش، سەنتەری گەنجانی شۆڕیجە (١٧)ی ئاداری ساڵی (١٩٩٩).

* ساڵی ١٩٩٩ شانۆگەری (خوا وەكیلە)، نووسین و دەرهێنانی، سەلاح شوانی، شوێنی نمایش، سەنتەری گەنجانی شۆڕیجە (٢٨- ٣٠)ی ئاداری ساڵی (١٩٩٩).

* ساڵی ١٩٩٩ شانۆگەری (شۆستەی برینەكانم)، (مۆنۆدراما)، نووسین و دەرهێنانی، سیروان بێلانە، شوێنی نمایش، باخچەی (الود).

* ساڵی ١٩٩٩ شانۆگەری سێبەری كەرەكە، نووسین و دەرهێنانی، سەلاح شوانی، شوێنی نمایش، هۆڵی (الرحاب) لە (٢٠-٢٤)ی تەمموزی ساڵی (١٩٩٩).

* ساڵی ١٩٩٩ شانۆگەری، (تۆڵە سەندن)، نووسین و دەرهێنانی، محمەد خدر، شوێنی نمایش، هۆڵی (منتدى المسرح بغداد).

* ساڵی ١٩٩٩ شانۆگەری، (ئیتر بەسە)، نووسینی، سیروان بێلانە، دەرهێنانی، ڕاویە جەبار، شوێنی نمایش، شانۆی (الرحاب) لە (٢٢-٢٧)ی ئابی ساڵی (١٩٩٩).

* ساڵی ١٩٩٩ شانۆگەری (ونبووەكان)، نووسین و دەرهێنانی، سەلاح شوانی، شوێنی نمایش، شانۆی الرحاب.

* ساڵی ١٩٩٩ شانۆگەری (مژدەیەكی ڕەشپۆش) مۆنۆدراما، نووسین و دەرهێنانی، سیروان بێلانە، شوێنی نمایش، شانۆی (الرحاب) لە (٣١)ی كانوونی یەكەمی ساڵی (١٩٩٩).

* ساڵی ٢٠٠٠ شانۆگەری، (بێخەمی ناو بەرمیلەكە) بۆ منداڵان، نووسینی، عومەر عەلی ئەمین، دەرهێنانی، سیروان بێلانە، شوێنی نمایش، سەنتەری گەنجانی شۆڕیجە لە (٣٠)ی كانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٠).

* ساڵی ٢٠٠٠ شانۆگەری (بارێژە)، نووسین و دەرهێنانی، سیروان بێلانە، شوێنی نمایش، كۆمەڵەی ڕۆشنبیری كوردی بەغدا لە (٢٧-٢٩)ی شوباتی ساڵی (٢٠٠٠).

* ساڵی ٢٠٠٠ شانۆگەری (هەدیل) بەزمانی عەرەبی، نووسینی، ڕەعد موتەشەر، دەرهێنانی، سیروان بێلانە، شوێنی نمایش، سەنتەری گەنجانی كەركوك (٣)ی ئەیلولی ساڵی (٢٠٠٠).

* ساڵی ٢٠٠٠ شانۆگەری، (گمەی كۆتر - مۆنۆدراما)، وەرگێڕان و ئامادە كردنی، بورهان ئەحمەد، دەرهێنانی، سیروان بێلانە، شوێنی نمایش، یانەی (الموظفین) لە (٢٠)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٠).

* ساڵی ٢٠٠٠ شانۆگەری، (بەخوا سەیرە)، ئامادەكردنی، تیپی شانۆی ئاشتی، دەرهێنانی، سیروان بێلانە، شوێنی نمایش، هۆڵی (الرحاب).

* ساڵی ٢٠٠١ شانۆگەری، (جەخاری هەملع - مۆنۆدراما)، وەرگێڕانی، كاردۆ محەمەد، دەرهێنانی، سیروان بێلانە، شوێنی نمایش، (بیت المقام)ی كەركوك لە (٢٣)ی شوباتی ساڵی (٢٠٠١).

* ساڵی ٢٠٠١ شانۆگەری، (تۆ بەس وەرە)، نووسینی، تیپی شانۆی ئاشتی، دەرهێنانی، سیروان بێلانە، شوێنی نمایش، شانۆی (الرحاب) لە (٥-٨)ی ئاداری ساڵی (٢٠٠١).

* ساڵی ٢٠٠١ شانۆگەری، (هەڕاجكردنی خوێن - مزاد الدم)، نووسینی، محەمەد خدر، دەرهێنانی، سیروان بێلانە، شوێنی نمایش، سەنتەری گەنجانی كەركوك (٤)ی تەمموزی ساڵی (٢٠٠١).

* ساڵی ٢٠٠١ شانۆگەری، (چیایی)، نووسینی، محەمەد خدر، دەرهێنانی، سیروان بێلانە، شوێنی نمایش، سەنتەری گەنجانی كەركوك (١١)ی تەمموزی ساڵی (٢٠٠١).

* ساڵی ٢٠٠١ شانۆگەری، (مەرگی بولبول)، مۆنۆدراما، نووسینی ئیسماعیل ئەكبەر، دەرهێنانی، كاردۆ محەمەد، شوێنی نمایش، سەنتەری گەنجانی كەركوك (١٢)ی تەمموزی ساڵی (٢٠٠١).

* ساڵی ٢٠٠١ شانۆگەری، (وا نابێ)، نووسینی، تیپی شانۆی ئاشتی، دەرهێنانی، تیپی شانۆی ئاشتی، شوێنی نمایش، شانۆی (الرحاب) لە ١ - (٣)ی ئابی ساڵی (٢٠٠١).

* ساڵی ٢٠٠١ شانۆگەری، (ڕاكردن لە... !!)، نووسین و دەرهێنانی، سیروان بێلانە، شوێنی نمایش، هۆڵی (الرحاب).

* ساڵی ٢٠٠٢ شانۆگەری، (ڕەهەند)، مۆنۆدراما، نووسینی، عارف مەعروف، دەرهێنانی، سیروان بێلانە، شوێنی نمایش، كۆمەڵەی ڕۆشنبیری كوردی بەغدا لە (١٦)ی ئاداری ساڵی (٢٠٠٢).

* ساڵی ٢٠٠٢ شانۆگەری (هەدیل) بەزمانی عەرەبی، مۆنۆدراما، نووسینی، ڕەعد موتەشەر، دەرهێنانی، سیروان بێلانە، شوێنی نمایش، هۆڵی الربیع لە مووسڵ لە (٢٠)ی شوباتی ساڵی (٢٠٠٢).

* ساڵی ۲۰۰۲ شانۆگەری، (اغشیە القلم) بەزمانی عەرەبی (مۆنۆدراما)، نووسینی، وەلید عەباس، دەرهێنانی، سەلام زەنگەنە، شوێنی نمایش، سەنتەری گەنجانی شۆڕیجە.

* ساڵی ۲۰۰۲ شانۆگەری، (تخووبەکانی ترس)، نووسینی، کاردۆ محەمەد، دەرهێنانی، سیروان بێلانە، شوێنی نمایش، سەنتەری گەنجانی شۆڕیجە (۱۷)ی تەممووزی ساڵی (۲۰۰۲).

* ساڵی ۲۰۰٤ شانۆگەری، (نێگار نەهێنی)، دەرهێنانی، نیهایەت کاکەیی.

* ساڵی ۲۰۰٥ شانۆگەری، (بێدەنگی.. بۆ بێدەنگی)، دەرهێنانی، کۆسرەت عەبدولڕحمان.

*** دەستی ڕەشی تیرۆرو قوربانیانی شانۆی ئاشتی:**

وەکو دەزانرێ دوای ڕووخانی بەعس، ژمارەیەکی زۆر لە تیرۆریستان کەرکوکیان وەك بنکەیەك بەکار هێناو کردەوەی تیرۆریستیش تا ئەم دەمە بەردەوامی هەیە، تیرۆرکردن گەیشتە ڕوحی هونەرمەندانیش... لەمانگەکانی سەرەتای ڕزگـاری کەرکوکدا هونەرمەند تەحسین شوانی یەکەمین کەس بووە کە دەستی تیرۆر بە خوێنی سوور بووە لەنێو هونەرمەندانی کەرکوکدا، کە ئەندامێکی کارای تیپی ئاشتی بوو ئەویش لە (۱۱)ی تەممووزی ساڵی (۲۰۰۳)دا لەنێو ماڵەکەی خۆیدا لەگەڕەکی عروبە شەهید کرا، هونەرمەند (لایق کاکەیی)ش کە ئەندامێکی کارای ئەم تیپە لە (۱۱)ی ئاداری ساڵی (۲۰۰٥)دا لەبەردەرگای ماڵەکەی خۆی لە گەڕەکی (عەسکەری) تیرۆرکرا.

هاوکات یەك لەهونەرمەندو دەرهێنەرە بەتواناکانی تیپی ئاشتی خاتوو نیهایەت خەلیل بەنەخۆشییەکی کتوپڕ لە (۲۷)ی حوزەیرانی ساڵی (۲۰۰٤)دا کۆچی دوایی کرد.

*** تیپی نواندنی کەناڵی کوردی کەرکوك - تیپی نواندی چوارباخ:**

ئەم تیپە لە ڕۆژی (۲۲)ی تشرینی دووەمی ساڵی (۱۹۹٥) دامـەزراوە لەلایەن عـادل چاوشین‌و ئەبو بەکر محەمەد لە دواییدا چەند ئەکتەرێك هاتنە ناو ئەم تیپەوە وەکو (بێستون عـادل، نیشتمان عەبدولڕەحمان، مەحمود جێماو)و چەند ئەکتەرێکی تر.

* لە ساڵی ۱۹۹٦ هەستان بە تۆمارکردنی چیرۆکی تەمسیلی (کێ تاوانبارە) لە نووسینی (مەحمود جێماو)و دەرهێنانی بۆ تەلەفزیۆن عادل عەبدوڵڵا.

ئەم ئەکتەرانەش بەشدارییان تێیدا کرد عادل چاوشین، ئەبو بەکر محەمەد، عەبدولعەزیز سابیر زەنگەنە، نیشتمان عەبدولڕەحمان، یوسف نەسرەدین، ئیدریس عادل، بێستون عادل‌و خێزانەکەی، ئیبراهیم محەمەدو ئەحمەد عادل.

* لە ساڵی ۱۹۹۷ چیرۆکی (پەشیمانی) تۆمار کرد لە نووسینی سەباح زاهیرو دەرهێنانی عادل عەبدوڵڵا.

ئەکتەرەکان بریتی بوون لە عـادل چاوشین، ئەبو بەکر محەمەد، یوسف جەباری، جیهاد جەباری، جوان ناسح، نەشئەت حوسێن، محەمەد عەلی، محەمەد عەزیز.

* لە ساڵی ۱۹۹۷ ئەندامانی تیپەکە بەشدارییان کرد لە شانۆگەری (تاوان) لە نووسین‌و دەرهێنانی عەباس عەلی کە لەسەر هۆڵی (چالاکی قوتابخانەکان) بۆ چوار ڕۆژ پێشکەش کرا، کە ئەکتەرەکان بریتی بوون لە عادل چاوشین، محەمەد عەزیز، عەبدولعەزیز سابیر، عوسمان لەتیف، سالار حوسێن، دڵشاد سەلیم.

* لە ساڵی ۱۹۹۸ چیرۆکی (پـووڵـەکـی) تۆمار کـرد بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوك لە نووسینی (محەمەد توفیق وەردی) و لە ئامادە کردنی شوکر ساڵەیی، دەرهێنانی بۆ تەلەفزیۆن هاشم زەینەڵ.

ئەم ئەکتەرانەش بەشدارییان کرد عادل چاوشین، ئەبو بەکر محەمەد، محەمەد عەزیز، شوکر ساڵەیی، خالید محەمەد سلێمان، نیشتیمان عەبدولڕەحمان، یوسف جەباری.

* لە ساڵی ۱۹۹۹ چیرۆکی (منداڵی زیرەك) لە نووسینی عارف مەعروف‌و دەرهێنانی بۆ تەلەفزیۆن عادل عەبدوڵڵا پێشکەش کرا.

ئـەم ئـەکـتـەرانـەش بـەشـدارییـان کـرد عـادل چاوشین، درەخشان محەمەد، یوسف نەسرەدین، فەلاح فایق، ئەحمەد وەکیل، منداڵی بە توانا ئیدریس محەمەد لـەگـەڵ جیهاد جەباری.

* لە هـەمـان ساڵدا شـانـۆگـەری (بشـفـرێ هـەر بـزنـە) لە نووسینی محەمەد خدرو دەرهێنانی عادل چاوشین.

ئەم ئەکتەرانەش بەشدارییان کرد عادل چاوشین، محەمەد عەزیز، شوکر ساڵەیی، نەشئەت حوسێن، عەلی محەمەد، خالید محەمەد سلێمان.

* لە هەمان ساڵدا ئەم تیپە بەشداری کرد لە فیستیڤاڵی شانۆی کـوردی لـە کـەرکوك بـە شـانـۆگـەری (کـەلـەسـەر) لە نووسینی محەمەد خدرو دەرهێنان‌و نواندنی عادل چاوشین لەسەر هۆڵی (چالاکی قوتابخانەکان) بۆ ماوەی سێ ڕۆژ.

* هـەر لـە هـەمـان سـاڵ هـەڵـسـان بـە پێشکەش کردنی شانۆگەی (دەردی بیرچوونەوە) لە نووسینی نەوزاد یوسف کاکەیی‌و لە دەرهێنانی (عـارف مـەعـروف)و بە بەشداری کـردنـی ئـەم ئـەکـتـەرانـە (عـادل چـاوشـین، هـاشـم محـەمـەد، نەشئەت حوسێن، عەبدولقادر جەمال، عیزەددین چاوشین، خالید محـەمـەد سلێمان، عـوسـمـان لـەتـیف، فـەلاح فایق، محەمەد عەزیز، مەهدی شۆڕاوی).

*هەروەها چیرۆکی شانۆیی (چاو بە چاو دەکەوێتەوە) پێشکەش کرا، نووسینی محەمەد عەزیزو دەرهێنانی عادل عەبدوڵڵا.

* لە ساڵی ۲۰۰۰ تۆمارکردنی چیرۆکی تەمسیلی (مار) لە نووسینی (محـەمـەد سەعید زەنـگـەنـە)و دەرهێنانی بۆ تەلەفزیۆن (عادل عەبدوڵڵا).

ئەکتەرە بەشداربووەکان ئەمانەن (عادل چاوشین، ئەبو بەکر محەمەد، درەخشـان محەمەد، سوعاد محەمەد، نەدا عەلی، ئەحمەد وەکیل، عەبدولقادر جەمال، عەلی محەمەد، ئالان عادل چاوشین، نەوزاد رامبۆ).

* لە ساڵی ۲۰۰۰ شانۆگەری (گـەڕان بە دوای ئاخا) لە نووسینی (عـارف مەعروف)و دەرهێنانی عەبدولڕەزاق

محەمەد لە کۆمەڵەی هونەرو وێژەی کوردی لە بەغدا پێشکەش کرا، شانۆگەرییەکی مۆنۆدراما بوو.

* لە ساڵی ۲۰۰۱ چیرۆکی تەمسیلی (کارەسات) لە نووسینی ئەبو بەکر محەمەدو دەرهێنانی هاشم زەینەڵ.

بە بەشداری ئەم ئەکتەرانە عادل چاوشین، ئەبو بەکر محەمەد، درەخشان محەمەد، سوعاد عەلی، ئەدا، ئەحمەد وەکیل، ئەوزاد رامبۆ.

* لە هەمان ساڵدا چیرۆکی تەمسیلی (ئەمریکا) پێشکەش کرا، لە نووسینی ئەبو بەکرو دەرهێنانی عادل عەبدوڵڵا.

* لە ساڵی ۲۰۰۲ شانۆگەری (سەرەتای ژان) لە نووسینی (وریا سەردار)و دەرهێنانی نواندنی عادل چاوشین.

* لە هەمان ساڵیدا چیرۆکی تەمسیلی (بێ ئومێدی) پێشکەش کرا، نووسین و دەرهێنانی عارف مەعروف.

* لە ساڵی ۲۰۰۳ شانۆگەری (فیدرالیەت) لە نووسین و دەرهێنانی (یوسف جەباری)، پێشکەش کردنی لەسەر هۆڵی شەهید سیروان تاڵەبانی.

بە بەشداری ئەم ئەکتەرانە (عادل چاوشین، محەمەد عەزیز، محەمەد ئیسماعیل، یوسف ئەسرەددین).

* لە ساڵی ۲۰۰۳ شانۆگەری کورسی لە نووسینی عادل چاوشین و دەرهێنانی واحید کفری لەسەر هۆڵی چالاکی چەمچەماڵ پێشکەش کرا بە بەشداری عادل چاوشین و یوسف جەباری.

* لە ساڵی ۲۰۰٤ چیرۆکی تەمسیلی (دایە نەورۆز) لە نووسین و دەرهێنانی (لالۆ ڕەنجدەر).

* لە هەمان ساڵدا بە کۆبوونەوەی ئەندامانی تیپ بڕیار درا بە گۆڕینی ناوی تیپەکە بۆ (تیپی نواندنی چوار باخ) و بەشدارییان کرد لە فیستیڤاڵی شانۆیی کوردی دووەم لە شاری کەرکوک کە ئەندامانی باڵای فیستیڤاڵ پێك هاتبوو لە (شوکر ساڵەیی، عادل چاوشین، حوسێن ئەحمەد، سیروان بێلانە، یوسف جەباری، یوسف چاوشین).

تیپی نواندنی چوار باخ بەشداری کرد بە شانۆگەری (گەڕان بە دوای ئاخا) لە نووسینی (عارف مەعروف)و لە دەرهێنانی (عادل چاوشین).

* لە ساڵی ۲۰۰۵ بەشداری کرد بە شانۆگەری شەهید لەگەڵ ڕۆژگارا لە نووسینی ئەبو بەکر محەمەدو دەرهێنانی عادل چاوشین لەسەر هۆڵی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کەرکوک.

* لە ساڵی ۲۰۰٦ شانۆگەری (کرێکاری چەوساوەی) پێشکەش کرد لە نووسینی مەهدی شەفیق و دەرهێنانی عادل چاوشین.

بە بەشداری ئەم ئەکتەرانە (عەبدولعەزیز سابیر، فەلاح فایق، چرۆ عادل چاوشین، ئەحمەد وەکیل، عادل چاوشین).

* لە ساڵی ۲۰۰۷ شانۆگەری (چەوساوە) لە نووسینی (یوسف جەباری)و دەرهێنانی (عادل چاوشین) لەسەر هۆڵی نەورۆز پێشکەش کرا بە بەشداری (درەخشان محەمەد، چرۆ عادل، دلاوەر عەبدوڵڵا، ئەحمەد وەکیل، ئەبو بەکر محەمەد).

* لە ساڵی ۲۰۰۷ شانۆگەری (ئەشکەوت) ئامادەکردنی (یوسف جەباری)و دەرهێنانی (عادل چاوشین)، بە بەشداری (ئەبو بەکر محەمەد، دلاوەر عەبدوڵڵا، ئەجات کامیل، محەمەد ئیسماعیل).

* لە هەمان ساڵ چیرۆکی تەمسیلی ئیشتمان لە نووسین و دەرهێنانی حوسێن میسری.

ئەکتەرەکان بریتی بوون لە عادل چاوشین، عەبدولجەبار سابیرکارکۆك، یوسف جەباری، عیزەدین چاوشین، موئەیەد بێچارە، محەمەد عەزیز، شێرکۆ ئەسرەدین-هەردی، عارف مەعروف، یەلمان.

لە ماوەی تەمەنی ئەم تیپەدا ئەم ئەکتەرانە بەشدارییان کردووە: (یوسف محەمەد، عادل عەبدوڵڵا، ئەبو بەکر عەبدولحەمید، محەمەد عەزیز، محەمەد ئیسماعیل، یوسف ئەسرەددین، عیزەددین نوری، عەبدولقادر جەماڵ، موئەییەد عەبدولقادر، فەلاح فایق، عوسمان لەتیف، عەبدولعەزیز سابیر، ئەوزاد ئەحمەد، ئەحمەد خالید، فەهمی، ئەجات کاکل سەعدون، سۆما محەمەد ئیسماعیل، چرۆ عادل عەبدوڵڵا، دلاوەر عەبدوڵڵا سەعید، خالید محەمەد، جیهاد ڕەمەزان، شیڤان کاوە، بێستون سەیفەدین.

*** تیپی شانۆی هەندرێن - تیپی شانۆی هەنگاوی نوێ:**

لە ساڵی ۱۹۸۸ کۆمەڵێك لاوی ئاوارەی کەرکوك تیپێکیان دامەزراندووە بە ناونیشانی (تیپی شانۆی هەندرێن) لە چەمچەماڵ، بەڵام لە دوای ڕزگار کردنی کەرکوك ناوی تیپەکەیان ناو ناوە (تیپی شانۆی هەنگاوی نوێ) لە کەرکوك.

- زمناکۆ هیدایەت زەنگەنە، بەڕێوەبەر بوو.
- ئەندامەکان: سۆران مامە حەمە، محەمەد تاهیر، مەهدی شەفیق، پیشتیوان ئازاد، عیماد جاف، شێرکۆ ئەسرەدین، جەبار سابیر، ئەجات حەکیم، محەمەد مەهدی شەفیق، هێشوو جەمال.
- شانۆگەرییکان:
- شانۆگەری (زووحاك) لە (۲۵)ی ئاداری ساڵی (۱۹۹۸).
- شانۆگەری (ئەنفال) لە (۱۹)ی نیسانی ساڵی (۱۹۹۹).
- شانۆگەری (ڕاپەڕین) لە (۲۰)ی ئاداری ساڵی (۲۰۰۰).
- شانۆگەری (ئێمە کوردمان ئەهێشت) لە (۲۰)ی تشرینی دووەمی ساڵی (۲۰۰۳).
- شانۆگەری (شێواو) لە (۱)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (۲۰۰۳).
- شانۆگەری (گەڕانەوەیەکی ئەفسانە) لە (۱۲)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (۲۰۰٤).
- شانۆگەری (سۆزی گەرمیان) لە (٤)ی ئایاری ساڵی (۲۰۰۷).
- شانۆگەری (ئەنفالیش وەك هەڵۆ سنووری نییە) لە (۱۵)ی نیسانی ساڵی (۲۰۰۷).
- شانۆگەری (ئەنفال دۆزەخی بێگوناهەکان) لە (١٤)ی نیسانی ساڵی (۲۰۰۸).

*** تیپی شانۆی باوە گوڕگوڕ:**

ئەم تیپە لە مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ۲۰۰۳ لە کەرکوك دامەزرا، یەکێك بوو لە تیپە کاراکانی ناو یەکێتی

هونەرمەندانی ئەو كاتە، هونەرمەند شوكر ساڵەیی سەرۆكی تیپەكە بوو، ئەندامانی تیپەكەش هەریەك لە هونەرمەندان مەهدی شەفیق، فەلاح فایەق، محەمەد سەید كەریم، جەبار كاركۆك، عیزەددین چاو شین، شێركۆ عوسمان، فازڵ عەلی، ئاكۆ عەبدولحەمید، سامی عەزیز، محەمەد تایر، زمناكۆ هیدایەت بوون.

لە كارو چالاكییەكانی تیپی باوە گوڕگوڕ، ساڵی ٢٠٠٣ ڕێكخراوی چالاكییەكانی هاموون سەنتەری كەركوك یادی كارەساتی ئەنفالی بە هاوكاری ئەم تیپە لە گەڕەكی ڕەحیمئاوای شاری كەركوك پێشكەش كرد، كە لە ئامادە كردن ودەرهێنانی زمناكۆ هیدایەتو نواندنی، فەرەیدون هەمەوەندی،شێركۆ عوسمان، مەهدی شەفیق، بێستون سەیفەدین،ڕزگار شوانی، فەلاح فایق، محەمەد سەید كەریم، جەبار كاركۆك، عوسمان لەتیفو عیماد عەبدولڕەحمان بوو. لە (٢١)ی كانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٤) (پانتۆمایم) ی (ئازاردانی هونەرمەندێكی) لە هۆڵی شەهید سیروان پێشكەش كرد كە لە نووسینی محەمەد خدرو نواندنی شوكر ساڵەیی بوو، هەروەها بە میوانداری چەند هونەرمەندێكو بە بەشداری ئەندامانی تیپەكە ڕۆژی (٨)ی ئایاری ساڵی (٢٠٠٤) كەرنەڤالی ئەنفالی پێشكەش كرد كە سەرەتا بە نمایش كردن لە بەردەم قشڵەی كەركوكەوە هەتا هۆڵی شەهید سیروان تاڵەبانی نمایش كراو هوتاف درا، میوانەكانی بەرهەمەكەش بریتی بوون لە هونەرمەندان، حەمە عەلی خان، ئەبوبەكر محەمەد، ئاوارە خان بوونو كەرنەڤاڵەكەش لە نووسینی شاعیری گەورە شێركۆ بێكەسو دەرهێنانی تەحسین فایەق بوو.

لە (٦)ی حوزەیرانی ساڵی (٢٠٠٤) لە هۆڵی شەهید سیروان تاڵەبانی شانۆگەری (ڕاپەڕینو تابلۆكانی ژیانمان) ی لە نواندنی ئەندامانی تیپەكە نمایش كرد.

*** تیپی نواندی كەركوك:**

ئەم تیپە لە ساڵی ٢٠٠٤ دروست بووە، سەرۆكی تیپەكە (محەمەد سەید) بوو، ئەكتەرەكانی تیپەكە بریتی بوون لە (زمناكۆ هیدایەت، مەهدی شەفیق، عیزەددین چاوشین، فازڵ عەلی، شیركۆ هەردی، محەمەد مەهدی، سالار هێمن).

*** تیپی شانۆی ئەزموونگەری كەركوك:**

ئەم تیپە لە كەركوك لە ڕۆژی (١٦)ی ئاداری ساڵی (٢٠٠٦) دامەزراوە، ئامانج لەم تیپە بریتی بووە لە ئیشكردن لەسەر ئەزموونە نوێكانی شانۆو واز هێنان لە هۆڵی شانۆ، بۆیە كارەكانیان لە ژووری قەڵاو قشڵە نمایش كراوە.

– دەرهێنەری كارەكان (نیهاد جامی)یە، ئەكتەرەكانی

تیپی شانۆی (ئەزموونگەری) لە كەركوك

ئەم تیپە بریتیە لە (فریاد ئەحمەد، شوکور عومەر، کارگەر جەواد، دیدار مەجید.
- بەرهەمەکانیان:
- پرۆڤەیەکی شانۆیی بۆ چاوەڕوانی گۆدۆ، ساڵی ٢٠٠٦.
- خاچ، ساڵی ٢٠٠٦.
- سەگو دەف، ٢٠٠٧.
- زولێخا لە خەونی یوسفدا، ساڵی ٢٠٠٧.
- هاملێتی کەرکوك، ساڵی ٢٠٠٧.
- یادەوەری دەنگ، ساڵی ٢٠٠٧.
- یادەوەری دەنگ ٢، ساڵی ٢٠٠٧.
- ئۆدیبی زەردەشت، ساڵی ٢٠٠٨.
- حیکایەتی لم، ساڵی ٢٠٠٨.
- ئەنتیگۆنای قەڵا، ساڵی ٢٠٠٨.
- تونێل، ساڵی ٢٠٠٩.
- جوانترین مردن، ساڵی ٢٠٠٩.
- دەستنوسێکی شانۆیی، ساڵی ٢٠١٠.
- پاڕانەوە، ساڵی ٢٠١٠.
- هاواری پیاوێکی سەرپێی، ساڵی ٢٠١٠.
- شەرابی سێو، ساڵی ٢٠١٠.
- مۆسیقارێکی ماندوو، ساڵی ٢٠١٠.
- تەنیای خۆرئاوا بوو، ساڵی ٢٠١١.
- ئەوەی جێگای ئاماژەیە کە ئەم تیپە گۆڤارێکی شانۆییان هەیە بە ناوی (شانۆکار) بەڵام لە کاتی وەستانی تیپەکەدا گۆڤارەکەشیان وەستا، بەڵام ئێستا تیپەکەو گۆڤارەکە بە بەرگێکی نوێوە هاتونەتە مەیدان.

### * تیپی هەڵۆکانی کەرکوك:

ئەم تیپە لە سەرەتای مانگی ئاداری ساڵی ٢٠٠٩ لە کەرکوك دامەزراوە، سەرۆکی تیپەکە (هەندرێن تاهیر شاسوار)ە، دەرهێنەری تیپیش (فەرەیدون محەمەد شکور)ە.
ئەکتەرەکانی ئەم تیپەش بریتین لە:
تاهیر شاسواری، فەرەیدون محەمەد، گۆران ئیبراهیم، شاخەوان غالب، دێکان تاریق، هونەر فەلاح، هەڵکەوت محەمەد، هوشیارو گەلێکی تر.

### * تیپی شانۆی (سێکانی):

ئەم تیپە لە ساڵی (٢٠٠٦) دامەزراوە لەلایەن هەر یەکە لە (ڕائید حازم بەشیر، مەریوان زەنگەنە، تاریق ناسیح، سعود ئەحمەد، سەباح حوسێن، حەلیم نیعمە)، لەگەڵ کۆمەڵێك لە دەرچوانی پەیمانگای هونەرە جوانەکانو کۆلێژی هونەرە جوانەکان لە هەموو پێکهاتەکانی کەرکوك، گەلێك بەرهەمی بە زمانەکانی کوردیو عەرەبیو تورکمانی پێشکەش کردووە لە گەلێك لە شارەکانی سلێمانیو هەولێرو مووسڵو دهۆك، لە دەرەوەیش بەشداری گەلێك لە فیستیڤاڵە شانۆییەکانی ئێرانو تورکیاو سوریای کردووە.
لە ماوەی کورتی تەمەنیدا گەلێك بەرهەمەی شانۆیی پێشکەش کردووەو گەلێك ئەکتەری بە تواناو خەڵاتی جۆربەجۆری وەرگرتووە.

تیپی شانۆی (سێکانی)

*** گرووپی شانۆی هەوار:-**

- هەر لە ساڵی (٢٠١١)ەوە کار بۆ دامەزراندنی کراوە، بەڵام لە ساڵی (٢٠١٤)ەوە بە فەرمی ناوی تیپەکە نراوە.

- یەکەم کاریان نمایشی شانۆیی (کچە فرۆشراوەکانی نیشتمان) دەستی پێکرد، لە نووسینی: عەزیز عومەر، سینۆگرافیاو دەرهێنانی: نەوزاد نەجم. ئەم شانۆگەرییە لە شارەکانی کەرکوك، سلێمانی، هەڵەبجە، کۆیە، چەمچەماڵ، هەولێر، بەغدا نمایش کرا.

- پرۆژەیەکی تریان ئەویش شانۆی گەڕۆکە بۆ ناو گەڕەکەکانی کەرکوك، کە تەنها لە یەك ڕۆژدا شانۆی (دەموچاو فرۆشان) نمایش کرا.

دەرهێنەری شانۆگەرییەکە دەڵێت:-

(نمایشی شانۆی کچە فرۆشراوەکانی نیشتمان، نمایشێکە سەبارەت بەو کارەساتە گەورەیەی بەسەر شەنگال و کچە یەزیدییەکان هاتووە و باس لە بازرگانی کردن بە کچانی یەزیدییەوە و مامەڵەی کڕین و فرۆشتنی، کە لەلایەنی داعشەوە بەو کچانەوە دەکرێت لەنێو خۆ و دەرەوەدا، هەورەك چۆن لە ئەنفالەکە کچی کورد فرۆشرا بە میسر و ئەردەن و وڵاتانی عەرەبی ئامانجی نمایشکردنی ئەم نمایشە ناسینی دۆزی کچانی یەزیدییە وەك جینۆساید بە جیهان. ئەم نمایشە لە واقیعی حاڵی ئەو کچانەوە وەرگیراوە کە دەربازبوونە لە دەستی داعش کە من وەك دەرهێنەر چوومەتە لای چەند کچێکی ڕزگاربووی دەستی داعش کە سەرجەم گرفت و ئەو ئازارانەم بە شێوازێکی هونەری بۆ سەر تەختەی شانۆ گواستەوەو بە شێوازی شانۆی وێنەیی کارم لەسەری کردووە.)

شانۆی (کچە فرۆشراوەکانی نیشتمان)

* **تیپی شانۆی (چەوساوەکانی چیمەنی شەهیدان):-**

تیپێکی شانۆییە ساڵی (١٩٨٤) لەلایەن کۆمەڵێك رۆشنبیرو خوێندکارو لاوان‌و پێشمەرگەوە لە گوندی (چیمەنی شەهیدان)ەوە دامەزراوەو چەند بەرهەمێکی لە چیمەن‌و گوندەکانی دەوروبەری پێشکەش کردووە.
یەکەم بەرهەمی تیپەکە لە (٢١)ی ئاداری ساڵی (١٩٨٤) لە یادی جەژنی نەورۆزدا پێشکەش کراوە، کە دەنگدانەوەیەکی باشی هەبوو. هەموو دەقە پێشکەشکراوەکانی ئەم تیپە (غازی محەمەد رەشید) نووسیویەتی‌و (محەمەد نامق - هیوا) کاری دەرهێنانی بۆ کردووە، ئەکتەرەکانیش جگە لە (غازی محەمەد رەشید) بریتی بوون لە :- (نەجات محەمەد رەشید، مەلا فایز، غێدان مستەفا، شەریف لەتیف، کەماڵ رەشید خورشید - دکتۆر شەیدا، محەمەد عومەر، زاهیر حەیدەر، وەهاب محەمەد، کەریم ئیبراهیم، عومەر عەزیز)، لەوانە دواتر دووانیان شەهید بوون بە ناوەکانی غێدان مستەفا، شەریف لەتیف.
ئەم تیپە زۆرتر وەك تیپیکی لۆکاڵ کاری کردووەو لە بەرهەمەکانیدا زۆرتر گوزارشتی لە حەزو ئاوات‌و گیروگرفتەکانی جووتیاران‌و هەژاران‌و کەمدەرامەتەکان کردووە.

* **ڤیستڤاڵی شانۆی سەرشەقام لە کەرکوك:-**

لە درێژەی چالاکییە هونەرییەکانی کەرکوك بۆ یەکەم جار لە مێژووی ئەو شارەدا ڤیستڤاڵی (شانۆی سەر شەقام) لەسەر ئاستی هەرێمی کوردستان ساز دەکرێت.
ئەو ڤیستڤاڵە لەژێر چاودێری رەزا فایق حەلاق‌و بە هاوکاری سەنتەری ئازادی لاوانی کەرکوك لە ناوەراستی مانگی کانونی یەکەم بە بەشداریی ١٠ نمایشی شانۆیی ساز دەکات، لە هەریەك لە شارەکانی هەولێرو کۆیەو چەمچەماڵ چوار نمایش ئامادە دەبێت‌و شەش نمایش لە گرووپەکانی شاری کەرکوك نمایش دەکرێت.
- رۆژی یەکەم:
لە ١٥ی کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠١٥) دەستپێدەکات لە کات سێی پاش نیوەرۆ
شانۆی هەمووومان پێشمەرگەین:
بەرهەمی کۆمەڵەو هونەرو وێژەی مەڵبەندی گشتی هەولێر لە سێ و نیو نمایش دەکرێت.
شانۆی یەکە:-
بەرهەمی بەرێوەبەرایەتی‌و رۆشنبیری‌و هونەری چەمچەماڵ بە هاوکاری تیپی شانۆی گەل لە چوار نمایش دەکرێت
شانۆیی پەنارتی:-
بەرهەمی تیپی شانۆیی (سۆما)، لە چوارو نیو نمایش دەکرێت
گروپی شانۆی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سەر بەغدا لە کاتژمێر پێنجی ئێوارە.
لە بەرواری (١٦)ی کانونی یەکەم کۆری رەخنەی بۆ شانۆکان لە هۆڵی سیروان تاڵەبانی.
رۆژی دووەم لە ١٦ی کانوونی یەکەم.
شانۆی (ماڵەکەمان)، شانۆی گروپی (حاجی) کاتژمێر دووی پاش نیوەرۆ.
شانۆی (کورسی)، تیپی شانۆی (نەورۆز) کاتژمێرو دوو

ونیوی پاش نیوەڕۆ.
شانۆی (پایزێك دوای جەنگ) لە گروپی شانۆی گزنگ، سێی پاش نیوەڕۆ.
شانۆی (كۆبوونەوەی داهاتوو) بەرهەمی كانی هونەری هەولێر سێ و نیو پاش نیوەڕۆ.
شانۆی (شەترەنجی سووتاو) بەرهەمی گروپی شانۆیی (مۆم) چواری پاش نیوەڕۆ.
شانۆی (شێواندنی كەلتوور) بەرهەمی گرووپی شانۆی (ڕۆژ) چوار نیو.
بەرواری ١٧ی كانونی یەكەمی ساڵی (٢٠١٥ كۆڕی ڕەخنەیی بۆ شانۆكان لە هۆڵی سیروان تاڵەبانی.
ڕۆژی سێ یەم:-
كۆتایی ڤیستڤاڵ و دابەشكردنی خەڵات بەسەر بەشداربووان.

*** دەقە شانۆییەكانی مەسیحییەكان كە لە كەركوك لەنێوان (١٩٤٤-١٩٥١) نمایش كراوە .**

١- شانۆگەری (شایلۆك)، ساڵی ١٩٤٤ لە دەرهێنانی (جوبرائیل بابلا).
٢- شانۆگەری (عاشق فادور - عاشق جوال)، (١٩٤٥)، لە دەرهێنانی (جوبرائیل بابلا).
٣- شانۆگەری (الأمیر الدانیماركي)، ١٩٤٦، لە دەرهێنانی (رابی ئەدونیا ئیلیا).
٤- شانۆگەری (هاملت و شكسپیر)، ١٩٤٧ لە دەرهێنانی (جوبرائیل بابلا).
٥- شانۆگەری (یوسف واشقانە)، ١٩٥٠، لە دەرهێنانی (جوبرائیل بابلا).
٦- شانۆگەری (خمتابی اقبل) ١٩٥٢ لە دەرهێنانی (جوبرائیل بابلا).
٧- شانۆگەری (دوخادیم - روح الأم) ١٩٩٥ لە دەرهێنانی (یواب تۆما كنا).
٨- شانۆگەری (دایمون و باتیوس) ١٩٥٠ لە دەرهێنانی (جوبرائیل بابلا).
٩- شانۆگەری (دایمون و باتیوس) ١٩٥١ لە دەرهێنانی (جوبرائیل بابلا).

*** سەرچاوەو پەراوێزەكان:**

١. (شانۆو.. شانۆی كوردەواری)، حەسەن تەنیا، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوكردنەوەی كوردی، چاپخانەی (دار آفاق العربیة)، ١٩٨٥.
٢. گۆڤاری (هاواری كەركوك)، ژمارە (١)، لاپەڕە (٣٦ - ٤٢)، لێكۆڵینەوەیەكە بەناونیشانی: ((بزوتنەوەی شانۆی كوردی لە شاری كەركوك ١٩٥٣ - ١٩٧٤))، نووسینی موحسین محەمەد.
٣. گۆڤاری (ئاوێزە)، ژمارە ٢، لاپەڕە (٢٣٩ - ٢٤٢)، لێكۆڵینەوەیەكە بەناونیشانی ((بیبلۆگرافیای بەرهەمەكانی تیپی شانۆی ئاشتی)) (سیروان بێلانە).
٤. گۆڤاری (مێرگ)، ژمارە ١٠، لاپەڕە (٧٨ - ٨٣)، لێكۆڵینەوەیەكە بەناونیشانی ((بزاڤی شانۆ لەكەركووك و تیپی شانۆی ئاشتی، نموونەیەكی گەشن))، وشیار ئەحمەد ئەسوەد.
٥. گۆڤاری (ڕەنگین)، ژمارە ١٣٤، لاپەڕە ٣٠ - ٣١، لێكۆڵینەوەیەك بەناونیشانی ((یەكەم فیستیڤاڵی شانۆی كوردی لەكەركوك)) سەباح موسا.
٦. گۆڤاری (الاخاء) ژمارە ١٨٧، تەمموز- ئاب ساڵی (١٩٨٧)، لاپەڕە (٤٩ - ٥٢)، لێكۆڵینەوەیەكە بەناونیشانی، ((حقی الشبلي وحركة التمثیل بكركوك)).
٧. گۆڤاری (الاخاء) ژمارە ١٩٤، لاپەڕە (٤٧ - ٥٠)، لێكۆڵینەوەیەكە بەناونیشانی ((الحركة المسرحیة في كركوك))، فازڵ محەمەد حوسێن حەلاق، بەشی یەكەم.
٨. گۆڤاری (الاخاء)، ژمارە ١٩٥، لاپەڕە (٤٠ - ٤٢)، لێكۆڵینەوەیەكە بەناونیشانی ((الحركة المسرحیة في كركوك))، فازڵ محەمەد حوسێن حەلاق، بەشی دووەم.
٩. گۆڤاری (بارش)، ژمارە ٢٠، شوبات، ٢٠٠٥، لاپەرە (١٢٦ - ١٢٩)، لێكۆڵینەوەیەكە بەناونیشانی: ((شانۆی هاوچەرخی توركمانی لەكەركوكدا بەشی یەكەم.
١٠. گۆڤاری (بارش) ژمارە ٢٢، حوزەیران، ٢٠٠٥، لاپەڕە (١٤٠ - ١٤٢)، لێكۆڵینەوەیەكە بەناونیشانی: ((شانۆی هاوچەرخی توركمانی لەكەركوك)) بەشی دووەم، ڕووبار عەلی.
١١. گۆڤاری (ڕەنگین)، ژمارە، ٨٧، ساڵی ١٩٩٦، لاپەڕە ١٠، لێكۆڵینەوەیەكە بەناونیشانی: ((قوتابخانە لەنێوان دوێنێ وئەمڕۆدا))، عەبدوڵڵا عەبدولڕەحمان زەنگەنە.
١٢. لێكۆڵینەوەی مێژووی شانۆ لە شاری خورماتوو لە بەڕێز سەلاح شوكر وەرگیراوە لە پێویستی بابەتەكە لەسەر ڕەزامەندی خۆی كردوومەتە توێی بابەتەكەوە.
١٣. (الحركة المسرحیة في كركوك، تواریخ، اسماء ووثائق)، فازڵ حەلاق، ٢٠٠٩.
١٤. گەشەسەندنی درامای كوردی ١٩٧٥-١٩٩٥)، د. سەلام فەرەج كەریم، ٢٠٠٩.
١٥- بەرنامەیەكی دیكۆمێنتی كەناڵی ئاسمانی كەركوك دەربارەی (هونەری مێژووی شانۆ لە كەركوك).
١٦- ئەرشیفی تیپە هونەرییەكانی كەركوك.
١٧- ژمارەكانی گۆڤاری شانۆكار.

دەرهێنەر ناسر حەسەن و هونەرمەند وریا شەهاب

**شانۆگەری کەژاوەی خوێن، ساڵی ٢٠٠٧**

**شانۆگەری (تاووس)، کە هەر یەکە لە عەبد جەعفەر و مەیس گومەر و محەمەد جەمال و ئەحمەد محەمەد جەمال ڕۆڵیان تێیدا بینیووە**

**محەمەد خدر لەگەڵ یەکێك لە ئەکتەرەکانی بەغدا لە کەرکوك**

**محەمەد خدر لەگەڵ یەکێك لە ئەکتەرەکانی بەغدا لە کەرکوك**

**قاسم مەلاك و محەمەد خدر لە دەوری یەکێك لە شانۆکان لە کەرکوك**

**یەکێك لە شانۆگەرییەکانی شاری کەرکوك**

**مەیس گومەر و محەمەد جەمال**

**ئەبو بەکر لەگەڵ یەکێك لە دەرهێنەرەکان**

*** بزاڤی شانۆ لە کەرکووکی حەفتاکاندا:**

د. فازڵ جاف

زۆربەی نووسینەکانمان دەربارەی شانۆی حەفتاکان، کە باس دێتە سەر باسی شانۆی کوردی لە کەرکووك، وەکوو ئەزموونێکی لاوەکی باس لەو قۆناخە کورتە دەکات، لە کاتێکدا بەپێی هەموو پێوەرێکی هونەری، شانۆی کەرکووك وەکوو ئەزموونێکی نوێ و جیا هەڵکەوتوو، خاوەن پایەیەکی تایبەت بوو، چ لە ڕووی چەندایەتی و چ لە ڕووی چۆنایەتییەوە، تاکوو نیوەی حەفتاکانیش هەر پێشەنگ بووە و هەموو کارە شانۆییەکانی ئەو سەردەمەی بەزاندبوو.

ئەو قۆناخە، قۆناخی حەفتا بۆ حەفتا و چوار، هەناگاوێکی تایبەت و سەردەمێکی جیاهەڵکەوتووە، نەك تەنیا لە بزاڤی شانۆیی شاری کەرکووکدا، بگرە لە سەرانسەری کوردستاندا، هەرچەندە ئەو ماوە کورتەی تەمەنی ئەو قۆناخە بەداخەوە چوار ساڵ زیاتری تێنەپەڕاند.

دیارە هەر لەمیانەی ئەو چوار ساڵەی پاش بەیاننامەی مێژوویی یازدەی ئاداری ساڵی ١٩٧٤ و ڕاگرتنی شەڕ دژ بە کوردستان و دانپێنانی حکوومەتی عێراق بە ماف ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان، کەرکووکیش وەکوو هەموو شارەکانی دیکەی کوردستان پشکێکی لەو ئازادییە بەرکەوت، هەرچەندە ئەو ئازادییەك کەرکووك بە بەراورد لەگەڵ شارەکانی دیکەدا گەلێك کەمتر و کورتر بوو، بەڵام ئەو پشکە کە بۆ شاری کەرکووك زۆر بوو و زیاتریش هەستی پێدەکرا، چونکە یەکەم جار بوو کەرکووك دوای قۆناخێکی دوور و درێژ، ئازادییەکی لەو جۆرە بەخۆیەوە ببینێت. ئازدایيەك ئەگەرچی کورتخایەن و سنووردار بوو، بەڵام بۆ بزاڤی ڕۆشنبیریی کوردی، بەتایبەتی بۆ هونەر و ئەدەبی ئەو سەردەمە، لەسەرووی هەموویشیانەوە بۆ بزاڤی شانۆ، قۆناخێکی بەپیت و پڕ بەرهەم بوو.

لەو چوار ساڵەدا، ڕۆشنبیران و هونەرمەندانی کەرکووك سەلماندیان کە شارەکەیان بەر لەوەی کانگای نەوت و سامان بێت، کانگای داهێنان و ئەفراندن و ڕووناکبیرییە، ئەوەیان سەلماند کە ئەوانیش خاوەنی ڕۆشنبیرییەکی قووڵ و تایبەتن، ڕۆشنبیرییەك کە زادەی کۆمەڵگەی فرە کولتوورییە، ڕۆشنبیرییەك کە زادەی تاکرەهەندی و یەکزمانی نییە، بگرە توانای کەسەکانی لەدەرەوەی زمانی دایکەوە سەرچاوە دەگرێت، زمانزانین وەکوو دەروازە و پەنجەرەیەك بەسەر جیهانی ئەدەب و هونەر و فیکردا، ئەمەیش بەتایبەتی لە ڕێگەی زانینی زمانی عەرەبییەوە.

ئەوەبوو هەر دوای بەیاننامەکە چەندین تیپ و گرووپی شانۆیی هاتنە دامەزراندن، بەڵام بەرچاوترین و چالاکترینیان تیپی شانۆیی (مەشخەڵ) بوو، کە ڕاستەوخۆ لەلایەن یەکێتیی قوتابییانی کوردستانەوە بەڕێوە دەبرا. لێرەدا جێگەی خۆیەتی بڵێم، کە ئەمە دەبێت بە یەکێك لە دەستکەوتەکانی یەکێتیی قوتابییان لە قەڵەم بدرێت.

تیپی مەشخەڵ، بە هاوکاریی چەند شانۆکارێکی شاری کەرکووك، بە سەرپەرشتیی هونەریی مامۆستا سەلمان فایەق، وەکوو دەرهێنەری تیپ هاتە دامەزراندن.

شانۆیی (دایکی شەهید) لە نووسینی بەهەشتی (مستەفا پەژار) یەکەم بەرهەمی تیپی شانۆ مەشخەڵ بوو، ئەم دەستپێکە بۆ ئەو کاتەی تیپێکی نوێ گرنگ بوو، گرنگ بوو بە شانۆنامەیەکی خۆماڵی سیاسی و جدییەوە، هاوکات شانۆنامەکە لە ڕووی ئەدەبییەوە بە زمانێکی ئەدەبیی بەرز نووسرابوو.

هەر لە یەکەم نمایشەوە، تیپی مەشخەڵ هاوسەنگییەکی باشی لەنێوان ژمارەی ئەکتەرانی نێرینە و ئەکتەرانی مێینەدا پیشان دا. ژمارەی کچانی بەشدار لەو نمایيشەدا بە ئەندازەیەك زۆر بوو، کە دەکرێت بڵێین هاوشانی ژمارەی ئەکتەرە کورەکان بوو، ئەمەیش تا ئەوکات و تا چەند ساڵێك دواتریش هیچ بەرهەمێکی شانۆیی کوردی ئەم تایبەتمەندێتییەی بەخۆیەوە نەبینیبوو، هەر ئەمە بۆخۆی یەکێك بوو لە شانازییەکانی شانۆکارانی ئەو سەردەمەی کەرکووك، لە کاتێکدا لە شارەکانی دیکەی کوردستاندا، کە لە شانۆدا تەمەنێکی گەلێك کۆنتریان هەبوو، تا ئەو دەمەیش بەگشتی بۆ زۆربەی کەسایەتییە مێینەکان کوڕ دەکرا بە کچ. چەند ئەکتەرێکی پیاو هەر بە ڕۆڵی ژنان ناویان دەرکردبوو، لەوانە هونەرمەند عومەر چاوشین. نەك هەر ئەوە، بگرە چەند ئەکتەرێکی دیکەیش کە دواتر ڕۆڵی پیاوانیان دەگێڕا. لە سەرەتادا، مەبەستم لە تاڤ مێردمنداڵی و لاوێتیدا، بە ڕۆڵی ئافرەتاندا ڕەت بووبوون.

خۆ ئەگەر لە ڕووی چەندایەتیشەوە باس لە بەرهەمەکانی تیپی شانۆی مەشخەڵ بکەین، ئەوەندە دەڵێم کە ژمارەی بەرهەمەکانی تیپ لە ماوەی کەمتر لە دوو ساڵدا گەیشتە پتر لە پێنج شانۆگەریی درێژی دوو پەردەیی. ئەم بەرهەمانە ڕۆژانی پیشاندانیان بە بەراورد لەگەڵ بەرهەمی تیپەکانی دیکەی شارەکانی کوردستاندا، گەلێك درێژ بوو. ئەمجا پێویستە ئاماژەیش بەوە بکەم، کە جەماوەرێکی نەك هەر باش، بگرە خەڵکێکی زۆر دەهاتن بۆ تەماشای ئەو بەرهەمانە، خەڵکی شاری کەرکووك تەواو هۆگری بەرهەمەکانی شانۆی مەشخەڵ بوون. تەنانەت زۆربەی نمایيشەکان پتر لە پێنج جار و لەناو هۆڵێکی پڕدا پێشکەش دەکرا.

تیپی مەشخەڵ بووبوو بە بەشێکی زیندووی ژیانی ڕۆشنبیریی خەڵکی کەرکووك، دانیشتووانی کەرکووك بە تاسەوە چاوەڕیی بەرهەمەکانی تیپی شانۆی مەشخەڵیان دەکرد. دیارە زۆرینەی بینەران کورد بوون، بەڵام بەشێکی بەرچاوی بینەرانی ئەو سەردەمە، بەتایبەتی لە نمایيشی (دایکی شەهید)دا عەرەب و تورکمان و ئاسووریشی تێدا بوون.

*** مستەفا پەژار بە دەستکاریکردنی دەقەکەی زۆر نیگەران دەبوو:**
شانۆنامەی (دایکی شەهید)ی مستەفا پەژار، نۆبەرەی بەرهەمی شانۆیی تیپی شانۆیی مەشخەڵی شاری کەرکوك بوو، نمایشەکە سەرەتای مانگی گەلاوێژی ساڵی حەفتا، واتە هەر چوار مانگ پاش بەیاننامەی ١١ی ئادار پێشکەش کرا. چۆن بەم ماوە کورتە، بە کەمتر لە چوار مانگ، تیپێکی شانۆیی، تیپی مەشخەڵ لە شاری کەرکووك دامەزرێنرا؟ چۆن ئەم تیپی مەشخەڵە توانی لە ماوەیەکی ئەوەندە کورتدا یەکەم بەرهەمی خۆی بۆ خەڵکی شاری کەرکووك، پاشتریش بۆ خەڵکی سلێمانی نمایش بکات؟ بە مەرجێك تیپەکە پەنای نەبردە بەر شانۆنامەیەکی پێشتر نووسراو، بگرە هەر لەم ماوە کورتدا مستەفا پەژاری شاعیر و نووسەر شانۆنامەی (دایکی شەهید)ی بۆ ئەم تیپە نووسی، کە بە پێوەری ئەوکات، تا ڕادەیەکیش بە هەندێ پێوەری ئێستا، لەنێو تێکستە خۆماڵییەکانی شانۆی کوردیدا شانۆنامەیەکی پەسەند بوو.

شێوازی شانۆنامەکە دەکرێت بخرێتە ناو چوارچێوەی ڕێبازی شانۆی سیاسییەوە، بەڵام نەك بە شێوازێکی ئایدۆلۆژی و فیکری شانۆی سیاسی، بگرە زیاتر لە شێوازێکی میلۆدرامانەی ورووژێنەردا، ئەم شقڵە میلۆدرامییە ڕاستە خەڵکی دەورووژاند و جەماوەرێکی زۆری بەرەوە شانۆ کەمەندکێش کرد، بەڵام سەرەڕای ئەوەیش، شانۆنامەکە لەلایەنی ئەدەبییەوە چەند تایبەتمەندێتییەکی تەکنیکی نووسینی شانۆیی تێدابوو، لەوانە تێر و تەسەلیی زمان و دیالۆگەکانی، کە بۆ بینەرانی ئەو قۆناخەی شانۆی کوردی بەگشتی و بینەرانی شانۆ لە کەرکووك بەتایبەتی، زمانێکی درامیانەی بەجۆش و لەبار بوو، تا ڕادەیەکی باشیش سەرکەوتوو بوو.

ڕاستییەکەی مستەفا پەژار وەکوو شاعیر و نووسەر خاوەنی زمانێکی پاراو و چڕ بوو، بەلایشییەوە گرنگ بوو ڕێز لە شێوازی نووسینەکەی بگیرێت و بەبێ پەروا دەستکاریی تێکستەکەی نەکرێت، هەر بۆیە گەلێك جار لەگەڵ دەرهێنەر (سەلمان فایق) و ئەکتەرەکاندا کێشەی بۆ دروست دەبوو. ئێمەی ئەکتەرانی شانۆنامەکە ئەو کات، بە لامانەوە سەیر بوو نووسەر زوو زوو سەردانمان بکات و لە پرۆڤەکاندا ئامادە بێت، لەسەر ئەم وشە یان ئەو وشە، ئەم ڕستە یان ئەو ڕستە، ئەم دەربڕین یان ئەو دەربڕین، هەڵداتەوە و بێتە وەڵام و نارەزایی دەربڕێت.

هەرچەندە دەرهێنەر و ئێمەی ئەکتەرەکانیش کەسمان زمانی کوردیمان لەو باشتر نەدەزانی، کەسیشمان ئەوەندەی ئەو زمانێکی ئەدەبیی پوخت و پاراومان مەبەست نەبوو. بۆیە لێرەولەوێ کە بە ئازادی دەستکاریی ئاخاوتنەکانمان دەکرد، یان بە شێوەیەکی جیاواز دەمانگوتنەوە، مامۆستا پەژار نیگەران دەبوو و نارەزایی دەدەبڕی. ئەو ڕۆژانەی کە نووسەری شانۆنامەکە ئامادە دەبوو هەستمان بە نیگەرانی دەکرد و لە مەشق و پرۆڤەکاندا ئاسوودە نەدەبووین؛ بەپێچەوانەشەوە، ئەو ڕۆژانەی کە لەو پرۆڤەکاندا ئامادە نەدەبوو، بۆ ئێمە وەکوو جەژن وا بوون.

ئێستا دەزانم کە چەند هەڵە بووین، بوونی نووسەر لە پرۆڤەدا بۆ زۆربەی دەرهێنەران و ئەکتەران، دیارییەکی گەورەیە، چونکە نووسەر دەتوانێت هاریکار بێت و ئەرکی دراماتورگ ببینێت و وەڵامی گەلێك پرسیاری گرنگ بداتەوە. میرهۆڵد، پاش مردنی مایاکۆڤسکی دەڵێت: بێ ئامادەبوونی خۆی لە پرۆڤەکاندا، نازانم چۆن شانۆگەرییەکانی بۆ شانۆ دەربهێنم!"
سەلمان فایق زۆر جار مەیلی ئەوەی هەبوو، دەستکاریی دیالۆگەکان و تەنانەت دیمەکانیش بکات، بەڵام بە چ ئاراستەیەك؟ بە ئاراستەی میلۆدراما و کۆمیدیا و گاڵتەجاڕی. پەژاری نووسەر بەمە نیگەران دەبوو و هەڵی دەدایەوە. ئەوکات من دژ بەو هەڵوێستەی ئەو بووم، بەڵام ئێستا ڕێزی لێ دەگرم.

ئەم دوو دیدە دژبەیەکە لە بنیاتی دیمەنەکانی شانۆنامەکە بەئاشکرا ڕەنگی دابووەوە، تا نمایشی یەکەمیش نەمدەزانی کە بۆچوونەکانی پەژار ڕاست بوون، چونکە سەرەڕای سەرکەوتنی بێ ئەندازەی نمایشەکە وەك شانۆنامەیەکی سیاسی، بەڵام ئەو پریشکە کۆمیدییانەی کە بە زۆر لەلایەن دەرهێنەرەوە پەستێنرابوونە ناو شانۆنامەکە، لە ڕووی هونەرییەوە خراپ کاری کردبووە سەر شێواز و ستایلی نمایشەکە.

شانۆنامەکە باسی لە دایکێك دەکرد کە تاکە کوڕێکی هەیە، ئەم کوڕە تاقانەیە بێ ئاگای دایکی ئالوودەی جیهانی نهێنیی سیاسەت و کوردایەتی بووە، بە ئەندازەیەك کە دەبێت دایکی بەجێبهێڵێت و ببێت بە پێشمەرگە، باوکیشی پێشتر هەر ڕێگەی پێشمەرگایەتیی گرتووەتە بەر و شەهید بووە. ئەم دیمەنە لە نمایەشکەدا کاریگەرییەکی پرسۆزی هەبوو، پاشان چەك هەڵدەگرێت و بەکردەیی بەشداریی خەباتی پێشمەرگایەتی دەکات، تاکوو شەهید دەکرێت.

سەرەڕای خۆبەختکردنی باوك و کوڕ، پاڵەوان لێرەدا هەر دایکە، نووسەر جەخت لەسەر خۆبەختکردن و هەڵوێستی ئازایانەی دایك دەکات. پێمان دەڵێت دایکی کورد هیچی لە دایکە ڕووسەکەی مەکسیم گۆرکی کەمتر نییە، بە دووریشی نازانم نووسەری شانۆنامەی (دایکی شەهید)ی لەژێر کاریگەرێتیی ڕۆمانی (دایك)ی گۆرکی نووسیبێت، کە لەو سەردەمەدا یەکێك بوو لە ڕۆمانە بەبرەوەکان.

*** چاوەڕوان نەدەکرا دوای قۆناخێکی قاتوقڕی هونەری، بە نمایشێکی بەهێزەوە سەرهەڵبدات:**
ئەگەر باس لە مۆرکی میلۆدرامابیانەی (دایکی شەهید) بکەین، ئەمجا بێین ئەو مۆرکەی لێ بکەین بە کەمایەسی و لاوازی، بە بیانووی ئەوەی کە نووسەری شانۆنامەکە سۆز و هەستی خەڵکی دەبزوواند، پێم وایە ئەم بۆچوونە تەنانەت مەکسیم گۆرکیش دەگرێتەوە، هەرچەندە گۆرکی نووسەرێکی شانۆیی گەلێك بەتوانایە. ئەگەر سیاسەت و ئایدۆلۆژیای ڕەسمی دەوڵەتی سۆڤیەتی (سۆسیال ریالیزم) نەبوایە، توانای شانۆیی گۆرکی لە سەرانسەری جیهاندا باشتر دەردەکەوت، باشترین بەڵگەش بۆ ئەم بۆچوونەم

شانۆنامەکانی پێش قۆناخی سۆڤیەتی ستالینیزمە، کە تاکوو ئێستایش نمایش دەکرێن.
ئەگەر لە ڕوانگەی ئەدەبییەوە بڕوانینە شانۆنامەی (دایکی شەهید)ی مستەفا پەژار، دەکرێت بڵێین شانۆنامەیەکی کوردی پەسەند بوو، ئەگەر بە ستانداردی شانۆی کوردی تەماشای بکەین، ئەوا یەکێك بوو لە دەقە باشەکانی سەردەمی خۆی و گەلێ مەرجی هونەریی شانۆنامەنووسینی لەخۆ گرتبوو. بەداخەوە دەقەکە بە چاپ نەگەیەندرا، ڕەنگە هۆکاری سەرەکییش کۆچی ناوادەی نووسەرەکەی بێت، بێجگە لە بارودۆخی سیاسیی شاری کەرکووك. ئاواتەخوازم هەر کەسێك تێکستی شانۆنامەی (دایکی شەهید)ی لەلایە، بەتایبەتی خودی تێکستە ئەسڵییەکەی نووسەر، بیگەیەنێتە هەر دەزگایەکی چاپ، بۆ ئەوەی وەکوو بەڵگەیەکی شانۆیی ئەو سەردەمە بمێنێتەوە.
کە دەڵێم تێکستی نووسەرەکە وەك ئەوەی کە نووسەر خۆی نووسیبووی، مەبەستم ئەوەیە ئەو تێکستەی کە هاتە نمایشکردن، چەند جیاوازییەکی گەورەی لەگەڵ تێکستەکەی مستەفا پەژاردا هەیە. دەرهێنەر لە هەندێك دیمەندا دەستکاریی تێدا کرد. دەستکارییەك کە ناکرێت بە گۆڕانکاری لە قەڵەم بدرێت، من بۆ خۆم وشەی دەستکاری بە باری نەرێنیدا بۆ خراپ مامەڵەکردن لەگەڵ تێکستدا بەکار دێنم، گۆڕانکارییش بۆ مامەڵەی زیرەکانەی دەرهێنەر لەگەڵ تێکستدا بەکار دێنم، بەشبەحاڵی خۆم دژ بە گۆڕانکاری نیم لە تێکستدا، بەڵام وەکوو پیتەر بروك دەڵێت چ گۆڕانکارییەك؟
وەکوو لە وتاری پێشوودا ئاماژەم پێ کردبوو، نووسەر خۆی زۆر دژ بەم دەستکارییانە بوو، کە مامۆستا سلێمان فایەق، دەرهێنەری شانۆنامەکە، ڕۆژانە لە کاتی پرۆڤەکاندا سەرپێییانە ئەنجامی دەدا. ئێمەی ئەکتەرانی شانۆنامەکەیش، نەزانانە لایەنی دەرهێنەرمان دەگرت، بێ ئەوەی تێ بگەین کە مستەفا پەژار مافی ڕەوای خۆی بوو، وەکوو نووسەر بەرگری لە ئاستی ئەدەبیی شانۆنامەکەی بکات. هەر جارێك کە ئامادەی پرۆڤەکان دەبوو، تووشی شۆك و سەرسوڕمان دەبوو، بەتایبەتی کە دەیبینی دیمەنێکی کۆمیدی کتوپڕ خزێنراوەتە ناو جەستەی دیمەنە تراژیدییەکانەوە، یان بە هەڵپەڕکێ و شایی گۆزارە لە شادی و خۆشی دەکرا.

*** "تۆ شانۆنامەکەی منت کردووە بە کۆمیدی!"**

ئەمە قسەی مستەفا پەژار بوو، کە بە دەرهێنەری دەگوت. ئێمەی ئەکتەرانی شانۆگەرییەکەش ئەم قسەیەمان بە تەوس و گاڵتەوە وەردەگرت. بەشبەحاڵی خۆم، بە فامی ئەو کاتەم، نەمدەزانی نووسەر چەند هەست بە دڵشکان، بگرە چەند هەست بە ئازار و نیگەرانی دەکات، کاتێك بەرهەمە ئەدەبییەکەی بەو ئەندازەیە دەستکاری دەکرێت، بە ڕادەیەکی ئەوتۆ کە شانۆنامەکەی بە ئاراستەیەکی دیکەدا، ئاراستەی تەرسا و پێچەوانەدا دەڕوات، بە جۆرێك کە تێکستەکە پێوەندیی بە خودی شانۆنامە ئەسڵییەکەوە نەمێنێت. دیار بوو کە نووسەر لەم بەدحاڵیبوون و لە کێشەیەدا بەرامبەر بە دەرهێنەر تەواو تەنیا بوو، کەس لایەنی وی نەدەگرت، بە ڕادەیەك لە پرۆڤەکاندا بەتەنیا دادەنیشت و خەمباری و کەسەری پێوە دیار بوو. پاشتر کە زیاتر و قووڵتر چوومە ناو جیهانی شانۆوە، تێگەیشتم ئەم کێشەیە، کێشەی نێوان دەرهێنەر و نووسەر و جیاوازیی بۆچوون و لێکدانەوەی هەردووکیان، گەلێك کۆنە، بۆ یەکەم جار بە زەقی لەنێوان ستانیسلاڤسکی و چیخۆڤدا هاتە ئاراوە.
دەرهێنەری شانۆنامەی (دایکی شەهید) کەمتر بایەخی بە لایەنی ئەدەبیی شانۆنامەکە دەدا، وەکوو زۆربەی دەرهێنەرانی ئەنتی ئاخاوتن (دژ بە دیالۆگ) بەپێی پێویست بایەخی بە دیالۆگ، کە بڕبڕەی پشتی دەقی شانۆییە، نەدەدا. لە ڕاستیشدا ئەو لەم دەردە کوشندەیەدا تەنیا و ناوازە نییە. هەموو دەرهێنەرێك توانای بەسەر بەڕێوەبردنی ئاخاوتندا ناشکێت، گەلێك ئاسانترە لەسەر شانۆدا مامەڵە لەگەڵ کردار و ڕووداو و جووڵە و دەربڕینی جەستەیی بکەیت. دەرهێنەری (دایکی شەهید)یش لەم جۆرە دەرهێنەرانە بوو. بۆیە دەستکارییەکی سەرپێییانەی چەند دیمەنێکی شانۆنامەکەی کردبوو، ئەو دەستکاریکردنە لە شێوەی تێخزاندنی دیمەنی کۆمیدی کورت کورت بوون، مەبەستیش تەنیا بۆ دروستکردنی کاریگەرێتییەکی ڕووکەشانەی ڕاستەوخۆ بوو لە دڵ و دەروونی بینەراندا، ئەمەش پەڵەیەکی دزێو بوو بەرامبەر بە چەندین لایەنی گەشی نمایشەکە، کە پاشتر بوو بە مایەی ڕەخنەگرتن لە نمایشەکە.
شانۆنامەی دایکی شەهید دوای قەدەغەکردنی شانۆی کوردی بۆ پتر لە دوازدە ساڵ (لە ١٩٦٢ەوە بۆ ١٩٧٤) لە کەرکووك، وەك دەستپێکێکی چاوەڕواننەکراوی بەهێز، لەو سەردەمەدا هاتە نمایشکردن. چونکە بە هیچ جۆرێك چاوەڕوان نەدەکرا شانۆ لە کەرکووکدا، دوای قۆناخێکی قات و قڕی هونەریی، بە نمایشێکی بەهێزەوە سەر هەڵبدات، یەکسەریش بەرهەمەکانی لە شاری سلێمانی پاشتریش لە هەولێر، لەکۆتاییشدا لە بەغدا نمایش بکرێت.

*** دامەزراندنی تیپی مەشخەڵ یەکێکە لە شانازییەکانی یەکێتیی قوتابییانی کوردستان:**

بەرلەوەی بچمە سەر باسی نمایشەکانی تیپی شانۆی مەشخەڵی کەرکووك، دەمەوێت بەکورتی باسی پێکهاتەی تیپەکە بکەم.
تیپی شانۆی مەشخەڵ، لەلایەن یەکێتیی قوتابییانەوە هاتە دامەزراندن، بەڵام پاشتر گەلێك کەسی ئارەزوومەندی خاوەن توانا ڕوویان لە تیپەکە کرد کە ئەوانە زۆربەیان قوتابی نەبوون، ئەمە تیپەکەی گەیاندە قۆناخێکی نوێ و ئاستێکی بەرزتر، کە پاشتر فراوانتر باسی لێوە دەکەم.
تەنانەت بەهرەمەندانی عەرەب و تورکمان و ئاشووری هەبوون کە هەواداری تیپی مەشخەڵ بوون و دەیانویست تێیدا ببن بە ئەندام.
بەشبەحاڵی خۆم، بەهۆی تیپی شانۆی مەشخەڵەوە، سۆزێکی گەرمم بۆ ڕێکخراوی یەکێتیی قوتابییان هەبوو، پێشم وایە

دامەزراندنی تیپی مەشخەڵ یەکێکە لە شانازییەکانی لقی یەکێتیی قوتابییانی کوردستان.

*** سەرپەرشتیاری تیپ مامۆستا فەریدوون کەریم:**

کە باس لە تیپی شانۆی مەشخەڵ دەکرێت، گرنگە باسی رۆڵی مامۆستا فەریدوون کەریم بکرێت. مامۆستا فەریدوون عوسمان لەلایەن لقی سێ و ناوچەی پارتی و یەکێتیی قوتابییانەوە بۆ بەڕێوەبردنی تیپی شانۆی مەشخەڵ تەرخان کرابوو. مامۆستا فەریدوون لە چوارچێوەی ئەم ئەرکەدا رۆڵێکی کارا و گرنگی لە راگرتنی تیپی مەشخەڵ و بەڕێوەبردن و گەشەپێدانیدا هەبوو.

جا بەپێی ئەوەی کە مامۆستا خاوەن دید و ڕوانگەیەکی فراوان و هەمەلایەن و کەسایەتییەکی رۆشنفکر بوو، مامۆستای دواناوەندی و لە رەفتارکردن و مامەڵەکردن لەگەڵ ئەندامانی تیپەکە خاوەن ئەزموونی زانستییانە و مرۆییانەیش بوو، بەتایبەتی لەگەڵ ئەکتەرەکاندا، ئەوانەی کە تروسکایی بەهرەی تێیاندا بەدی دەکرد، مامۆستا نەك تەنیا بایەخی پێدەدان، بگرە لە کاتی کێشە و لە یەکتر تێنەگەیشتن و ناکۆکیدا لایەنی ئەو کەسانەی دەگرت و پشتگیریی لێ دەکردن، واتە دیدی حزبی و سیاسی بەسەر لایەنی هونەر و رۆشنبیرییدا زاڵ نەدەکرد.

بۆ ئەوەی باشتر ئەم خاڵە روون بکەمەوە، پێویست دەکا ئەوە بڵێم کە ژمارەیەکی باشی گەنجانی بەهرەمەندی شاری کەرکووك هاتنە ناو تیپی شانۆی مەشخەڵەوە، راستە زۆربەی ئەندامانی تیپەکە ئەندامی قوتابییان بوون، بەڵام ژمارەیەکی باشیشیان ئەندامی قوتابییان یان پارتی دیموکراتی کوردستان نەبوون، لەناو ئەندامە بێلایەنەکاندا کەسانێك هەبوون بەهرەدارتر و خوێندەواتر بوون، یان هەر نەبێت لەوانی دیکە بەتواناتر بوون، ئەوانە زۆر جار بە بیانووی بێلایەنییەوە کێشەیان بۆ دروست دەکرا، بۆ ئەوەی کەنارگیر بکرێن، مەسەلەکەیش تەنیا ئیرەیی بوو بە بەهرە و توانا و هیچی تر! بۆ ئەوەی لە ئەنجامیشدا وەرس بن و تیپەکە بەجێبهێڵن. ئەوەی جێگەی داخە، دەرهێنەری تیپ، مامۆستا سلێمان فایەق، لەم کێشەیەدا نەیدەتوانی لای ئەو کەسانە بگرێت کە بەهرەمەند بوون، ئەگەرچی بۆ نمایشەکەی خۆی پێویستیش بوون، تەنانەت هەندێك جار وا هەست دەکرا، کە پێی خۆش بوو کەسانێکی بەتوانا برۆن، هەرچەندە ئەو کەسانە سالآنیك بوو لە شانۆی قوتابخانەکەوە ئەزموونێکیان پێك هێنابوو، لەوانە من و فەهمی کاکەیی، کە پاشتر هەردووکمان، وەك دوو کوردی بەشەرەف، بەناچاری ئینشیقاقمان کرد و تیپێکی دیکەمان بە ناوی تیپی شانۆی سۆلاڤ دروست کرد.

تاکە کەسێك کە داکۆکیی لە ئێمە دەکرد مامۆستا فەریدوون بوو، ئەمەیش بۆ ئێمە کەم نەبوو، چونکە ئەو کەسی یەکەم و خاوەن بڕیار بوو، ئەوجا ئەوەیان لەسەر ئێمە، لەلایەکی دیکەوە چەند تووشی کێشە دەبوو، ئەوەیان من ناتوانم باسی لێوە بکەم.

مامۆستا فەریدوون کەریم بەردەوام لە مەشق و راهێنان و پرۆڤەکاندا ئامادە دەبوو، هەندێك جاریش تێبینی و سەرنجی وردی هەبوو، ئەم بایەخدانەی مامۆستا فەریدوون بە پرۆسەی کار و رەوتی پرۆڤەکانمان، بوو بە هۆکارێك کە بیر لەوە بکاتەوە بۆ شانۆ بنووسێت، ئەوە بوو شانۆنامەیەکی باشی دەربارەی ئەفسانەی زوحاك و کاوە، بە شێوەی میتۆلۆژییەکەی، دوور لە شێوازە باوە (تقلید)ییەکە نووسی، وەکوو بەرهەمی سێیەمی تیپی مەشخەڵ نمایش کرا.

مامۆستا فەریدوون کەریم، پێگەی کارگێڕی و سەرپەرشتیارێتیی خۆی لە بەڕێوەبەرێتیکردنی تیپەکەدا، بۆ بەرژەوەندیی پرۆسەی هونەر و ئەدەب خستبووە گەڕ، لایەنی ئەو کەسانەی دەگرت کە خاوەن بەهرە بوون، بەدەر لەوەی ئەو کەسە لایەنگر یان بێلایەن بووایە. ئەو لە کێشەکاندا لە کاتی پێویست پەیدا دەبوو، کە ئەو دەهات، ئیدی دەمانزانی کێشەکە چیدی درێژە ناخایەنێت و هەر لە شوێن و کاتی خۆیدا چارەسەر دەکرێت.

ئێوارەیەکی فێنك، پاش پرۆڤەیەکی بەردەوام لە باخچەی بەهووی شارەوانی، من و دەرهێنەر لەسەر جووڵەیەك نەدەگونجاین، ئەو شێوەیەکی پێ پەسەند بوو، من شێوەیەکی دی، نەگوجانی لەو جۆرە لە شانۆدا ئاساییە، بەڵام ئەو یەکسەر وەکوو ئەوەی ئەو کێشە بچووکەکە بقۆزێتەوە پێی گوتم: ئەگەر بەدڵت نییە باشتر وایە برۆیت.

پێم سەیر بوو، لە لایەکەوە زۆر دڵم بە رۆڵەکەم خۆش بوو، کە رۆڵی سەرەکی بوو، لەلایەکی دیکەشەوە دەمزانی دەبێت برۆم، دەشمزانی ناکرێت برۆم، چونکە تەنیا دوو سێ رۆژ ماوە بۆ نمایش، فریای راهێنانی ئەکتەرێکی نوێ ناکەون.

تەماشای ئەکتەرەکانم کرد، هەموو ئەندامانی تیپەکە حەپەسابوون، یەکسەر بڕیارم دا و رۆیشتم، زۆر تووڕە بووم، بەڵام هەر ئەوەندە لە باخچەی بەهووی شارەوانی دەرچووم، بینیم مامۆستا فەریدوون لەدوورەوە دەرکەوت، بەسەرسوورمانەوە: گوتی بۆ کوێ؟

هەموو شتێکم بۆ باس کرد، پێکەنی و گوتی:

بگەڕێوە، تۆ نابێت برۆیت، ئەگەر کەسێك هەبێت بروات دەبێت ئەو بێت نەك تۆ، بۆ من تۆ هونەرمەندتری، هەر تۆیش دەمێنیتەوە.

بۆچوونەکەی مامۆستا راست دەرچوو:

پاش تیپی مەشخەڵ، مامۆستا سەلمان فایق، کە بە رای من باشترین دەرهێنەری شانۆیی نیوەی یەکەمی حەفتاکانە، شانۆی بۆ هاتەهەتایە بۆ سینەما بەجێهێشت، منیش شانۆم وەك چارەنووس بۆ هەتا هەتایە هەڵبژارد.

*** گەشتە هونەرییەکانی تیپی شانۆی مەشخەڵ:**

کە باسی گەشتەکانی تیپی شانۆی مەشخەڵی شاری کەرکووك دەکەم، دەمەوێ باسی ئەوە بکەم چۆن ئەم تیپە بە سنووری شاری کەرکووکەوە نەوەستا، بگرە هەر لە سەرەتاوە نەخشەی وابوو، شانۆییەکانی بۆ زۆرترین جەماوەری شارەکانی دیکەی کوردستان نمایش بکات، بە جێبەجێکردنی ئەم نەخشە هونەرییە، تیپی مەشخەڵ

کاریگەرییەکی گەورەتر و سەدایەکی باشی لەدەرەوەی شاری کەرکووکیشدا پەیدا کرد.

پێم وایە تیپی شانۆی مەشخەڵ لەم ئەزموونەدا دەستپێشخەر و ڕچەشکێنە، بەر لە مەشخەڵ هیچ تیپێکی شانۆیی پلانی لەم جۆرەی ئەنجام نەدابوو، ڕەنگە کەسێك بەرپەرچی ئەم قسەیەم بداتەوە و بڵێت، بەر لە تیپی مەشخەڵ، چەند تیپێکی شانۆیی گەشتی هونەرییان ئەنجام داوە، ڕەنگە ئەم قسەیەش ڕاست بێت، بۆ نموونە لە شاری سلێمانی تیپ هەبووە، هەر وەکوو مامۆستای خەمخۆری ئەرشیڤی شانۆی کوردی، مامۆستا کاوە ئەحمەد میرزا ئاماژەی پێ کردووە، گەشتی هونەریی ئەنجام داوە، بەڵام ئەو گەشتانە هەر لە سنووری فراوانی شاری سلێمانی ئەنجام دراون، لەوانە بۆ شاری هەڵەبجە کە ئەوکات پارێزگا نەبووە و شارۆچکەکانی دەوربەری شاری سلێمانی.

بەڵام بەشبەحاڵی تیپی مەشخەڵ، هەر سێ نماییشە سەرەکییەکانی خۆی لە شاری سلێمانی و هەولێر، پاشتریش بەناوی کۆمەڵی هونەری کوردی لە بەغدا نمایيش کرد، هەموو شانۆییەکیش بۆ چەند ڕۆژێك نمایيش کراون، لەلایەن شانۆکارانی هەردوو شارەکەوە بەهەند وەرگیران، وەکوو ئەزموونێکی تایبەت و جودایش پێشوازییان لێ کرا.

پلانی گەشتی هونەری لە شارەکانی کوردستاندا و خۆناساندن بە جەماوەرێکی دیکەی دەرەوەی شاری کەرکووك، پرۆگرامێکی زیندووی تیپی شانۆی مەشخەڵ بوو. ئێمە لەو گەشتانەدا بۆ یەکەم جار لەنزیکەوە شانۆکارانی شارەکانی دیکەمان ناسی و پێوەندیی پتەومان لە گەڵیاندا دروست کرد، پێوەندییەك کە سوودبەخش بوو و بە مایەی هاریکاریکردنی یەکدی و دەرئەنجام بەرهەمی باشی لێ کەوتووە، ئێمەیش لەو گەشتانەدا ئاشنای توانا و بەرهەمەکانی شانۆکارانی سلێمانی و هەولێر بووین، هەروەها توانا و بەهرەی خۆمانمان بە بەراورد لەگەڵ توانای ئەواندا بۆ دەرکەوەت و تێگەیشتین ئێمە لە چ ئاستێکداین و قۆناخێکی باشمان بڕیوە.

تیپی مەشخەڵ بەو ماوە کورتەی تەمەنی، سێ گەشتی هونەریی گرنگی ئەنجام دا:

گەشتی یەکەمی تیپی مەشخەڵ، شانۆنامەی (دایکی شەهید) بوو، واتە لەمیانەی سێ مانگدا تیپ دامەزرێندرا و بەرهەمی یەکەمی نمایيش کرد، دەستبەجێ نمایيشەکەی خۆی گواستەوە بۆ سەر شانۆی ئامادەیی سلێمانی، کە بۆ ئەو سەردەم و دەورانە، گەورەترین و باشترین شانۆ بوو لە شاری سلێمانی.

لە گەشتی دووەمدا بۆ شاری سلێمانی، تیپی مەشخەڵ شانۆگەریی (کۆتایی دەرەبەگ)ی لەسەر شانۆی ئامادەیی سلێمانی نمایيش کرد.

لە گەشتی سێیەمدا بۆ شاری هەولێر تیپی مەشخەڵ شانۆنامەی (ژیان)ی لە هۆڵی گەل نمایش کرد.

تا ئەو کاتە هۆڵی گەل لە ڕووی تەکنیك و ئەندازیارییەوە، لە سەرانسەری کوردستاندا باشترین شانۆ بوو، کە وەکوو ئەکتەر لە شانۆنامەی (ژیان)دا لەسەر شانۆی هۆڵی گەل ڕۆڵم گێڕا، یەکەم جارم بوو هەست بکەم کە لەسەر شانۆیەکی ڕاستەقینە وەستاوم، شانۆیەك کە شانۆی قوتابخانە نەبوو، یان سەکۆیەك نەبوو کە بۆ نمایشێکی کاتی دروست کرابێت، شانۆیەکی سەربەخۆ بوو، یەکەم جار بوو هەست بکەم کە لەسەر شانۆیەك نمایش دەکەم، کە بۆ ئەوەی دەنگم بە ئاسانی و بە ڕەوانی بگاتە بینەران، پێویستم بەوە نەبوو زۆر دەنگ هەڵبڕم و هاوار بکەم، ئەو هۆڵە وا دروست کرابوو، بینەران لە دوا ڕیزەوە گوێیان لە چرپەی ئەکتەر دەبوو. بە خۆمم گوت: ئافەرین بۆ ئەو ئەندازیارەی نەخشەی ئەم شانۆیەی کێشاوە.

لەم ڕووەوە ئەم گەشتە هونەرییانە چەند بۆ جەماوەری شارەکانی دیکە گرنگ بوون، ئەوەندەیش بۆ خودی شانۆکارانی کەرکووك گرنگ بوو. لەمەیشدا شانۆکارانی کەرکووك تایبەتمەندێتی و ئاستی ڕۆشنبیریی خۆیانیان بۆ دەرکەوت، تایبەتمەندێتییەك کە لە مۆرك و شقڵی فرەکولتوورییەوە سەرچاوەی گرتبوو، فرەکولتووری وەك پەنجەرەیەکی والای بزاڤی ڕۆشنبیری و مەعریفە.

تیپی مەشخەڵ لە ڕێگای گەشتە هونەرییەکانەوە پێگە و بایەخی خۆی بۆ شانۆکارانی شاری سلێمانی و هەولێر و لە کۆتاییشدا بۆ شانۆکارانی بەغدا سەلماند.

بەڵام نەبوونی ڕەخنە و لاوازیی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن لەو سەردەمەدا، ئەم ڕاستییەی دەرنەدەخست، بۆیە شانۆکارانی کەرکووك دەبوایە چاوەڕێی فیستیڤاڵی یەکەمی هونەر بکەن لە بەغدا، تاکوو ڕاستی و دروستیی ئەم بۆچوونە بە بەڵگەوە بسەلمێنن.

لە فیستیڤاڵی یەکەمی هونەردا کە ساڵی حەفتا و چوار لە بەغدا ساز کرا، شانۆکارانی کەرکووك هەموو خەڵاتەکانی ئەو فیستیڤاڵەیان درەو کرد، لەوانە خەڵاتی باشترین بەرهەم (شانۆگەریی تەقینەوە)، باشترین نووسەر، باشترین ئەکتەر درا بە هونەرمەند (عەلی کەریم)، باشترین ڕیژیسۆر (سەلمان فایق). ئەندامانی لیژنەی دادوەریش ڕیژیسۆری شانۆ و سینەما (جەعفەر عەلی)، خانمە ئەکتەریی شانۆی عێراقی (زەینەب)، نووسەری شانۆیی (موحێدین زەنگەنە) و مامۆستا (سەعید زەنگنە و شێرکۆ بێکەس).

بەڵام شانۆکارانی کەرکووك بە بردنەوەی هەموو خەڵاتەکانی شانۆ لەو فیستیڤاڵەدا، لەبری پاداشت و دەستخۆشی و کۆمەك و هاندان لە لایەن دەسەڵاتدارانی کەرکووکەوە، بە تۆپزی و بە شێوەیەکی زۆر نائینسانییانە ڕێگای داهێنانیان لێگیرا.

هەر پاش چەند ڕۆژێك دەبوایە زەهراوی ئەو بڕیارە بچێژن، کە ئیدی نابێت لە شارەکەی خۆیاندا شانۆ بە کوردی نمایيش بکەن، دەبێ دیسانەوە مل بۆ ئەو بڕیارە تاڵەی میری کەچ بکەن، کە شانۆ بە کوردی لە کەرکووك قەدەغەیە! شانۆکاری کەرکووکی دەبێت داهێنانی خۆی لە جوگرافیایەکی دەرەوەی شارەکەی خۆی بە ئەنجام بگەیەنێت، شانۆکارانی وەکوو (فازڵ جاف، جەلیل زەنگەنە، جیهاد دڵپاك و عەلی کەریم) ڕوویان لە شاری سلێمانی کرد، شاریش باوەشی بۆ کردنەوە.

*** عالیە یەکەم کچی کورد بوو ڕۆڵی سەرەکی لە شانۆنامەیەکی جیهانیدا ببینێت:-**

یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی شانۆ لە شاری کەرکووکی سەردەمی حەفتەکاندا، بەشداریکردنی بێ وێنەی ئافرەت بوو، کە بە شێوەیەکی چڕ و چاوەڕوان نەکراو بوو. ئەم بەشداریکردنە چڕ و پڕەی ئافرەت لە بەرهەمەکانی تیپی شانۆی مەشخەڵدا، هەر لە یەکەم بەرهەمەوە (دایکی شەهید) دەستی پێکرد. هەر لە سەرەتاوە، بۆ نمایشکردنی ڕۆڵی سەرەکی، واتە ڕۆڵی دایك، نزیکەی دە ئافرەت ئامادە بوون و دەیانویست بەشداری بکەن، لە کاتێکدا شانۆنامەکە تەنیا یەك ئافرەتی تێدا بوو، دەرهێنەر بۆ ئەوەی هەر چۆنێك بەشداری بە زۆربەیان بکات، چەند دیمەنێکی سەرپێییانەی لە نمایشەکەدا خوڵقاند، کە لە ڕاستیدا هیچ پاساوێکی هونەری یان ئەدەبی بۆیان نەبوو، ئەوەیش یەکێك بوو لەو خاڵانەی نووسەری شانۆنامەکە (مستەفا پەژار)ی نیگەران کردبوو.

ئامادەیی ئافرەت و ئارەزووی بەشداریکردنیان لە چالاکیی شانۆیی لە شاری کەرکووکدا، بە بەراورد لەگەڵ شارەکانی دیکەی کوردستاندا دیاردەیەکی بێ وێنە بوو، ئەمە لە کاتێکدا بوو، کە لە سلێمانی و لە هەولێریش، کە بە بەراورد لەگەڵ شاری کەرکووددا، ڕەوتێکی شانۆیی کۆن و نەپساویان هەبوو، لەبەر بەشداریکردنی دەگمەنی ئافرەت، ناچار بوون ئەکتەری پیاو بکەن بە ئافرەت و بە جلوبەرگ و میکیاجی ئافرەتانەوە پێشانیان بدەن. ئەوە بوو لە سەرەتای حەفتەکان، بێ گومان لە شەستەکان و پێشتریش، چەندین ئەکتەری پیاو بە ڕۆڵی ئافرەت بەناوبانگ بوون، لە هەموویان کارامەتر لە ڕۆڵی ئافرەتدا هونەرمەند عومەر چاوشین بوو.

لە کەرکووك ئەو دیاردەیە، یەك جار نەبێت، هەرگیز ڕووی نەدا، ئەو تاکە جارەیش لە شانۆیی (بەهاری دزراو) بوو، کە سلێمان فایەق بۆ ڕۆڵی ئافرەت پەنای بردە بەر ئەکتەرێکی پیاو، کەسیش لەوە نەدەگەیشت کە بۆ ئەکتەرێکی پیاوی بۆ ئەو ڕۆڵە هەڵبژارد، لە کاتێکدا ژمارەیەکی زۆر خانمی هەواداری شانۆ بەوپەڕی ئارەزووەوە ئامادەی بەشداریکردن و ڕۆڵبینین بوون.

لەنێو خانمە ئەکتەرانی کەرکووکی حەفتاکاندا توانا و بەهرەی دوو ئەکتەر لە هەمووان پتر دەرکەوت: یەکەمیان شاناز ئەحمەد، کە ڕۆڵی دایکی لە شانۆنامەی (دایکی شەهید)دا نمایش کرد، دووەمیان عالیە محەمەد ئەمین، کە ڕۆڵی ژیانی لە شانۆنامەی ژیاندا نمایش کرد:

***شاناز ئەحمەد لە (دایکی شەهید)دا:-**

شاناز ئەحمەد ڕۆڵی ناونیشانی شانۆگەرییەکەی، واتە دایکی، نمایش دەکرد، ئەم ڕۆڵە ئەوەندەی من ئاگاداری ئەرشیڤی شانۆی کوردی بم، تاکوو ناوەڕاستی حەفتاکانیش سەرەکیترین و درێژترین ڕۆڵی ئافرەت بوو لە شانۆی کوردیدا، خۆ ئەگەر لەم بۆچوونەمدا هەڵە بم، با شارەزایانی ئەرشیڤی شانۆی کوردی بۆچوونەکەم بۆ ڕاست بکەنەوە.

شاناز چ لە ڕووی هەست و سۆزە، چ لە ڕووی جەستە و جووڵەوە بەتوانا بوو، ڕۆڵەکەی بەرامبەر بە خۆم، لە ڕۆڵی دلێری کوڕ کە شەهید دەکرێت، لێهاتووانە نمایش دەکرد. لە نمایشەکانی کەرکووك و پاشتریش لە شاری سلێمانیدا توانا و بەهرەی شاناز دەنگی دایەوە.

*** عالیە محەمەد ئەمین لە ڕۆڵی ژیاندا:-**

عالیە یەکێك بوو لە کچە لێهاتووەکانی شاری کەرکووکی حەفتاکان، ئەو لە سێ بواردا بەهرە و توانای خۆی سەلماندبوو، شانۆ، وەرزش، نووسین.

لە وەرزشدا بە ئەندازەیەك لێهاتوویی خۆی سەلماندبوو، کە پاش ماوەیەکی کورت لەسەر ئاستی پاڵەوانیەتیی عێراق ڕێکۆردشکێن بوو.

بەڵام توانای هونەریی عالیە وەکوو ئەکتەر، تاکوو ئەو ڕۆژگارە، نموونەیەکی ناوازە و کەموێنە بوو. یەکەم بەرکەوتنم لەگەڵ عالیەدا لە شانۆیی (ژیان) بوو، لەم نمایشەدا، کە لە نووسین و دەرهێنانی سەلمان فایق بوو، وەکوو ئەکتەر ڕۆڵمان دەبینی، عالیە ڕۆڵی کچێکی لاڵی نمایش دەکرد، بەڵام تێیدا زۆر سەرکەوتوو بوو.

عالیە بەپێی ئەوەی وەرزشەوانێکی لێهاتوو بوو، ڕاهێنانێکی زۆری لەسەر جەستە و زەین و ئاگایی خۆی کردبوو، بۆیە لە جووڵە و دەربڕیندا تا ئەو سەردەمە ڕەنگە لە پێشی پێشەوە بوو، وەکوو دەنگ و دەمودوویش، پاشتر دەرکەوت کە توانایەکی باشی هەبوو.

پاش ئاڵۆزیی بارودۆخی سیاسی لە کەرکووك، بەتایبەتی پاش نسکۆی ساڵی ١٩٧٥، شانۆی کوردی لە کەرکووك کەوتە باری یاساغ و قەدەغەوە، شانۆکاران هەموو پەرتەوازە و پەرەوازە بوون، زۆربەی شانۆکارە پیاوەکان ڕوویان لە شاری سلێمانی کرد، بەڵام لەناو ئافرەتەکاندا تەنیا عالیە، کە پاشتر بوو بە قوتابیی زانکۆی سلێمانی، بەردەوامیی بە کاری شانۆیی دا، باشترین و بەهێزترین دەرکەوتنی عالیە لە ڕۆڵی سەرەکیی شانۆیی (دوورەگ) بوو، کە لە نووسینی لانگستون هیوز و دەرهێنانی فازڵ جاف بوو.

ڕەنگە بەرچاوترین دەستکەوت و تایبەتمەندێتیی نمایشی دوورەگ نمایشکردنی عالیە وەکوو ئەکتەریسێك کە ڕۆڵی سەرەکیی شانۆنامەیەکی جیهانی بەرامبەر عەلی کەریم و کاوە ئەحمەد میرزا بینیبێت.

ئەوەندەی من بزانم عالیە یەکەم کچ بوو، تا ئەو ڕۆژگارە، کە وەکوو ئافرەت ڕۆڵی سەرەکی لە شانۆنامەیەکی جیهانیدا ببینێت، ڕۆڵێك کە هەر لە سەرەتای نمایشەکەوە تاکوو کۆتایی، لە هەڵچوون و ململانێ و پێکدادانی درامیانەدا بوو، لەمەیشدا عالیە ڕیکۆردشکێن بوو.

داخوا کەی ڕۆژێك بێت، خانمە شانۆکارە پێشەنگەکانی کەرکووك یاد بکرێنەوە و بە شێوەیەکی فەرمی ڕێزیان لێ بنرێت و خەڵات بکرێن!

*** سەرۆك مستەفا بارزانی پەیامی دەستخۆشیی بۆ ناردین، ئێمەیش زۆر شانازیمان پێوە دەکرد:-**

دوای بڵاوکردنەوە رێککەوتننامەی یازدەی ئاداری مێژوویی، رۆشنبیری بەشێکی گرنگ و سەنترال و بەسەنگی بزاڤی گشتی بوو لە شاری کەرکووك. زیادەرۆییش نییە گەر بڵێم، بزاڤی رۆشنبیریی شاری کەرکووك بە هیچ شێوەیەك، نە پێشتر و نە پاشتر، بەرنامەیەکی لەو جۆرە دەوڵەمەند و هەمەچەشنەی بەخۆیەوە نەدیوە، بە رادەیەك کە دەکرێت، دوو ساڵی یەکەمی دوای راگەیاندنی رێککەوتننامەکە بە سەردەمی زێرینی بزاڤی رۆشنبیری لە کەرکووك لە قەڵەم بدرێت. لەم وتارەدا هەوڵ دەدەم، ئەوەندەی پێم بکرێت، تەنیا وێنەیەکی سەرپێییانە و خێرای ئەو سەردەمە بگوازمەوە، هەر چەند هەفتەیەك پاش رێککەوتننامەکە، رێکخراوە جەماوەرییەکان بارەگای خۆیان لە ناوەراستی کەرکووکدا، لە کۆتایی شەقامی کۆماری و دەوروبەری شەقامی کۆماری دامەزراند و کەوتنە چالاکی، لەوانە یەکێتیی قوتابییان، یەکێتیی لاوان، یەکێتیی نووسەران، یەکێتیی ئافرەتان.

تیپی مەشخەڵ، وەك تیپێکی شانۆیی لەو دوو ساڵەدا سوودێکی باشی لە پشتگیریکردن و هاریکاریکردنی رێکخراوەکان وەرگرت. بەتایبەتی لە یەکێتیی لاوان، کە بۆ خۆی، بە چەشنی یەکێتیی قوتابییان، چالاکییەکی باشی لە بواری شانۆدا رێکخستبوو، ژمارەیەکی زۆر لە گەنجانی ئارەزوومەند لە یەکێتیی لاوان بە سەرپەرشتیی هونەرمەند مەهدی ئومێد، چالاك بوون، هاوکات چەند تیپێکی شانۆیی دیکەی بچووك، دروست کران، راستە ئەم تیپانە لە رووی چەندێتی و چۆنییەتییەوە ئاستیان نەدەگەیشتە ئاستی تیپی مەشخەڵ، بەڵام بزاڤی شانۆییان دەوڵەمەند کربوو.

لقی سێی پارتی دیموکراتی کوردستان رۆڵی سەرەکی و کارای لە هاندان و هاریکاریی چالاکییەکانی هونەر و ئەدەبدا هەبوو، لەناو لق و ناوچەی پارتیدا کەسانێکی دڵسۆز هەبوون کە کاریان بۆ گەشەی ئەدەب و هونەر دەکرد، لە سەرووی هەموانە مامۆستا فەریدوون کەریم (فەریدون عوسمان) و بەرپرسی قوتابییانی لقی کەرکووك مامۆستا زاهیر رۆژبەیانی، بە ئەندازەیەك شاری کەرکووك لە بواری رۆشنبیریدا بووبوو بە پێشەنگ. گەورەترین رووداوی رۆشنبیری لەسەر ئاستی کوردستان و عێراق فیستیڤاڵی شیعری کوردی بوو، کە یەکێتیی نووسەران سەرپەرشتی کرد، لەم فیستیڤاڵەدا شان بە شانی شاعیران و نووسەرانی شارەکانی کوردستان، ژمارەیەکی زۆری نووسەر و ئەدیبانی عێراقیش میوان بوون، لە سەرووی هەموویان شاعیری گەورەی عەرەب (محەمەد مەهدی جواهیری)، میوانی هەرە گەورەی فیستیڤاڵەکە بوو، زۆربەی نووسەرانی کورد شانازییان بە بوونی جەواهیری دەکرد و وێنەیان لەگەڵدا دەگرت، لەو فیستیڤاڵەدا، شیعردۆستانی شاری کەرکووك لە نزیکەوە ئاشنای دەنگی شاعیرانی وەکوو شێرکۆ بێکەس و لەتیف هەڵمەت و جەمال شارباژێری و عەبدوڵڵا پەشێو و جەلالی میرزا کەریم بوون.

ئەو سەردەمە تەوژمی نوێخوازانەی روانگە لە ترۆپکدا بوو، هەموو لە کەرکووك کۆ بوونەوە، بۆ خۆم زۆر هەواداریان بووم، لە یەکەم دەرفەتدا لە ئوتێلی (سەمیر ئەمیس) سەردانم کردن و بە یەك بەیەکیان ئاشنا بووم.

فیستیڤاڵی شیعری کوردی لە کەرکووك رووداوێکی گرنگ بوو، شان بە شان چالاکییەکانی دیکەی بواری هونەر و ئەدەب، ئەوەی سەلماند کە کەرکووك لەو دوو ساڵدا خاوەنی وزەیەکی گەورەی رۆشنبیرییە، بەراستی پایتەختی رۆشنبیریی کوردستان بوو، نەك تەنیا خاوەنی کانگای و کێڵگەی نەوت. من پێم وایە دەستەواژەی ئەدەبی بەرگری لە خۆشەویستیی ئەو شاعیرانە بۆ کەرکووك برەوی سەند.

بەرهەمەکانی تیپی شانۆی مەشخەڵیش لەلایەکی دیکەوە، رووداوێکی هونەریی گەورە بوو، رووداوێك کە سنووری کاریگەریی هونەری بەزاند بۆ کاریگەریی سیاسی، نماییشەکان دەستگاکانی میری، بەتایبەتی دەستگەی پۆلیس و ئاسایشی نیگەران کردبوو، ئەو نیگەرانییەشیان نەدەشاردەوە، بە هەموو جۆرێك دەیانویست چالاکیی ئەو تیپە، پاشتریش چالاکیی شانۆیی بەگشتی لە کەرکووکدا قەدەغە بکەن.

لە یەکێك لە نماییشەکانی شانۆیی (دایکی شەهید) دوو کارمەندی ئاسایش پەیدا بوون، بەرپرسی لقی سێ، کاك رەشید عارف، پرسیاری لێ کردن: هۆکاری هاتنتان چییە؟ گوتیان: هاتووین ئەرکی سەرشانمان جێبەجێ بکەین، هاتووین ئاسایشی بینەران بپارێزین.

ئەویش پێی گوتن: ئەوەیان ئەرکی سەرشانی ئێمەیە، فەرموون بەزووترین کات ئێرە بەجێبهێڵن.

شانۆگەریی (دایکی شەهید) تیکۆشان و قارەمانێتیی پێشمەرگە و پێگەی گرنگی ئافرەتی کوردی لە شۆرشدا وێنا دەکرد. پێشتر هیچ تیپێك بەو شێوەیە، ئەم بابەتەی لە شانۆگەرییەکی گەورە و دوور و درێژ و لە بەرهەمێکی تێر و تەسەلەدا نماییش نەکردبوو، بۆیە نماییشەکە سەدایەکی گەورەی هەبوو، پێشوازیی خەڵکی کەرکووك، پاشتریش خەڵکی سلێمانی، لە نماییشەکە بێ ئەندازە بوو، گەیشتە ئەوەی کە سەرۆك مستەفا بارزانی، ئاگاداری کارەکەمان بووبوو، پەیامی دەستخۆشیی بۆ ناردین، ئێمەیش زۆر شانازیمان بەو پەیامەوە دەکرد، هەر بۆ ئەو مەبەستە سەردانێك بۆ دەرهێنەری نماییشەکە ساز کرا، بەو مەبەستەی کە سەرۆك لەنزیکەوە دەستخۆشیی لێ بکات.

کاردانەوەکانی (دایکی شەهید) و پێشوازیی خەڵك لە نماییشەکە، بایەخدانی سەرکردایەتیی شۆرش بە نماییشەکە، میریی نیگەران کردبوو، ئەوان نیگەرانیی خۆیان بۆ رەوانشاد کاك سامی عەبدولرەحمان دەربریبوو، ئەوەی زیاتر نیگەرانی کردبوون، ئەوەبوو کە شانۆنامەکە لەناو جەرگەی کەرکووکدا وێنەی تیکۆشانی پێشمەرگەی بەرجەستە دەکرد.

لە یەکێك لە نماییشەکاندا، کاك سامی عەبدولرەحمان لە بەغداوە گەیشت، پاش نماییشەکە، هەردوو ئەکتەری سەرەکیی دایکی شەهیدی (شاناز ئەحمەد و فازڵ جاف)ی

خەڵات کرد، خەڵاتەکە برە پارەیەك بوو (١٠ دینار) کە بۆ ئەو کات زۆر بوو، ئەوە یەکەم جار بوو کورد خەڵاتم بکات، بێ گومان دوا جاریشم بوو! هەر پاش خەڵاتەکەی کاك سامی عەبدولرەحمان، کاك عەلی سنجاری، ئەویش هەردووکمانی خەڵات کرد، بێ گومان ئەو خەڵاتکردنە لە بیرەوەریمدا یادەوەرییەکی زۆر تایبەتمەندە، هەستم دەکرد ئەوەی دەیکەین گرنگە.

* دەرئەنجام:-

لە کۆتایی ئەم باسەدا، هەوڵ دەدەم، وەکو دەرئەنجام، تایبەتمەندێتییەکانی تیپی شانۆی مەشخەڵی کەرکووك بخەمە ڕوو، کە بۆ شانۆی کوردی لە کات و سەردەمی خۆیدا دەستکەوتی نوێ بوون.

لە وتاری پێشوودا باسم لە تایبەتمەندێتیی شانۆیی کۆتایی دەرەبەگ کرد، کە چۆن شانۆی کوردی بۆ یەکەم جار لە ڕێگەی ئەم نمایشەوە بە ڕێبازی بریخت ئاشنا بوو.

تایبەتمەندێتییەکی دیکە بەشداریکردنی چالاکانەی ئافرەت بوو لە نمایشەکانی کەرکووك، دیارە پێشتریش ئاماژەم بەوە کرد، کە شانۆی کوردی لە کەرکووك ژمارەیەکی زۆر ئەکتەرانی ئافرەتی بەخۆوە بینی.

لێرەدا دەمەوێت باسی چەند تایبەتمەندێتییەکی دیکە بکەم، کە زیاتر لایەنی تەکنیك و ستایل و شێواز دەگرێتەوە، ئەو تەکنیکە و شێوازانە بۆ یەکەم جار لە کەرکووکەوە سەریان هەڵدا و پاشتر لە شانۆی کوردیدا دووبارە کرانەوە.

شانۆکارانی تیپی مەشخەڵ، کە پاشتر چوونە ناو کۆمەڵی هونەر و وێژەی کوردی، لقی کەرکووکەوە، کارەکانیان تەنیا لەناو بازنەی شانۆدا نەمایەوە، بگرە کاری درامای تەلەڤزیۆنیشیان ئەنجام دا.

گرنگترین چالاکیی شانۆیی شانۆکارانی کەرکووك لە کۆمەڵی هونەر و وێژەدا شانۆگەریی (تەقینەوە) بوو، کە لە نووسینی عەلی کەریم و دەرهێنانی سەلمان فایق بوو.

کۆمەڵ کە زۆرینەی ئەندامانی تیپە شانۆییەکەی لە هەمان ئەندامانی تیپی شانۆی مەشخەڵ پێکهاتبوو، بە شانۆیی تەقینەوە بەشداریی یەکەم فیستڤالی هونەری کوردییان کرد لە بەغدا. ئەم فیستیڤاڵە کە لە ساڵی ١٩٧٤ ڕێکخرا، یەکەم فیستیڤاڵی هونەر بوو بەو قەوارە گەورەیە کە هەموو لقەکانی هونەر، شانۆ و شێوەکاری و موزیکی گرتبێتەوە، فیستیڤاڵەکە لە کات و وەختێکی زۆر ناسکدا ساز کرا، پێش دەستپێکردنەوەی شەڕی نیوان ڕژێمی عێراق و شۆڕشی کوردستاندا، ڕۆژانی فیستیڤاڵەکە کەش و هەوایەکی دەروونیی ئاڵۆزی پڕ لە دڵەڕاوکێ لە ئارادا بوو، بەشدارانی فیستیڤاڵەکە بە ڕەواڵەت ئاهەنگیان دەگێڕا، بەڵام هۆش و بیریان لەلای چۆنییەتی هەڵهاتن و چوونەناو شۆڕش بوو، چونکە دەیانزانی حکوومەتی عێراق خۆی بۆ شەڕ ئامادە کردووە، سەرەڕای ئەوەش فیستیڤاڵەکە گرنگ بوو، ئەوەبوو لەم فیستیڤاڵدا تیپە سەرکییەکانی شانۆ لە سەرانسەری کوردستانەوە ئامادەی فیستیڤاڵەکە بوون، لەنزیکەوە ئاشنای یەکتر بوون و بەرهەمی یەکدییان بینی و توانای یەکتریان بۆ دەرکەوت. بەم شێوەیە شانۆکارانی کوردستان توانای شانۆکارانی کەرکووکیان بۆ دەرکەوت.

ئێوارەی کۆتایی فیستیڤاڵەکە، خەڵکێکی زۆر بووین لە پاسێکدا بەرەو هۆڵی فیستیڤاڵەکە دەڕۆیشتین، ئەو ئێوارەیە خەڵاتەکان دابەش دەکران، ئەو دەم هێشتا قوتابیی شانۆ بووم لە بەغدا، بیرمە ئەم پرسیارەم لێ کرا:

–بە مەزەندەی خۆت کام نمایش خەڵاتی یەکەم وەردەگرێت؟

گوتم: شانۆیی تەقینەوەی شاری کەرکووك.

گوتیان: ئەی نمایشەکانی دیکە؟

گوتم: تەماشای هەموو نمایشەکانی فیستەڤاڵەکەم کردووە، ئەگەر لیژنەی دادوەر پێشەمەند بن و بابەتیانە نمایشەکان هەڵبسەنگێنن، ئەوا هەموو خەڵاتەکان بەر نمایشەکەی کەرکووك دەکەوێت. تیپەکانی تر هیچیان بەر ناکەوێت!

دوو سەعات پاش ئەم گفتوگۆیە سەرپێییەی ناو پاسەکە، کە زۆربەمان بە پێوە وەستابووین، خەڵاتەکان بەم جۆرە ئاشکرا کران:

خەڵاتی باشترین نمایش بۆ شانۆیی تەقینەوە، کۆمەڵی هونەر و وێژە، کەرکووك.

خەڵاتی باشترین دەرهێنەر: بۆ سەلمان فایق، کەرکووك.

خەڵاتی باشترین نووسەری شانۆیی، عەلی کەریم، کەرکووك.

خەڵاتی باشترین ئەکتەر، عەلی کەریم، کەرکووك.

یەکەم جار بوو بەرهەمی شانۆیی شاری کەرکووك بچێتە ناو فیستیڤاڵێکەوە، یەکەم جار بوو لە پێشبڕکییەکدا توانای شانۆکارانی کەرکووك دەرکەوێت و بەڕاستی هەڵبسەنگێندرێت.

پێشتر لە یەکەم نمایشی تیپی مەشخەڵ لە شاری سلێمانی، لیژنەی خەڵاتی بابان بۆ باشترین ئەکتەری ساڵ، پێیی ڕاگەیاندین، کە ناوی منیان وەکوو باشترین ئەکتەری ساڵ، بۆ خەڵاتەکە دەستنیشان کردووە، بەڵام لیژنەکە دواتر پاشگەز بووەوە، بە بیانووی ئەوەی کە خەڵاتەکە تەنیا بۆ ئەکتەرانی سلێمانی تەرخان کراوە، بەم سنوور تەسکردنەوەی خەڵاتەکە، لیژنەکە لە پایە و قەوارەی خەڵاتەکەی کەم کردەوە، لە کوێ خەڵاتێك کوردستانی بێت، لە کوێ تەنیا لە سنووری شارێکدا بێت!

تەقینەوە یەکەم شانۆیی بوو بە شێوازی شانۆی دیکۆمێنتار ئەنجام درابێت. ئەم شێوازە بۆ شانۆی سیاسی بەکار دەهێنرێت، ئەو سەردەمە لە جیهاندا باو بوو، لە شەستەکاندا دزەی کردە ناو شانۆی عەرەبییەوە، بەڵام بەر لە شانۆکارانی کەرکووك لە شانۆی کوردیدا کەس پەی پێ نەبردبوو، پێم وایە لیژنەی دادوەری زیاتر سەرسامی ئەو تەکنیکە بوو کە بەکارهێنرابوو، چاوەڕوانی ئەوە نەبوون لە نمایشیکی کوردیدا فیلم و شانۆ بەو شێوەیە ئاوێتەی یەکدی بکرێن.

پاش تەقینەوە، شانۆکارانی کەرکووك ڕوویان لە درامای تەلەڤزیۆن کرد، ئەوەبوو درامای (مەرەزە)یان بۆ تەلەڤزیونی کەرکووك تۆمار کرد، کە بە یەکەم درامای کوردی دەژمێردرێت.

لە مەرەزەدا بۆ یەکەم جار کامێرا چووە دەرەوەی ستۆدیۆ و زۆربەی لۆکەیشنەکان لەدەرەوەی ستودیۆ تۆمار کران. بەر لە مەرەزە تەمسیلەکان لە شێوەی نمایشی شانۆیی بوون.

لە مەرەزەدا بۆ یەکەم جار درامایەك تۆمار کرا کە پشتی بە سیناریۆی تەلەڤزیۆنی دەبەست. بەم پێیە سەلمان فایق یەکەمین دەرهێنەری درامای تەلەڤزیۆنی کوردییە.

جەلیل زەنگنە، بەر لەوەی وەکوو دەرهێنەر ناوبانگ دەربکات و ببێت بە پێشەنگی درامای تەلەڤزیۆنی، وەك سیناریست کارامەیی خۆی لە ژاڵەدا سەلماند، ژاڵە یەکەم درامای کوردییە کە بەهرە و توانای سیناریستەکەی زاڵە بەسەر هەموو پێکهاتەکانی تری دراماکەدا.

شانۆی کوردی لە کەرکووك سەریهەڵ نەدا، بەڵام شانۆکارانی کەرکووك بەرەوپێشەوەیان برد، هەرچی درامای تەلەڤزیۆنی لە کەرکووك سەری هەڵدا، هەر هونەرمەندانی کەرکووکیش بەرەو پێشەوەیان برد، پاش مەرەزەی دەرهێنەر سەلمان فایق، باشترین دوو دەرهێنەری بواری دراما، جەلیل زەنگنە و حوسێن میسری، بە ئەزموونێکی قووڵتر درامای کوردیان دەوڵەمەند کرد، ئەزموونێك کە کاریگەرێتیی تەواوی بەسەر زۆربەی دراماکانی دیکەوە هەبوو. کاریگەرێتی و شوێندەستی هەردوو دەرهێنەر لە بواری درامادا دیارە، بە بۆچوونی خۆم، جەلیل زەنگنە ڕۆڵێکی کاریگەری هەبوو لەوەی بە هەموو شێواز و کەرەستەیەکی هونەرییەوە، بینەر بەرەو لای دراما رابکێشێت، حوسێن میسریش یەکەم خوڵقێنەری زنجیرەدرامای کۆمەڵایەتییە.

## بەشی سێیەم

# مێژووی سینەما لە کەرکوك

"سینەما واتە (وێنە بزوێنراوەکان)ە، چەند وێنەیەکی یەك لە دوای یەکی فۆتۆگرافیە، لەسەر شریتێك بەهۆی ڕووناکییەوە بە خێرایی لەسەر پەردە پیشان دەدرێت لەگەڵ دەنگدا، بەشێوەیەك چاو وا هەست دەکات کە لە جولانەوەیەکی بەردەوامدایە، سینەما هونەرێکی دەربڕینە لەگەڵ هەموو هونەرەکانی تردا هاوبەشە.

داهێنانی سینەما، بە پێچەوانەی هونەرەکانی ترەوە بوو، لە سەرەتادا پەیوەندی بە هونەرەوە نەبوو، بەڵکو بە ئامێرو زانستەکانەوە هەبوو، لە (چرای ئەفسووناوی – الفانوس السحري)یەوە بەرە بەرە پێشکەوت بە هۆی تیۆری (بەردەوامی بینینی بە گوێرەی شتە جوڵاوەکانەوە) کە (ڕۆجێت) لە ساڵی (١٨٢٤)دا بڵاویکردەوە.

زاناکان لەسەر بنچینەی ئەم تیۆرە، چەند ئامێرێکیان داهێناو بە یەکخستنی لەگەڵ چرای ئەفسووناویدا لە ساڵی (١٨٣٩)، (لویس داچیر)، ئامێری وێنەگرتنەوەی فۆتۆگرافی داهێنا، کە ڕێگای گەلێك ئاسان کرد، بۆ داهێنانی سینەمای ئێستا.

چرای ئەفسووناوی

لە ساڵی (١٨٥٩)دا زانای ئینگلیزی (تۆماس هۆمان دی مۆنت) کامێرای (زووترو بیکای) داهێنا، دەیتوانی کۆمەڵێك وێنە یەك لە دوای یەك بگرێت. ئەندازیاری ئەمریکیش (کۆڵمان سیلەرز) ئامێرێکی داهێنا بە ناوی (سینەما تۆسکۆپ) بەم شێوەیە ناوی سینەماو ووشەی سینەما بەدەرکەوت.

یەکەم کەس کە سینەمای کردە هونەرێکی سەربەخۆ هونەرمەند (جۆرج بیلبین) بوو، یەکەم پیشاندانی فیلمی سینەمایی لە (٢٢)ی شوباتی ساڵی (١٨٩٥)دا برایان (لومبید) پیشانیاندا، لە کۆمەڵەی هاندانی پیشەسازی نیشتمانیدا.

ئەو وێنانەی پیشان دەدرێت و تایبەتە بە فیلمی سینەما لەسەر شریتێکی (سلولوید) بە پانی (٣٥) ملیم یان (١٦) ملیم یان (٨) ملیم یان (٥) ملیمە.

فیلمی سینەمایی بەزۆر جۆر هەیە، وەك فیلمی درامی و کارتۆن و دەنگوباس، کە پێویستی بە کارێکی گران و نواندن هەیەو ئەکتەرو دەرهێنەرو بەرهەمهێنەرو وێنەگرو گەلێ لایەنی تر هاوبەشی تێدا دەکەن، گەلێ ئەکتەری جیهانی ناوبانگیان لە سینەمادا بەدەرکەوتووە وەکو: چارلی چاپلن و ماری بکفۆردو مارلین مۆنرۆو گەلێکی تر، هۆلیۆد لە ئەمەریکادا بۆتە مەڵبەندی پیشەسازی سینەما لە ئەمەریکادا، ئێستاش لە زۆربەی وولاتەکانی دوونیادا سینەما پیشەسازییەو هونەرێکی دیارو پێشکەوتووەو لە برەودایەو پیشەسازییەکی باشە بۆ ئەو وولاتانەی تێدا گەشە دەکات. سینەما یەکێکە لەو هونەرە گرنگانەی کە هاوشانی هونەرەکانی ترە لە شێوەکاری و شانۆو گۆرانی و مۆسیقاو خۆی لە خۆیدا تێکهەڵکیشی هەموو هونەرەکان لە بەرجەستەکردنی لە بۆتەی هونەری سینەماو فیلمی سینەمادا.

سینەماش وەکو هەموو هونەرەکانی تر خاوەنی

مێژوویەكی دوورو درێژە لە تێكۆشان و خزمەت كردنی مرۆڤایەتیدا، هاوشانی ئەو خەباتە فراوانەیە، توانییویەتی و بگاتە پێگەی خزمەت و لێكدانەوە لە ئەندێشەو كارەساتەكانی مرۆڤایەتی و ئاوێتەبوونی بە شێوەیەكی ڕاست و دروست لە پێگەیاندنی دەستەكانی تێگەیشتن لەمرۆڤ و كۆمەلگەو ژیان.

مێژووی سینەما هەر چەندە تازەیە لە چاو هونەرەكانی تردا، بەڵام هەردەم بە بڕشت و بە ئەزموونی ڕۆژگاری خۆی بووە لە خزمەت و تێكۆشانی جیهان و دەرخستنی موعاناتەكانی ژیان.

لە ئەوروپادا سەرەتای بیستەكان ماوەی گەشاوەی ئەو مێژووەیە كە توانییویەتی هاوشانی كارەساتی شەڕە جیهانیە گەورەكان وێنەو دۆكۆمێنتەكان ببێتە بناغەیەكی گەورەی ئەم هونەرەو دەوری سەرەكی خۆی ببینێت، سینەما لە ئەوروپادا بە گەلێك قۆناغی جۆراوجۆری مێژوودا هەنگاو بنێت و پێگە بە پێگە هەنگاوی ئەم هونەرە بەرەو پێش بچێت لە هونەری سینەمای بێ دەنگ و سینەمایی ڕەش و سپی و سینەمای ڕەنگاو ڕەنگ و سەرهەڵدانی هۆڵی جۆراجۆر لە ئاستی توانای بەهێزی هونەری سینەمادا.

خۆی لە خۆیدا سەرهەڵدانی سینەما پێویستی بە جێگاوڕێگای تایبەتی خۆی هەبوو بۆ نیشاندانی یان بە بارێكی تردا جێگای تایبەت دەوری هەیە لە گەشەكردنی سینەماو ڕاكێشانی خەڵك و دەوری خەڵك لە ئاپۆرە كردن لە دەوری سینەمادا هەنگاوی ناوە بۆ پێشكەوتنی ئەم هونەرە بەرزە"(١).

پەیوەندییەكی ڕاستەوخۆو بێ پێچ و پەنا لە نێوان گەشەی هونەری سینەماو تەنانەت ڤیلمسازی لەلایەك، لەگەڵ سالۆنی سینەمادا هەیە، واتا زۆر سادەو ئاسان دەبێ حەقیقەتی ئەم هاوكێشەیە قەبووڵ بكەین كە ئەگەر بمانەوێ هونەری سینەما وەك هونەرێك و كولتوورێك گەشە بكات دەبێ، لە سالۆنی سینەماش گەشە بدەین ئەم پەیوەندییە ڕاستەوخۆیە لە خاڵێ یەكەمدا دەگەڕێتەوە بۆ هەست ناسینی خوودی سینەما، واتە لە دایكبوونی فیلم و سینەماو بەردەوامی و گەشەكردنی، بەبێ لە بەرچاوگرتنی شوێنی نواندنی فیلم و ئامادەبوانی ناو ئەو شوێنە، واتا بینەرانی فیلم دەتوانن هەست بە جیاوازی بینینی فیلم بكەن لە ماڵەوە لەگەڵ فیلم لە هۆڵی سینەمادا.

بەڵام لە سینەمادا ڕووناكیی بە پرۆژێكتۆرو لە ئاپاراتوسەوەو لە پیتەوە دەدرێت لە پەردە، دانیشتنێكی جەمعییە لە شوێنێكی تاریكدا، فیلم لە فەزایەكی تایبەت و بەبێ ڕاوەستاندن نمایش دەكرێت.

هەموو ئەو تایبەتمەندییانەش لە موتاڵای فیلم و سینەمادا بیریان لێكراوەتەوەو لە زاراوە تایبەتییەكانی سینەماو بەشێكن لە پێناسەی سینەما، هەر بۆیە زۆرجار كاتێك دەوترێ فیلم دیتن، مەبەست دیتنە لەناو سالۆنی سینەمادا، هەر لێرەوە وەك وتراوە هەرگیز تەجروبەی سینەما ڕۆیشتن، بەرامبەر نییە لەگەڵ فیلم دیتن لە ماڵەوەدا.

تەنانەت هەندێ لەسەر ئەو بڕوایەن كە بە نیسبەتی وەرگرو بینەرەوە سینەما یانی بینینی فیلم لەسەر پەردەیەكی پانو پۆڕو سەیركردنی لە ژوورێكی تاریكدا بە ئامادەبوونی خەڵكێكی نەناسراو و زۆرەوە بۆیە دەتوانین بڵێین ئەگەر هۆڵی سینەما نەبێت مانای وایە نە فیلم و نە سینەما بە تەواوەتی جێ بە جێ ناكرێت.

لەو توێژینەوانەی وا لە سەر سینەما كراوە، بەشێكیان لەسەر بینەرو هەروەها سالۆنی سینەما ڕاوەستاون و هەندێكیشیان سەبارەت بەگەشەی سینەما ئایتیمێكمان بۆ بینەرانی سالۆنیش ڕەچاو كردووە.

سەرەڕای ئەوە بێگومان لای ئێمە بۆ تێگەیشتن لە دیدی گشتی سەبارەت بەسینەما شوێنناسی یان تۆپۆلۆژیی سالۆنی سینەماو دیاریكردنی گرووپی سینەماخوازو دەلیلەكانیان گرنگە، واتە ئەو كاتەی باس لە بینەر دەكرێت ئەبێ باس سالۆنی سینەماو دیدی بینەر بۆ سالۆن بكرێت.

سینەما ڕۆڵێكی گرنگی گێڕاوە لە پێشخستنی ئاستی ووشیاری و ڕۆشنبیری گەلان، سینەما مێژوویەكی زۆر كۆنی نییە بەتایبەتی لە وڵاتی ئێمەدا، چونكە لەبەر ئەوەی داگیركەرانی كوردستان كوردیان لە سینەما بێبەش كردووە، بۆیە تاكو ئێستاكەش ڕۆشنبیری سینەما ئاستی گرنگی پێویستی خۆی وەرنەگرتووە، هەر بۆیە دەبینین لە شارەكانی كوردستاندا وەكو پێویست ئەم هونەرە بەرزە گەشەی نەكردووە، بەڵام ئەگەر سەیری كەركوك بكەین لەچاو شارەكانی كوردستاندا پێشكەوتنی بەخۆیەوە بینیوەو تا ڕادەیەكی چاك پێشەنگی شارەكانی كوردستانە لەو بوارەدا، بەتایبەتی لەسەرهەڵدانی هۆڵی سینەماو سینەمای گەڕۆكدا، ئەویش خۆی دەبینێتەوە لەو توانایەی كە جولەكاكانی كەركوك پێشەنگی هێنانی سینەما بوونە بۆ ئەم شارە هەر لە ساڵی (١٩٢٧)وە، هەر لەسەر دەستی ئەوانیش بناغەی گەلێك هۆڵی سینەما لەم شارەدا بنیات نراوە وەك سینەمای وەتەن، غازی، دونیاو عەلەمین.

لەسەرەتادا ئینگلیزەكان وەك پێشەنگی هێنانی سینەما بۆ ئەم شارە هەستان بە هێنانی سینەمای گەڕۆك لەسەر ئۆتۆمبێل و گواستنەوەی بە گوندو شارو كۆمپانیای نەوتی كەركوكدا بەتایبەتی لەناو كۆمپانیای نەوتی كەركوكدا هەموو ڕۆژێك فیلمیك یان ئەو فیلمانە نمایش دەكرا كە گوزارشیان لە نەوت و پێشكەوتنە زانستیەكانی نەوت دەكرد بۆ ووشیاركردنەوەی كرێكارانی كۆمپانیای نەوتی كەركوك. بەڵام لەگەڵ پێشكەوتنەكانی ڕۆژگارو سەرهەڵدانی كۆمەڵێك سەرمایەدارو بازرگان بە تایبەتی بازرگانی جولەكە لە كەركوكدا دەوریان بینی لە دروستكردنی هۆڵی سینەماو هێنانی فیلمی جۆر بە جۆر بۆ نمایشكردن. تاكو ئێستاش خەڵكی كەركوك یادەوەرییەكانیان لەگەڵ سینەماو هۆڵەكانی سینەما ئاوێتە بوونێكی ئەبەدین كە لە ئاوەزی مرۆڤدا ناسڕێتەوە لەبەر ئەوەی یادگارێكی شیرین و خۆشی بەجێ هێشتووە بووەتە هێمای تەمەنی ئەو كەسانەی كە ژیانیان لەگەڵ سینەماو فیلمی سینەماو هۆڵەكانی سینەمادا بەسەر بردووە یان جۆری ئەو فیلمانەی كە لەو كاتدا بۆ نمایش كرد هێنراونەتە ئەم شارە ئەو ڕاستیە یەكلا دەبێتەوە كە تام و چێژەكانی سینەما چەندێك بەهێز بوونە لە یادەوەری

تاڵو ناخۆش کە تا سەردەمانێکی درەنگ ئەم شارە بیرەوەی خۆشەویستی بۆ سینەما دەگێڕێتەوە.

لێرەدا ئەوەی گرنگە بیڵێین لە سینەمادا لە کەرکوك ئاوێتەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و ڕۆشنبیری هەموو پێکهاتەو نەتەوەکانی ئەم شارە بووە، کە هەریەك لە هۆڵەکانی سینەمای ئەم شارە تایبەتی خۆی هەبوو بۆ هەریەکە لە چین‌و توێژێکی کۆمەڵایەتی‌و ڕۆشنبیری، ئەویش لە چوارچێوەی نمایشکردنی جۆری فیلم‌و ئاست‌و توانای ئەو فیلمە (نمایشکردنی لەو هۆڵانەدا یان بەواتایەکی تر ئاستی هونەری هەریەك لەو فیلمانە دەوریان بینیوە لە بەرجەستەکردنی ئاوەزی مرۆڤەکانی ئەم شارە، هەندێك لە خەڵکی ئەم شارە هەر لە منداڵییەوە ئالودەی بینینی سینەماو ئاشنابوونیان بە هۆڵەکانی سینەما خۆی لە خۆیدا کاریگەرییەکی گەورەی دروست کردووە بۆ ئەو کەسانەی کە ئارەزووی کۆکردنەوەی وێنەی فیلمەکان‌و ناوی فیلمەکان‌و ماوەو زمانی فیلمەکان‌و ئاستی ئەو فیلمە بووە بە هۆکاری سەرهەڵدانی کۆمەڵێ کەسی شارەزا لەو بوارەدا.

تایبەتمەندییەکی سینەماکانی کەرکوك لەوێدا خۆی دەبینێتەوە کە دوو جۆر سینەما هەبووە سینەمای هاوینەو سینەمای زستانە یا بەواتایەکی تر سینەمای سەرکراوەو سینەمای داخراو کە هەریەکەی تام‌و چێژێکی خۆی هەبووە لە ئاستی بیرکردنەوەی خەڵکەکان‌و سەیرکردنی سینەما لە هەوای پاك‌و خاوێندا.

پەیوەندی سینەما زۆر بەهێز بووە لە ئاستی نمایشکردنی ئەو جۆرە فیلمانە لە بۆنەو جەژنەکاندا یان لە وەرزەکانی زستان‌و پایزو هاویندا کە هەریەکەی بۆن‌و تایبەتی خۆی هەبووە کە یادەوەری‌و یادگاری جوانی لە ئاوەزی خەڵکی ئەم شارە جێ هێشتووە، لە هەمان کاتدا کارەساتە دڵتەزێنەکانی کەرکوکیش تا ماوەیەکی بەرچاو خەڵکیان دابڕیوە لە سینەماو خەڵکی تووشی شۆك کردووە.

تاکو بارو زروفەکە هێور نەبووەتەوە خەڵك بایەخی بە سینەما نەداوە، بۆ نموونە دەبینین لە هەندێ کاتدا بە تایبەتی لەسەردەمی ڕژێمی بەعسدا هەندێ جار هۆڵەکانی سینەما دەبووە شوێنی کۆبوونەوەی پیاوانی بەعس‌و ئاهەنگ گێڕان بۆ یادی لە دایك بوونی سەدام حوسێن‌و حیزبەکەی.

"هەر بۆیە دەبینین لە ساڵی (١٩٦٠)دا لەسەردەمی عەبدولکەریم قاسمدا هەستا بە قەدەغەکردنی نمایشی فیلمی میسری لە سینەماکانی عێراقدا ئەویش لەبەر ئەو بەربەرەکانیە سیاسیەی کە هەیبوو لە نێوان خۆی‌و عەبدولناسردا، هەر لەبەر ئەوەش بوو ماوەیەکی چاك ئەو فیلمانە لە کەرکوکدا نمایش نەدەکراو کاریگەرییەکی گەورەی دروستکرد لەسەر خێزانەکانی شاری کەرکوك، چونکە فیلمی میسری پێشوازییەکی زۆری لێدەکراو بینەرێکی زۆری هەبوو کە دەبووە هۆی ئەوەی چەند ڕۆژێك ئەو فیلمە نمایش بکرێ ئەویش لەبەر زۆری بینەرەکەی، هەر لەبەر ئەمەش بوو یەکەم فیلمی میسری لە دوای ڕووخانی ڕژێمەکەی عەبدولکەریم قاسم لە هۆڵی سینەما ئەتڵەس نمایش کرا بریتی بوو لە فیلمی (یوم من العمری) کە هەر یەکە لە ئەکتەری بە ناوبانگی میسری عەبدولحەلیم حافزو زوبەیدە سەروەت دەوری سەرەکیان تێدا دەبینی.

ئەوەی جێگەی سەرنج بوو لەو کاتەدا ئاپۆرەیەکی زۆری خەڵك پێشوازیان لەو فیلمە کردو چەند ڕۆژێك بەردەوام بوو، ئەوەبوو هەردوای ئەوەش فیلمی (یوم بلا غد)ە لە سینەما عەلەمین نمایش کرا کە هەریەك لە فەرید ئەترەش‌و مریەم فەخرەدین دەوریان تێدا بینی‌و دوای ماوەیەکی تریش لە سینەما خەیام فیلمی عەرەبی جۆراوجۆر نمایش کرا.

هەریەکە لە هۆڵەکانی سینەما لە کەرکوك، جۆرێکی تایبەتی هەڵدەبژاد بۆ نمایش کردنی لە هۆڵەکانی سینەما، حەمرا بەو بەناوبانگ بوو بە تایبەتی لە پەنجاکاندا، فیلمەکانی فەرید ئەترەشی نمایش دەکردو بەردەوام بوو لە نمایشی ئەو فیلمە کۆنانە تا شەستەکان هەروەها پێش نمایشی فیلمەکان‌و دوای فیلمەکان گۆرانی فەرید ئەترەشی لێ دەدا، بەتایبەتی گۆرانی (حبیبتی).

بەڵام سینەما عەلەمێن گۆرانی عەبەلوەهاب (خی.. خی) لێ دەدا کە تایبەت بوو بەو سینەمایەوە، لەپاڵ گۆرانی عەبدولحەلیم حافز بەناوی (فوق الشوك مشانی زمانی... قاللی تعال نروح للحب)، هەروەها سینەما عەلەمێن فیلمی بیانی‌و هیندی لێ دەدا، لەپاڵ ئەمەدا لە شەستەکان فیلمی عەرەبیشی لێ دەدا.

لە کاتی نمایش کردنی فیلمەکاندا خەڵکی ناو هۆڵەکە تووشی ناخۆشی‌و خۆشی دەبوون‌و تێکەڵ بە ڕووداوی فیلمەکە دەبوون‌و لە هەندێك باردا ڕووداوەکان خەڵکی دەهێنایە گریان‌و تا ماوەیەکی چاك تێکەڵ بە ئەندێشەی ڕووداوەکان دەبوون، لە ساڵی (١٩٢٣) یەکەم فیلم لە سینەماکانی کەرکوك نمایش کرا، لە ساڵی (١٩٢٧) یەکەم فیلم بەرهەم هێنرا لە سەر کەرکوك‌و بابە گوڕگوڕو هەڵقۆڵانی نەوت بوو. لە ساڵی (١٩٦٣) یەکەم فیلمی دووروودرێژی عێراقی لە کەرکوك وێنەی گیرا، فیلمی (ذکریات) بوو لە دەرهێنانی (نەعیم ئەلساڤ) بوو"[٢].

هۆڵی تەماشاکردنی فیلم سێ بەش بوو، بەشی یەکەم لە ڕیزی پێشەوە بوو ئەم بەشە لە شاشەکەوە نزیك بوو نرخی بلیتەکەی (٤٠) فلس بوو، بەشی دووەم کورسیەکانی جیاواز بوو نرخی بلیتی ئەم بەشە (٨٠) فلس بوو، بەشی سێیەم لۆجی خێزانی بوو بریتی بوو لە چوار بۆ شەش کورسی، جارێکیان لە نمایشی بەیانیاندا کە کاتژمێر ١٠,٣٠ (دەو نیو) بوو بۆ یەکی پاش نیوەڕۆ، کەسێك دەچێت بۆ سینەما خەیام، پاش ماوەیەك دانیشتن پێش نمایشکردنی فیلمەکە بۆ خواردنەوی ساردیی دەچێتە دەرەوە لەو کاتەدا نەفەرێکی تر بە ڕێککەوت دێتە جێگەکەی‌و دادەنیشێت، کاتێك کە دەگەڕێتەوە تەماشا دەکات کەسێك لە شوێنەکەی دانیشتووە پێی دەڵێ: ئەمە جێگەی منە هەڵسە، ئەویش دەڵێ: سینەماکە چۆڵە بۆ خۆت لە شوێنێکی تر دانیشە، ئیتر دەبێتە مشت‌و مڕیان‌و شەڕ دەقەومێ‌و ئەو ڕۆژە سینەما خەیام دادەخرێت‌و هیچ فیلمێك نمایش ناکرێت.

"لە ساڵانی پەنجاکان‌و شەستەکان‌و حەفتاکانی سەدەی

ڕابردوو لە كەركوكدا، سینەما شوێنێك بوو بۆ بەسەربردنی كاتێكی خۆش‌و دووركەوتنەوە لە تەنگ‌و چەڵەمەی ڕۆژانە كەخەڵكی روویان تێدەكرد، جگە لەوەش سینەما بەشێكی گرنگی ڕووناكبیریی گەلان بەرهەمدێنێت وڕۆڵی هەیە لە پەرەسەندن و پێشكەوتنی شارستانیەت وسیمایەكی دیار وگرنگی شارە.

لەسەردەمی عوسمانییەكاندا سینەما نەبوو، دوای داگیركردنی عیراق لەلایەن ئینگلیزەوە بەماوەیەكی كەم سینەما هاتە عیراقەوە، سەرەتا ئینگلیز سینەمای گەڕۆكیان بەگوندەكاندا دەگێڕا بەمەبەستی بڵاوكردنەوەی هۆشیاری تەندروستی، بەتایبەتی دژی نەخۆشی دیزانتری چونكە زۆر بڵاوبوو.

لە كەركوكدا سینەما چێژی تایبەتی خۆی هەبوو، هەر سینەمایەك تایبەتبوو بە نمایشكردنی جۆرێك لە فیلمی تایبەت بە خۆی، لە ساڵانی پەنجاكان فیلمەكانی تەڕەزان‌و عومەر شەریف‌و فاتن حەمامەو فەرید ئەترەش‌و شادییەو سامیە جەمال‌و مەحمود ملێجی‌و فەرید شەوقی باویانبوو، لە پاڵ ئەم فیلمانەدا تا سەرەتای ساڵانی حەفتاكان فیلمەكانی هەرقڵ‌و ماشستی‌و جۆلێنا جیماوو سۆفیا لۆرین‌و پرت لانگستەرو كاری پۆپەر نمایش دەكران.

لە كۆتایی ساڵانی شەستەكان‌و سەرەتای حەفتاكاندا شەپۆلێكی فیلمی كابۆی سینەماكانی كەركوكی گرتەوەو فیلمی (مەتلوب جۆنی تاكساس)و فیلمی (ودعا یا كەرەكاس) فیلمەكانی (فرانكۆ نیرۆو ئالان دیلۆن) بۆ ماوەیەكی دوورودرێژ شاشەی سینەماكانیان قۆرخكردبوو.

كەركوك چەندین سینەمای كۆن ونوێ وهاوینە وزستانەی تێدابوو (سینەما غازی، سینەما خەیام، سینەماعەلەمێن، سینەما حەمرا، سینەما سیندیباد، سینەما ئەتلەس، سینەما سەلاحەدین، لە یانەكانی فەرمانبەران، كرێكاران، فەرمانبەرانی كۆمپانیای نەوت، ئەندازیارانی كۆمپانیای نەوت، سینەمای هاوینە هەبوون، تەنانەت ڕۆژی تایبەتیش بۆخێزان تەرخانكرابوو"[٣].

"ڕێكلامی سینەماكان بریتیبوو لە عەربانەیەكی دەستی چوار تایەیی لەسەر تەختەیەك پۆستەری فیلمی نمایشكراو بەناو بازاڕدا دەگێڕدراو ڕیكلامی بۆ فیلمەكە دەكرد، پۆستەری ڕیكلامەكان وبلیتی سینەما لە چاپخانەی شارەوانی چاپ دەكران وبەپارەكەی شار پاك دەكرایەوە وباخچە دروستدەكرا، بە داخەوە ئێستا لە كەركوكدا تەنها سینەمایەكیش نەماوە"[٤].

"شێوازەكانی ڕیكلام كردن بەم جۆرە بوو: وێنەی فیلمەكەیان لەسەر تەختەیەك دادەناو دەیان نایە سەرشانیان‌و كۆڵان بە كۆڵان دەگەڕان‌و ڕیكلامیان بۆ دەكرد، هەموو ڕۆژێكیش لە كاتی تەواو بوونی دەوامی كۆمپانیای نەوت‌و سەربازگەی كەركوك دەچوونە سەر ڕێگای كۆمپانیاو سەربازگەكەو تابلۆیەكی گەورەی فیلمەكەو لەسەر عەرەبانەیەكی تایبەت دایاندەناو بە ئاوازێكی تایبەت باسیان لە چیرۆكی فیلمەكەو ناوی پاڵەوانەكان دەكرد، بەناو بانگترین كەسایەتییەكانی ڕیكلام كردن (دایی عیزەت)و (عەلی تەڕەزان) بوو"[٥].

ڕیكلامی فیلمی سینەماكان

*** بەشێك لە سینەماکانی کەرکوك:**

**- سینەما (غازی):**

لە تەك یان شوێنی بانکی رافیدەین بوو لە تەنیشت مزگەوتی حاجی عەبدولڕەزاق خاوەنەکەی کەسێکی جوولەکە بووە بەناوی (زۆرۆ) ناوی سینەماکەش هەر بە ناوی مەلیك غازییەوە بووە، لە ساڵی (١٩٥٨) ڕووخێنرا. لەبەردو گەچ دروست کرابوو، هەردوای سووتاندنی لە ساڵی (١٩٥٧) لەکاتی نمایشکردنی فیلمدا، کە بەشێك لە بینەری سینەماکە لە کاتی ڕووداوەکەدا سووتان لەگەڵ نەمانی ڕژێمی پاشایەتی ئەم سینەمایەش بەرەونەمان و ڕووخاندن ڕۆیی.

"خاوەنەکەی یەکێك بوو لە جوولەکە دەوڵەمەندەکانی کەرکوك و لە ساڵی (١٩٤٨) ئەویش وەکو زۆربەی جوولەکەکانی عێراق کەرکوکی جێهێشتووەو چووەتە فەلەستین، ئیدی وەزارەتی دارایی حکومەتی عێراق دەستی بەسەر سینەماکەدا گرت و بە کرێی دا، دوو برا بە ناوەکانی (تاهیر)و (تەیب) بە کرێیان گرت و تا ماوەیەکی چاك کاریان تێدا کرد"[٦].

زۆرتر فیلمەکانی لە لوبنانەوە دەهات و نمایش دەکرا، سپ تایتڵی فیلمەکانی (وەرگێرانی بۆ عەرەبی) لە لوبنانەوە دەهات کە لەلایەن ئەنیسی و عوبێدو خۆری.

"بەناوبانگترین فیلم کە لە سینەمای ناوبراو نمایش کرا فیلمی (کۆلۆمبس) بوو کە چەند مانگێك بەردەوام بوو، جارنێکیان وابزانم لە ساڵی (١٩٤٩) بوو فیلمێکیان نمایشکرد لە جۆری (تەکنیکەڵەر) کە ئێستا بە (3D) (سری دی) پێدەڵێن، هەر بینەرێك بچووبایە بۆ بینینی ئەو فیلمە لە دەرگای سینەماکە چاویلکەیەکی پلاستیکی ڕەنگاو ڕەنگیان دەدایە تاکو لە کاتی نمایشی فیلمەکە لە چاویان بکەن، پێیان دەگووت (قەوس موجەسەم) کە سەیری فیلمەکەت دەکرد وای نیشان دەدا کە ئەکتەرەکان بە ڕاستی لەبەردەمتدان، جگە لەم فیلمانە دەیان فیلمی عەرەبی (ئوم کەلسوم و محەمەد عەبدولوەهاب) چەندین هەفتە نمایشکرا"[٧].

لەبەر گرانی ئەو جۆرە فیلمانەو زیاد بوونی نرخی بلیتەکانی تەنها بۆ یەك جار ئەو فیلیمە موجەسەمانە هێنرایە سینەما غازی چونکە هەموو کەس نەدەچوو بۆ بینینی لەبەر گرانی نرخەکەی.

هەروەها ئەم سینەمایە بەناوبانگ بوو بە (سینەمای مەلیك غازی) لە پێش نمایشی فیلمەکاندا وێنەی (مەلیك غازی)و سەلامی پاشایەتی لێ دەدا.

سینەمای مەلیك غازی، ساڵی ١٩٤٥

ITMC

سینەمای مەلیك غازی

**- سینەما ( وەتەن ):**

زانیاریمان دەربارەی ئەم سینەمایە زۆر كەمەو زۆربەی ئەو كەسانەی كە بە بیریان دێت دەڵێن لە پێش سینەما غازییەوە هەبووە لە سییەكانی سەدەی ڕابردوو، هەندێك لەو باوەڕەدان كە سینەما (وەتەن) هەر سینەما غازی بووە كە لە دواییدا ناوەكەی گۆڕاوە بۆ سینەمای (مەلیك غازی) كە لە هەمان شوێن بووە.

**- سینەما ( عەلەمێن ):**

"ئەم سینەمایە لەسەر دەستی دوو كەسی جوولەكە بنیاتنراوە بەناوەكانی (عەبدوڵڵاو سەلیم)، لە پەنجاكانەوە تا ساڵی (٢٠٠١) بەردەوام بووە"[٨].

**- سینەما ( خەیام ):**

"ئەم سینەمایە لەلایەن (حاجی خورشید) لە بەرامبەر قەڵا بنیات نرا، ماوەی سی ساڵ خزمەتی كرد، لە پەنجاكاندا بنیاتنراوەو تا ساڵی (١٩٧٩- ١٩٨٠) بەردەوام بوو كە لە دوایدا لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە ڕووخێنرا"[٩].

"سینەما خەیام كەوتبووە دامێنی قەڵای كەركوكەوە، ئەم سینەمایەش ڕووخێندرا و ئێستا شوێنەكەی باخچەیە، زۆربەی كات فیلمەكانی هەرقڵو هیندی لە سینەما خەیام نمایش دەكران، لە كۆتایی ساڵانی شەستەكاندا فیلمی (ئەمیر ئەرسەلانو ڕۆستەمو زۆرابو حوسێن كورد، پڕبینەرترین فیلمەكان بوونو خەڵكێكی بێشوومار بۆ تەماشاكردنیان دەچوون بۆ سینەما خەیام بە تایبەت فیلمی (حوسێن كورد)

کە خەڵك باسیان دەکرد، حەوت سەروو پێی دەخوارد.

لە جەژنەکاندا سینەما خەیام قەرەباڵغترین سینەما بوو، چونکە گەورەترین سەیرانگەنش لە کەرکوك بەرامبەر سینەما خەیام بوو، لەجەژنەکان سەیرانگەی بەرامبەر سینەما خەیام هەموو جۆرە یارییەکی لێبوو (چەرخ وفەلەك، جۆلانە، یانەسیب، ئەسپ سواری وپاسکیل سواری، شایی و هەڵپەرکێ و دەهۆڵ و زوڕنا) زۆرێکی خەڵکی کەرکوك، خێزانەکان، گەورەو بچووك، روویان لە سەیرانگەکەی بەرامبەر سینەما خەیام دەکردو بۆ تەماشا کردنی فیلمیش دەچوونە سینەما خەیام. هاتنی فیلمی (ابي فوق الشجرة) ی عەبدولحەلیم حافز، حەشاماتی لە کەرکوك دروستکرد، تادەگەیشتیتە پەنجەرەی بلیت بڕینەکە جل لەبەرتدا نەدەما، ڕۆژ نەبوو لە بلیت بڕیندا شەڕ دروست نەبێت، ژنان و کچان لە پیاوان بەپەرۆشتربوون بۆ بینینی فیلمەکە، وەرز وەرزی عەبدولحەلیم وفیلمی (ئەبی فوق ئەلشەجەرە) بوو، ڕێژەیەکی زۆری کچانی کەرکوك شەیدای عەبدولحەلیم بوون"[10].

سینەما خەیام

- **سینەما ( نجوم ):**

"لە گەڕەکی ئەحمەد ئاغا بنیات نراوە بەرامبەر چاپخانەی (ئەحمەد ئاغا)، لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا هەبوو، ئێستا شوێنەکەی گەراجی ئۆتۆمبیلە، خاوەنەکەی کەسێکی مەسیحی بوو، ئەم سینەمایە تەنها هاوینان هەبوو، زۆری فیلمی عەرەبی نمایش دەکرد بە تایبەتی فیلمی عەرەبی میسری وەکو فیلمەکانی (فەرید ئەترەش)"[11].

- **سینەما ( دونیا ):**

"لە تەنیشت سینەما عەلەمێنەوە بنیاتنراوە کە لە شوێنی دادگا ئێستا بووە، ئەم سینەمایەش لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا دامەزراوەو سینەمایەکی هاوینە بوو زۆری فیلمەکانی ئەکشنی نمایش دەکردو تا شەستەکانی سەدەی ڕابردوو بەردەوام بوو"[12].

- **سینەما ( ئەجاح ):**

زانیاریمان دەربارەی ئەم سینەمایە نییەو شوێنی سینەماکەش نازانرێت، بەڵام لەوانەیە لەو سینەمایانە بوو بێت کە لە هاوینان نمایشکرد کردووە.

- **سینەما ( حەمرا ):**

"لە سەرەتای ساڵی (١٩٤٠) بنیاتنراوەو تا (٢٨)ی ئاداری ساڵی (٢٠٠٢) داخرا، ئەم سینەمایە لە شەقامێك بوو کە ناوەکەی لە کاروبارە فەرمییەکاندا ناوی (بابا گوڕگوڕ) بوو، بەڵام ناوی ئەم سینەمایە زاڵ بووە سەر ناوی شەقامەکە کە ناسرا بە ناوی شەقامی (حەمرا)، ماوەیەکیش ناوی سینەماکە گۆڕدرا بۆ (ئەلزهور).

لە سەرەتادا خاوەنەکەی کەسێکی جوولەکە بوو، بەڵام لە کۆتایی چلەکاندا کاتێك عێراقیان بەجێهێشت ئەم سینەمایە ئافرەتێکی ئەرمەنی کڕی، بەڵام لە دواییدا یەکێکی تر لەم ئافرەتەی کڕییەوە.

زۆربەی فیلمەکانی ئەم سینەمایە بریتی بوو لە فیلمە بەناوبانگەکانی عەرەبی و ئەمریکی و ئەورووپی، بە تایبەتی ئەو فیلمانەی کە ناوبانگێکی گەورەیان هەبوو لە ئەورووپا و ئەمریکادا بە تایبەتی ئەکتەرە بە ناوبانگەکانی ئەو سەردەمە، بەڵام لە ئێستادا ئەم سینەمایە بۆتە شوێنی وەستانی ئۆتۆمبیل و ئەو بنەما جوانەی خۆی لە دەستداوە.

لە ڕووی بیناکاریشەوە گەلێك تەرزی کۆڵەکەو نەخشی گەچی تێدا بوو لەسەر ڕووی سینەماکەو هۆڵەکەی ناوەوەی کە تاکو ئێستاکەش بەشێکی کەمی ماوە"[13].

سینەما حەمرا

**- سینەما (ئەتڵەس):**

سینەما ئەتڵەس هێمای شەقامی ئەتڵەس بوو، هەر ناوی شەقامی ئەتڵەسیش لە ناوی سینەما ئەتڵەسەوە هاتبوو.

سینەما ئەتڵەس، سینەمایەکی کۆن بوو، هەر بە تەنیشتیەوە سینەما ئەتڵەسی هاوینەش هەبوو، خاوەنی سینەما ئەتڵەس دوو برا بوون بە ناوی (تەیب)و (تاهیر) لە دوای ڕووخانی سینەما (غازی)یەوە ئەم سینەمایەیان دروست کرد، بە تەنیشت سینەما ئەتڵەسەوە ستۆدیۆ ڕافدین هەبوو، وێنەکانی وێنەی یەکجار جوان و نایاب بوو.

"سینەما ئەتڵەس تایبەتمەندییەکی هەبوو لە سینەماکانی تردا نەبوو، ئەویش ئەوەبوو لە حانوتەکەیدا بەرگی پاکەتی زۆربەی جگەرەکانی دنیای تێدا بوو، لە جگەرەی عێراق (غازی، تورکی، لۆکس، جمهوری، بابل، بەغدا، سەلاحەدین)، پۆرسەعید، ڕیم، غەمدان، مەئرەب، کیلۆپاترا، گرێڤن، ڕۆسمەن، دیمۆری، دانهل)و دەیان جۆری تر کە لە جیاتی پاکەت لە قوتوودا بوون ئەوانەی دەچوون بۆ سینەما پێش چوونە ژوورەوە ماوەیەکی باش تەماشای ئەو پاکەتانەیان دەکردو بە شێوەیکی جوان ڕیزبەندی کرابوو"[١٤].

**- سینەما (سیندباد):**

ئەم سینەمایە بەرامبەر سینەما ئەتڵەس بوو لە شەقامی ئەتڵەس لە تەنیشت بانکی کشتوکاڵی ئێستا، بەڵام شوێنەکەی نەماوەو ڕووخێنراوە، سینەمایەکی هاوینە بوو تەنها هاوینان نمایشی فیلمی دەکرد.

سینەما ئەتلەس

*** سینەما (سەلاحەددین):**

"لە ساڵی (١٩٦٧) ئەم سینەمایە دروست کراوە، لەسەر شەقامی کۆماری، سینەما سەلاحەددین بە شێوازێکی مۆدێرن دروستکرابوو، لۆجی تایبەت (شوێنی تایبەت) تەرخانکرابوو بۆ خێزانە کەرکوکییکان، چونکە لە سەرەتای سینەماوە خێزانەکان دەچوون بۆ سینەما بە تایبەتی فیلمە عەرەبی و هیندو کۆمەڵایەتییەکان.

یەکەم فیلم کە تێیدا نمایش کرا فیلمی (جانواری شامی کابوور) بوو کە بۆ ماوەی یەك هەفتە بە خۆڕایی نمایشکرا، خواردنی نیو لەفەی ڕۆست لای عەباس و عارەبانەکەی کە لەگەڵ سینەما سەلاحەددیندا بووبوونە دووانەی شەقامی کۆماری، هەر کاتێك ناوی سینەما سەلاحەدین بهاتایە، بە دوایدا ناوی سەندەویچەکەی عەباس دەهات"[١٥].

*** سینەما (نەسر):**

ئەم سینەمایە لە تەك سینەما (سیندباد)ەوە بوو لە تەنیشت یانەی (غازی) جاران، سینەمایەکی هاوینە بوو تەنها یەك ساڵ ئیشی کرد لە نێوان ساڵانی (١٩٦٦ - ١٩٦٧).

*** سینەمای (قەڵا):**

ئەم سینەمایە نوێترین سینەمای کەرکوکە، کە لە (٦)ی نیسانی ساڵی (٢٠٠٠) دروست کراوە، وەکو بیناو شوێنی سینەماکە بەردەوامە بەڵام نمایشکردنی فیلمو نەبوونی بینەر هۆڵی ئەم سینەمایە بەکاردەهێنرێت لە ئاهەنگی بووكو زاواو کۆبوونەوو نمایشی شانۆگەری.

سینەما سەلاحەددین

*** سینەمای هاوینە:**

ئەوەی بەرچاو دەکەوێت لە سینەماکانی کەرکوکدا بوونی سینەمای هاوینەی کراوە لە تەك سینەما داخراوەکەدا، بۆیە زۆربەی سینەماکانی کەرکوك ئەو تایبەتمەندییەی خۆیان هەبوو وەکو سینەما (حەمرا، ئەتلەس، خەیام، نجوم، زهور)، خۆشی سینەما هاوینە لەوەدا بوو کە لە کەشێکی ڕۆمانسی و لە ئاوو هەوایەکی فێنکدا سەیری فیلمەکان دەکراو هەستت بە خۆشیەکی جیاواز دەکرد، بەڵام لە ئێستادا هەموو سینەما هاوینەکان کراوە بە شوێنی وەستانی ئۆتۆمبیل.

سینەمای هاوینە

*** هۆکارەکانی نەمانی سینەما لە کەرکوك:**

زۆربەی شارەکانی عێراق بە گشتی و کەرکوك بە تایبەتی تووشی قەیرانی نەمانی سینەما بوونەوە کە خۆی دەبینێتەوە لە چەند هۆکارێکی لاوەکی و بنەڕەتی کە دەوریان هەبووە لە هەرەس هێنانی بنەماکانی سینەما لە عێراق:

١. هۆکاری ئەمنی و نەبوونی بارێکی ئاسوودە لە عێراقدا هۆکارێکی گرنگ بوو بۆ چۆڵبوونی هۆڵەکانی سینەما، دوو شەڕی گەورە بەسەر عێراقدا هات وەکو شەڕی (عێراق – ئێران)، (عێراق – کوێت) بوو بە هۆکارێکی گرنگ لە تێکچوونی باری ئەمنی و ئاسایشی ناوچەکان.

شارێکی وەکو کەرکوك لە ماوەی هەشتاکان تا پرۆسەی ئازادی عێراق حکومەت بە چڕی کەوتە جێبەجێ کردنی سیاسەتی تەعریب و ڕاگواستن و سووتان ئەمیش هۆکارێکی گرنگ بۆ لێکهەڵوەشانەوەی باری ئەمنی پارێزگاکە و بایەخ نەدانی خەڵکەکە بە هۆڵی سینەما، هێنانی خەڵکێکی زۆر لە دەرەوەی شارەکە و ئاشنا نەبوونیان بە هۆڵەکانی سینەما ئەوەندەی تر باری ئەمنی هۆڵەکانی سینەما تێکدا.

هەروەها بوونی چاودێری لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە لە نێو هۆڵەکانی سینەما دەورێکی گرنگی هەبوو لە تێکچوونی باری ئەمنی نێو هۆڵەکانی سینەما و ترسی خەڵك لە گرتنی ناوەخت و کتوپڕ.

"هەروا لە ماوەی دە دوازدە ساڵی شەڕی عێراق لەگەڵ دراوسێکانیدا، لەشکرێك لە ڕاکردوانی شەڕ دروست بوو، هۆڵەکانی سینەما جێگایەکی لەبار بوو بۆ بەشێك لەو لاوە ڕاکردوانە، تا کاتی تێدا بەسەربەرن و سوودو چێژ لە فیلم و هۆڵی سینەما ببینن، تا سەر ئەوەیان بۆ مەیسەر نەبوو، چونکە جارجارە لەلایەن هێزەکانی ئەمن و ئینزیبات و مەفرەزە هاوبەشەکانی ڕژێمی ڕووخاوەوە سینەماکان دەکەوتنە بەر شاڵاوی پشکنین و پرسیارەوە، ئەوەش هۆکارێکە کە وایکرد لاوەکان لە سینەما دوو بکەونەوە و هۆڵەکانی سینەما چۆڵ بن و پەنجەرەکانی فرۆشتنی بلیت بازاڕیان نەمێنێ"[١٦]. لە

هەندێك باردا لە کاتی نمایش کردنی فیلمەکان دەستیان دەکرد بە پشکنین و گرتنی خەڵکی.

٢. کەمی بینەر بۆ هۆڵەکانی سینەما یەکێکە لەو هۆکارە لاوەکییانەی نەمای سینەما، ئەویش بە هۆی قاڵبوونی خەڵکەکە بە کاری سەربازی و دەربەدەری و ئەوانەی کە ئاشنای سینەما بوون چوونە دەرەوە یان لە بەرەکانی جەنگدا کوژران.

٣. ڕاوەستانی هاوردەکردنی فیلمە بیانییەکان و گران بوونی ئەو فیلمانە، لە هەندێك جاردا ئەو فیلمانە لە کۆمپانیاکانی بەغداوە دەهێنرا نەدەتوانرا پارەی کرێکەی دەرکات لەبەر ئەوەی داهاتێکی ئەوتۆی نەدەگەڕانەوە بۆ سینەماکان، چونکە ئاستی ئەو فیلمانەی کە لە کۆمپانییەکانی عێراق دەکرا لە ئاستی پێویستدا نەبوون، بە هۆی ئەو پێشکەوتنانەی لە بواری سینەمادا لە وڵاتەکانی ئەورووپا و ئەمریکادا بە دەست هات، لە پاڵ نەهێنانی ئەو فیلمانەدا کاریگەری گەورەی دروست کرد لە چۆڵ بوونی هۆڵەکانی سینەما، چونکە ئەو بینەرەی جارانی سینەما تینووی فیلمە نوێیەکان بوون کە لە ئاستی جیهاندا ناوبانگیان هەبوو.

لە پاڵ تایبەتمەندی شاری کەرکوك بەوەی کە لە پرۆسەی تەعریبکردندا بوو بۆیە حکومەت سیاسەتی عێراق وای دەخواست کە هەندێك لەو فیلمانە لە نێو پارێزگاکە نمایش نەکرێت کە لە پارێزگاکانی تردا ئاسایی بوو بە تایبەتی ئەو فیلمانەی باسی لە خەبات و تێکۆشانی گەلان دەکرد، یان ئەو فیلمانەی باسی میللەت و وڵاتە چەوساوەکانی دەکرد، ئەمە هۆکارێك بوو کە بینەر نامۆ بێت بە هۆڵەکانی سینەما.

٤. لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە جاران سینەما پێگەیەکی گرنگی هەبوو کە شوێنی خێزانە جۆراوجۆرەکانی کەرکوك بوو، لۆجی تایبەتییان هەبوو کە خێزانەکان بۆی دەهاتن، بەڵام لە کۆتایی حەفتاکان هێنانی ئەو لێشاوە زۆرەی عەرەب لە خواروو ناوەڕاستی عێراقەوە هۆکارێکی گرنگ بوو بۆ داڕووخانی ئەو پەیوەندییە کۆمەڵاتیانەی کە خێزان هەیان بوو بۆ سەیر کردنی سینەما و سەردانی هۆڵەکانی سینەما.

جاران سینەما کەشێکی ئارام و بەرچاوی هەبوو کە هەموو چینەکانی کۆمەڵگەی کەرکوك بەرێزەوە سەیریان دەکرد، بەڵام لەگەڵ تێکەڵبوونی کۆمەڵگەی نامۆ بۆ شارەکە دەوری بینی لە نامۆبوونی هۆڵەکانی سینەما.

٥. بەکارهێنانی توندوتیژی و سیاسەتی تەعریب بەرامبەر خاوەن سینەماکان هۆکارێکی لاوەکی بوو کە بەشێك لە خاوەن سینەماکان دەستبەرداری سینەماکانیان بن، هەر وەکو ئەوەی ڕژێمی بەعس هەستا بە ڕووخاندنی سینەما (خەیام) بە گەلێك هۆکاری نابەجێ لەبەر ئەوەی ئەو سینەمایە لە ناوچەیەکی گرنگی کوردەواری بوو لە هەمان کاتدا نزیك بوو لە شوێنی دامودەزگاکانی بەعس و ئەمندا.

٦. سەرهەڵدانی تەکنەلۆجیای تازە لە بوارەکانی کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت و سی دی و دی ڤی دی و سەتەلایت بوو بە هۆکارێکی گرنگ بۆ سەیری کردنی فیلمەکانی سینەما لە ماڵەوە و نەڕۆیشتنی بۆ هۆڵەکانی سینەما، لە هەمان کاتدا خۆ ڕزگارکردن لەو بارە ناجێگیرەی هۆڵەکانی سینەما دەوری گرنگی بینی لە بەجێهێشتنی بینەر لە سینەما لە کەرکوك.

٧. نەبوونی هۆکارەکانی فێنککەرەوە و گەرمکەرەوە لە هۆڵەکانی سینەما لە کەرکوك هۆکارێکی گرنگ بوو بۆ وازهێنانی خەڵکی لە سینەما، چونکە لە پاڵ ئەو شەڕە گەورەیەی کە بەسەر عێراقدا هات بوو بە هۆکاری تێکچوونی ژینگە و ئاوو هەواکەی، ئەمە لەگەڵ خۆیدا بوو بە هۆی نەبوونی پێویستییەکانی سەردەم لە نێو هۆڵەکانی سینەمادا، لە هەمان کاتدا کۆنی هۆڵەکان دەوری بینی لە تۆرانی بینەر لە سینەمادا.

٨. تێکچوونی چینەکانی بینەر لە سینەما لە کەرکوك، چونکە لە ڕابردوودا بەشێکی گەورەی خەڵکی کەرکوك ئالودەی سینەما بوون بە هۆی ئەوەی کە سینەما هۆکارێکە بۆ ئارامی مێشك، دەروون، بە تایبەتی چینی فەرمانبەران و مامۆستا و نووسەر و کرێکارانی کۆمپانیای نەوتی کەرکوك.

بەڵام بە هۆی تێکچوونی شیرازەی چینەکانی پێکهاتە ئایینی و کۆمەڵایەتییەکانی کەرکوك هۆکار بوو بۆ نەبوونی یان دروستی ڕۆیشتن بۆ سینەما، چونکە هەندێك لە ڕووداوانەی کە لەم دواییەدا ڕوویاندا بوونە هۆی لێکترازانی شیرازەی پێکهاتەکانی کۆمەڵگەی کەرکوك بە هەموو چینەکانەوە.

٩. بەکارهێنانی هۆڵەکانی سینەما لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە بۆ بەسەربردنی ئاهەنگە نیشتمانییەکانی خۆی یان ڕاگرتنی ئەو سینەمایە بۆ چەند هەفتەیەك لەلایەن ڕژێمەوە هۆکارێك بوو بۆ چۆڵبوونی هۆڵەکانی سینەما، لە هەمان کاتدا بێزاربوونی خاوەن هۆڵەکانی لە بەرامبەر نەدانی کرێی ئەو ماوەیەی کە بەکاردەهێنرا بۆ پێویستییەکانی خۆیان، ئەمەش کاریگەری بەجێهێشت لە ڕووی داراییەوە، یان لە هەندێك باردا ئەو فیلمانەیان نمایش دەکرد کە تایبەت بوو بە تاوانەکانی ڕژێمی بەعس بۆ کاربەدەستانی خۆی تا بۆ ئەوەی چاوترسێن بکرێن، ئەمەش ڕەنگدانەوەی خراپی دروست دەکرد لە پێناو تۆرانی هۆڵەکانی سینەما لەلایەن بینەران.

١٠. زمانی وەرگێڕانی فیلمەکان جاران لە لوبنانەوە دەهێنرا، بەڵام ڕژێمی بەعس هەستا بە دەستکاری وەرگێڕانەکان یان قرتاندنی بەشێکی زۆر لە دیالۆگی فیلمەکان، ئەمیش کاریگەری دروست دەکرد لەسەر ئاستی فیلمەکە و خەڵکەکەی بێزار دەکرد لە ناوەڕۆکی فیلمەکە، یان هەندێك جار فیلمەکان بە جۆرێکی دروست وەرنەگێڕدران.

١١. زۆری هۆڵەکانی سینەما لەلایەن کەرتی تایبەتەوە بەڕێوەدەبرا ئەمەش هۆکار بوو بۆ ئەوەی پارەدارەکان بیر لە پرۆژەی بازرگانی تر بکەنەوە کە داهاتێکی زۆری لێ دەست بکەوێت، بە شێوەیەکی ئەوتۆ کە دەست بەرداری سینەماکان ببێت، هەر وەکو ئەوەی دیمان لە ڕووخاندنی سینەما (عەلەمێن) یان گۆڕینی بۆ شوێنی وەستانی ئۆتۆمبیل یان چێشتخانەی وەکو سینەما (ئەتلەس) کە داهاتێکی زۆری هەیە.

١٢. "بەڵام لە هەموو هۆکارەکان کاریگەرتر دیارە ئەو ئابلۆقە ئابوورییە بوو کە بەسەر عێراق داسەپاو کوردستانیش

لە زیانەکانی بێبەش نەبوو، تابلۆقەکە کەرتی بازرگانی هێنان و دابەشکردنی فیلمی سینەماشی گرتەوە، تا کار بەوە گەیشت فیلمی ڤیدیۆیی لە ڕێگای ئامێری (پرۆجکتۆر) ەوە لە سینەماکان پیشان بدرێت، ئەوەش تەواو لە بەهاو هێزی هونەری حەوتەمی کەمکردەوە، چونکە بەهای فیلمی سینەما جگە لە تاریکی هۆڵ و جووڵەی تیشکەکان، بەشێکی زۆریشی بۆ کوالیتی و جوانی ئەو دیمەنانە دەگەڕێتەوە، کە لە فیلمی (٣٥ ملم) بەرجەستە دەبن"[١٧].

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:


١. (ئینسایکلۆپیدیای گشتی)، یاسین سابیر سالح، دەزگای چاپ و پەخشی (سەردەم)، چاپی یەکەم، ٢٠٠٥، لاپەڕە (٦٤٠ – ٦٤١).

٢. (سینمات کرکوك وایام المتعة في الظلام)، نەسرەت مەردان، سایتی ئەنتەرنێت.

٣. (جارانی کەرکوك، گەشتێك بەناو گەڕەك و شەقامەکانی کەرکوکدا)، زاهیر شکور، بەرگی یەکەم، ٢٠١٣، لاپەڕە (٢٥٥ – ٢٥٦).

٤. (جارانی کەرکوك)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٥٩).

٥. (٦٤ ساڵ لەمەوبەر فیلمی سینەمای 3D لە کەرکوك نمایشکراوە)، عەبدولستار جەباری، سایتی ئەنتەرنێت.

٦. (٦٤ ساڵ لەمەوبەر فیلمی..)، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٧. (٦٤ ساڵ لەمەوبەر فیلمی..)، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٨. گۆڤاری (ئیسرائیل – کورد)، ژمارە (٢٢)، ساڵی ٢٠١١، لاپەڕە (١٨)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (کەرکوك و قودس.. دوو شار لە ئاوێنەیەکدا).

٩. گۆڤاری (ئیسرائیل – کورد)، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١٠. (جارانی کەرکوك)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٥٧ – ٢٥٨).

١١. چاوپێکەوتن لەگەڵ (سەباح بازرگان).

١٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١٣. (سینما الحمراء، زاویة حسنة الانوار في ذاکرة کرکوك)، فاروق مستەفا، سایتی ئەنتەرنێت.

١٤. (جارانی کەرکوك)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٥١).

١٥. (جارانی کەرکوك)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٥٦ – ٢٥٧).

١٦ گۆڤاری (فیلم)، ژمارە (١)، ساڵی (٢٠٠٩)، لاپەڕە (٣٣)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (سینەمای کوردی و گرفتی شوناس)، نووسینی: حەسەن جوودی.

١٧. گۆڤاری (فیلم)، هەمان سەرچاوەو پێشوو.

## بەشی چوارەم

# مێژووی هونەری شێوەکاری لە کەرکوك

نووسینی: سمکۆ بەهرۆز
وەهبی ڕەسووڵ
تاریق کارێزی
پێداچوونەوەو پێشەکی: بەختیار سەعید

### پێشەکی..
### ئینسایکلۆپیدیایەك بۆ کەرکوك

دیارە یەکێك لە سیماکانی هەموو شارو وولاتێك کە گرنگی پێدەدرێت و دەکرێتە پرۆژەیەکی گەورەو فراوان و بودجەی تایبەتی بۆ تەرخان دەکرێت و تەنانەت ستافێکی گەورە کاری بۆ دەکەن و سالآنەش ئەو زانیارییانە گەشەی پێدەرێت کە ئەویش دروستکردن و ئەنجامدانی ئینسایکلۆپیدیای ئەو شارو وولاتەیە کە نەك بۆ ئەو شارو وولاتە، بەلکو بۆ هەموو دنیا دەبێتە جێگەی سەرنج و وەرگرتنی زانیاری و ئاشناکردنی ئەو شارو وولاتە بەهاووڵاتیانی وولات و شارەکە لە قۆناغی یەکەمدا، دواتریش بۆ هەموو جیهان.

بەدڵنیایی ئەو تایبەتمەندییە لە خۆرهەلات و بەتایبەتی لە باشووری کوردستان کەمتر بیر لەوە کراوەتەوە کە کارێکی لەو جۆرە ئەنجام درابێت کە ئەوەش هەولەکان کەم و دیاریکراوو بوون، هەر بۆیە هەرکارێك لەم جۆرە جێگەی ستایش و خۆشحاڵییە کە سەرەتایەکە بۆ دۆکیۆمێنتکردن و ئاشناکردنی شارێك کە جێگەی شانازی هەموومانە کە شاری کەرکوکی کوردانە.

هونەری شێوەکاری لەم شارەدا دەکرێت لەو ڕووەوە باسی لێوە بکەین کە شارێکی نەتەوە جیاوازەو زۆربەی چالاکی و کارەکانی هونەر لەم شارەدا بەهاوبەشی لەنێوان نەتەوە جیاوازەکانی (کورد، عەرەب، تورکمان) ئەنجامدراوە، بەلآم ئەوە ناکاتە ئەوەی کە تایبەتمەندییەتی هونەری شێوەکاری کوردی لەم شارەدا بەدەر نەکەوێت و میللەتەکەمان شانازی پێوە بکەین، هەر بۆیە سەرەتاکانی کاری هونەری شێوەکاری لە شاری کەرکوك بۆ سەرەتاکانی ساڵی ١٩٣٤ دەگەڕێتەوە کە شێوەکاری کورد (عەزیز سەلیم) پیشانگەیەکی کردووەتەوەو تابلۆکانی لەلایەن کرێکاران و فەرمانبەرانی کۆمپانیای نەوتی کەرکوکەوە کڕدراوە، بەلآم دەکرێت یەکێك لەو هۆکارانەی کە هونەرو ئەدەبی شاری کەرکوکی تیا کۆکراوەتەوە دروستبوون و دامەزراندنی کۆمەڵەی هونەرمەندانی کەرکوك بووە لە ساڵی (١٩٥٣) کە ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیە لە هونەرمەندان و ئەدیبانی ئەو شارە پێکهاتبوو کە هۆکارێکی گرنگ و بەرچاویان هەبوو بۆ چالاکی و کاری ناوازەی هونەری و ئەدەبی لەم شارەدا.

ئەگەر لێرەدا بتوانین تایبەتمەندییەتی کاری نیگارکێشی شێوەکارانی شاری کەرکوك بناسینەوە ئەوە تەنها لەڕێگای ئەو ڕەنگە گەرمانەوە دەیناسینەوە کە شێوەکارانە لە هەلقولاوی ئەو ژینگە گەرمەی کە تیایدا دەژین کە ئەویش ڕەنگی قاوەییەو زۆرکات زۆربەی پانتایی تابلۆکانی داپۆشیووە، هەروەها جۆری فیگەرو هێڵەکانیش بۆخۆیان هۆکارێکی ترن بۆ ناسینەوەی نیگاری شێوەکارانی شاری کەرکوك، لە هەمان کاتدا تەعبیری ئەو شێوازی کارکردنە بووە کە زۆرترین کاری پێکراوە بەهۆی ئەو کەشە سیاسییەی کە شارەکە تووشی هاتووە.

ئەگەر هونەری شێوەکاری لە شاری کەرکوك بکەینە دوو قۆناغەوە یەکەمیان قۆناغی پێش ڕاپەڕین و قۆناغی دووەم دوای ڕاپەڕینی خەلکی کوردستان لە دژی ڕژێمی بەعس ئەوە هەست دەکەین لە جۆری پێکهاتەوە هونەرمەندان لەپێش ڕاپەڕین لەژێر زەبرو زەنگ و نا ئارامی و نا ئازادیدا کاری هونەری و تەمەنیان بەسەردەبردو کارەکانیش بە ئەستەم ئەنجام دەدرا، بەلآم لەدوای ڕاپەڕینەوەو ئازادکردنی شاری کەرکوك ئەوە بووە خالێکی وەرچەرخان لە ڕووی کاری هونەری و دروستکردنی ناوەندو سەندیکاو ڕێکخراوی تایبەت بە هونەرمەندانی کوردو دامەزراندن و گەشەکردنی پەیمانگەی هونەرەجوانەکانی کەرکوك ئەوەش جارێکی تر هۆکارێکی تری گەشەکردنی بەخشی بە هونەری شێوەکاری لە شاری کەرکوکدا.

لە کۆتاییدا تەنها ئەوە دەلێم با بەهەموومانەوە شانازی بەشاری کەرکوك و مێژووەکەی و هونەرەکەیەوە بکەین، جێگەی خۆیەتی دەستخۆشی لە برای خۆشەویستم (سمکۆ بەهرۆز) کە بەکارێکی هێندە گەورەو پڕ بایەخ دەستیپێکردووە، دەستخۆشی و هیوای سەرکەوتنی بۆ دەخوازم.

*** گەڕانەوەی مێژووی شێوەکاری:**

کەرکوک هەردەم جێگەیەکی شیاوی بڵاوبوونەوەی شارستانییەکان بووەو شوێنێکی بەرچاوی هەبووە لە گەشەکردنی هەموو لایەن و بوارەکانی ژیان لە چوارچێوەی ئەو جوانکارییەی کە ڕووی داوە لە پێگەیاندنی ئابووری ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و تەلارسازی و کۆتەڵەو وێنەو تابلۆکان کە هەرهەمووی لە شارستانییەتە یەك لەدوای یەکەکان سەرچاوەیان گرتووە.

شارستانی هوری - میتانییەکان لە ناوچەی کەرکوکدا یەکێکە لەو شارستانیانەی کە پاشماوەیەکی بالایان بەجێ‌هێشتووە لە هەموو بوارەکاندا لە (نوزی)و (کوڕووخانی)و (ئەراپخا)دا.

یەکێك لەو بوارانە بواری هونەرو دەست ڕەنگینیە لە هونەری نەخش و نیگارو کۆتەڵ و بەکارهێنانی ڕەنگ لە ڕازاندنەوەی کۆشکەکانیان کە بەڵگەن لەوەی گەلێك هونەرمەندی گەورە دەوریان بینیوە.

ئەوەی کە بۆمان بەجێماوە لەهونەر بەشێوەیەکی گشتی لەشارستانی هوری - میتانییەکانی ناوچەی کەرکوك بریتیە لەهونەری نەخش و نیگاری سەردیوارو هەڵکۆڵین و کۆتەڵ کە گەلێك لەم پاشماوانە ڕازاوەتەوە بەوێنەی سەری بەران و درەخت و وێنەی (حاطور)، لەگەڵ بەکارهێنانی نەخشی چوار گۆشەیی و لاکێشەیی و بازنەیی و سێ گۆشەیی لەنێو وێنەکاندا، بەکارهێنانی ڕەنگی پێویست لە بۆیەکردنی وێنەکانی کۆشکی نوزیدا، هەروەها بایەخیانداوە بەهونەری هەڵتۆقین لەسەر دیوارو ڕازاندنەوەی پەرستگاکانی نوزی و کوڕوخانی و بەکارهێنانی تاق و ڕازاندنەوەی لەگەڵ نەخشی هۆڵەکاندا.

هونەری کۆتەڵیش یەکێك بووە لەو هونەرانەی لە شارستانییەتی هوری-میتانییەکاندا باوی هەبووەو جێگەیەکی بەرچاوی هەبوو، وەکو ئەوەی بینراوە لە کۆتەڵی (خوداوەند عەشتار-تیشۆپ)دا کە هەریەکەی هاوتەریبی هونەری ئەو کاتەی هوری-میتانی بووە لەو ناوچەیەدا. کە تا سەردەمانێکی تر کەوتە ژێر کاریگەریی ئاشووری و میدییەکانەوەو کاریگەری ئەو لایەنانەی بەسەرەوە بەجێماوە، لەدوای ڕووخانی دەوڵەتی هوری-میتانییەکان کاریگەرییەکان زیادیان کردووە.

پاش ئەوەی کەرکوك کەوتە ژێر کاریگەری دەوڵەت و شارستانی ئەسکەندەرو ساسانی و پرسییەکان و بڵابوونەوەی ئایینی زەردەشتی، بووە ڕامالێنی شارستانییەکان و لەگەڵ خۆیدا گەلێك شێوازو هونەری شێوەکاری سەریان هەڵدا کە کەوتنە ژێر کارتێکردنی ئایینەوە بەتایبەتی ئایینی زەردەشتی و بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی، بەڵام بەداخەوە تاکو ئێستاکە ئەو پاشماوانەمان زۆر بەکەمی دەستکەوتووە تاوەکو بەراوردێکی هونەری ئەو کاتە بکەین لە کەرکوکدا.

*** هونەری ئەیقۆنات:**

یەکێك لەو بابەتە ئایینی و هونەرییانەی ناو ئایینی مەسیحی هونەرو وێنەی (ئەیقۆنات) یان هونەری جیهانی وێنەکێشانی مەسیحییەت و چوارچێوەی ئایینییەکەیەتی، هونەری ئەیقۆناتیش هەڵگری ئەو ژینگەیەیە کە تیایدا گەشەی کردووە لە قوتابخانەکانی بڵاوکردنەوەی ئایینی مەسیحی.. هەربۆیە هەڵگری ئەو سەردەمانە بە ناخی تابلۆکاندا ڕۆچووەتە خوارەوە، ناوچەی کەرکوکیش یەکێکە لەو شوێنانەی کە خاوەنی تایبەتی خۆیەتی لە هونەری ئەیقۆناتدا، چ لە ڕووی کاریگەری هونەری ئەیقۆناتی ناوچەکانی ترو چ لە ڕووی تایبەتمەندی هونەری ئەیقۆناتی کەرکوك.

لە پێش هەموو شتێك وێنەکێشی ئەیقۆنات بریتییە لە مرۆڤێکی خاوەن باوەڕ، کە هەڵدەستێت بەدەربڕینی باوەڕەکەی لە ماوەی کارەکەی و یارمەتی خەڵکی تر دەدات بۆ باوەڕهێنان و نزیکبوونەوە لەخوا لەدەروازەی ئەیقۆنەکەوە.

وێنەکێشی ئەیقۆنات هەڵدەستێت بە بەکارهێنانی تەکنیکی تایبەتی وەکو دووری و سێبەرو ڕۆشنایی و بەراووردی لەگەڵ پێوانەی لەشی مرۆڤ و بەکارهێنانی ڕەمزی ڕەنگ، کە پەیوەندداره بەڕێکخستنی ئەندازەیی و هێڵکانیان.

بەپێی سەرچاوەکان وادەردەکەوێت کە جۆری وێنەی ئەیقۆنەکەی (پاکیزە مەریەم)ی سەر قەڵا، کەرەستەی ئەیقۆنەکە لە گەچ دروستکراوەو لەسەر دیوارەکە نەخشکراوە، کە گەورەترین پاشماوەی ئەو کاتەیە کە بەجێماوە.

*** سەرەتاکانی هونەری شێوەکاری لەکەرکوکدا:-**

دەربارەی سەرەتای دەسپێکردنی هونەری شێوەکاری لە کەرکوکدا زانیارییەکانمان زۆر کەمەو تەمومژی تێدا هەیەو مێژوویەکی دیاریکراوی وامان نییە تا بەشێوەیەکی نەگۆڕ دیاری بکەین، بەڵام ئەوەی بەدەستمان گەیشتووە، جۆرێکە لە نزیکبوونەوەی مێژووی ئەو ماوە هونەرییە.

مامۆستا مەحمود ئەلعوبێدی ئاماژە بەوە دەکات لە ماوەی چلەکاندا مامۆستا (شەفیق عومەر ڕەزوانی) ناسیوە کە مامۆستای ڕەسم و کاری دەستی بووە، بەڵام لەدواییدا خانەنشین کراوە، کە بایەخی بە قوتابییان داوەو بەشداری کردووە لەگەڵیاندا، هەروەها لەو ساڵانەدا پێشانگایەکی بۆیان کردووەتەوەو (سینان سەعید)یش بەشداری کردووە.

هەروەها ئاماژە بەوە دەکات مامۆستا (شەفیق) لەو ماوەیەدا هەڵدەستا بەکێشانی وێنەی مەلیك فەیسەڵ لەسەر (مس) کە بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش دروستی کردووە.

لە هەمان کاتدا ئاماژە بەوە دەکات کە مامۆستایەك لە قوتابخانەی ئیمام قاسم بەناوی (شەفیق عومەر بەزاز)، بایەخی بە قوتابیان داوەو کاری دەستیان بەقوڕو بەردی (مەلا خەنە) دەکرد.

لە هەمان کاتدا ئاماژە بەهەریەکە لە (محەمەد عەلی بەیاتی)

و (محەمەد مەهدی خەلیل)لە خورماتوو دەکات پێشانگای خۆیان کردووەتەوە.

بەڵام ئەوەی ڕوونەو لەبەر چاوانە، کە هونەری شێوەکاری سەرەتا لە کەرکوکدا لە پێشانگای قوتابخانەکانەوە دەستپێدەکات، ئەو مێژووەی کە دیارە لە ساڵانی (١٩٤٠) دا بەڕێوەبەری پەروەردەی کەرکوك پێشانگایەکی گشتی وێنەکێشان و کاری دەستی کردووە بۆ قوتابی و مامۆستای قوتابخانەکان، ئەم پێشانگایانەی قوتابخانەکان لەو ساڵانە بەدواوە بەردەوام بوو، بەشێکی گەورە لە قوتابیان و مامۆستایانی پێگەیاندو گەلێکیان دەوریان بینی لە مێژووی هونەری شێوەکاری لەسەر ئاستی پارێزگاکەدا.

ساڵ لەدوای ساڵیش ئەم پێشانگایانە زیاتر بایەخی پێدراوە، تا دەهات پێشانگاکان فراوان دەبوو، هەموو بەشە هونەرییەکانی دەگرتەوە لەسەر ئاستی شێوەکاری و کۆتەڵ و کاری دەستی و پیشە دەستییەکانی نێو پارێزگاکە.

*** سەرەتای پێشانگاکانی شاری کەرکوك:-**

یەکەمین پێشانگا لە کەرکوك بریتییە لەو پێشانگایەی (عەزیز سەلیم) کە لە ساڵی (١٩٣٤)دا بە شەش تابلۆ لەچاپخانەی (یدالله) لە گەڕەکی شۆڕیجە کردوویەتەوە، فەرمانبەرانی شەریکەی نەوتی کەرکوك هاتوون بە چوار دینارو شەش دینار هەندێك لەو تابلۆیانەیان لێکڕیوە.

یەکێك لە یەکەمین نیگارکێشە کوردەکانی ئەو ساڵانەش لە کەرکوك ناوی (ئیبراهیم خەلیل)، خەڵکی خورماتوو بووە، سەری لە پێشانگاکەی عەزیز سەلیم داوە لە ساڵی ١٩٣٤، هەر لەوێش یەکتریان ناسیووەو عەزیز سەلیمی هانداوە بۆ ڕەسمکردنی زیاتر.

لە ساڵی (١٩٥٠) خالید سەعید کە هونەرمەندێکی ناوداری سلێمانییەو لە هۆڵی کتێبخانەی گشتی شاری کەرکوك پێشانگای فریشتەی کردووەتەوە کە بریتی بووە لە (٥٠) تابلۆی ژیانی کوردەواری و ژیانی ئەوروپای نمایش کرد لەگەڵ چەند فۆتۆگرافێك، هەروەها لەنێوان ساڵانی ١٩٥٥-١٩٥٦ لە تەلەفزیۆنی کەرکوك دیکۆری کردووە.

هەروەها بەدیع باباجانیش کە لە ساڵی ١٩٥١ خوێندنی ئەکادیمی تەواو دەکات دەوری هەبووە لە هونەری شێوەکاری لەو شارەدا. لە ساڵی (١٩٥٣) دا مەڵبەندی ڕۆشنبیری بەریتانی لە کەرکوك گەشتێکی هونەری ساز کرد بۆخۆیان و چەندین هونەرمەندی دیکەی کەرکوك بەرەو شاری هەڵەبجە گەشتیان کردووە، زانیاری دەربارەی کاری هونەری ئەو گەشتە نادیارەو نازانین چ جۆرە تابلۆیەك کراوەو چی بەسەردا هاتووە، زۆر لە هونەرمەندان وەك مامۆستا (ئازاد شەوقی) باس لەو گەشتە دەکات کە کراوە بۆ هەڵەبجەو لەوێ تابلۆیان کێشاوە، ئایا لەوێ گەڕاونەتەوە ئەو وێنەو هێلکارییانەی کردووەتە پێشانگا یان نا؟ تا ئێستا نازانین، بەڵام لە مەڵبەندە ڕۆشنبیرییەکەی لای چاپخانەی (مەجیدیە) کۆڕو پێشانگاو کتێبخانە هەبووە ئەمانە هەمووی ڕۆڵی هەبووەو جێگە پەنجەی خۆی لە هونەری ڕۆشنبیری کەرکوك بەجێهێشتووە.

*** گرووپی هونەرمەندانی کەرکوك - جماعە فنانی کرکوك:-**

گرووپی هونەرمەندانی کەرکوك لە ساڵی (١٩٥٣)دا لەسێ ئەندام پێکهات، ئەویش (مەحمود ئەلعوبەیدی)و (سدیق ئەحمەد عاشوور)و (سنان سەعید)، هەر وەکو بەڵگەکان ئەوە دەخنە ڕوو کە ئەم هونەرمەندانە لەژێر کاریگەری (اصدقاء الفن) کە لە بەغدا دامەزرابوو ڕۆڵی بینی لە پێگەیاندنی (جماعة فناني كركوك)، چونکە بەشێکیان پێشانگایان دەکردەوە لەگەڵ مامۆستاکانیان لە بەغدا.

بۆیە (مەحمود ئەلعوبەیدی) دەیگێڕێتەوەو دەڵێت: "من و هاوڕێکەم (حەمید ئەلمحەل) سەرمان لە بەغدا دەدا پێش تەواوبوونی خوێندنمان، پێشانگامان لەگەڵ مامۆستاکانمان دەکردەوە لەگەڵ هەر یەکە لە (بەهجەت عەبوش)و (حافز ئەلدەروبی)و (قاسم محەمەد) لە پەیمانگای بەریتانی لە بەغدا" . هەر ئەمە وایکرد هەر یەکە لە (مەحمود ئەلعوبەیدی) و (سدیق ئەحمەد عاشور)و (سینان سەعید) بناغەی یەکەم کۆمەڵە دامەزرێنن.

ئەم سێ هونەرمەندە، یەکەمین پێشانگای خۆیان بەناوی (جماعة فناني كركوك) لە ساڵی (١٩٥٣) دا لە هۆڵی بینایەی قوتابخانەی (غازی) سەرەتایی کردەوە، لەوانەیە پێشانگای دووەمیان لە قەسابخانەی کەرکوك لەگەڵ پێشانگای کشتوکاڵی و پیشەسازی لە کەرکوك کردبێتەوە.

پاشان پێشانگای، سێیەمیان لە ساڵی ١٩٥٤ لە هۆڵی کتێبخانەی گشتی کۆنی کەرکوك کردەوە، کە ئەم هونەرمەندانەی خوارەوە بەشداریان کرد، عیزەدین ئەلسەندوق، سدیق ئەحمەد، ئینجا لە هەمان ساڵدا پێشانگای چوارەم کرایەوەو ئەم هونەرمەندانەی هاتنە ناو گرووپەکە، محەمەد مەهدی، عەبدوڵڵا ئەمین، هاشم ئیسماعیل ئەلموسڵی، خاتوو زاروهی کیورك، لەپێشانگای پێنجەمدا لە ساڵی ١٩٥٥، لەهەمان شوێن کرایەوە تەنیا ئەم هونەرمەندانە بەشدارییان تێدا کرد، مەحمود ئەلعوبەیدی، سنان سەعید، سدیق ئەحمەد عاشوور، عیزەددین ئەلسەندوق، محەمەد مەهدی، عەبدوڵڵا ئەمین، خاتوو زاروهی کیورك، هاشم ئیسماعیل، هونەرمەندان لەهەمان شوێندا پێشانگای شەشەم و حەوتەم و هەشتەم و نۆیەم، بەڵام پێشانگای دەیەمیان لە هۆڵی یانەی مامۆستایانی کۆیە کردەوە.

لە ساڵی (١٩٥٦) دا هونەرمەندی ئافرەتی بەریتانی (ساوسبی)، پێشانگای خۆی لە کەرکوك کردەوە.

ئەوەی جێگەی ئاماژە پێکردنە لەکاتی کردنەوەی پێشانگای پیشەسازی و کشتوکاڵی لە کەرکوکدا لەهەمان ساڵدا، لایەکی پێشانگاکە تەرخان کرابوو بۆ وێنەکێشان کە تایبەت بەخۆیانەوە بۆ نمایشی وێنەکانیان لەو پێشانگایەدا.

لەو ساڵەدا دوو پێشانگا کرایەوە بۆ وێنەکێشانی کەرکوك یەکێکیان لەمانگی شوبات وە ئەوی تریان لە کۆتایی مانگی مایس لە هۆڵی کتێبخانەی گشتی کە بەسەرپەرشتی

موتەسەڕیف (بەشیر حەدید) بوو، بەڵام پێشانگای کۆتایی لەهەموو ئاستێك لە هەموو پێشانگاکان باشتر بوو کە بەهەشتا تابلۆ بەشداری کرا کە ئەمیش بەڵگەی پێشکەوتنیان بووە لەکارەکانیاندا.

بۆ نموونە (سدیق ئەحمەد) بەو پۆستەرانەی کە بەشداری کرد بریتی بوو لە شێوازو ڕووی جیاواز وەکو ئەوەی بەکاری ئەهێنا لە ڕەنگی ئاویدا لەوەو پێش کە بۆ نزیکەی ٢٠ ساڵ بەردەوام بوو لێی لە کارەکانیدا.

کارکردنی سەربازی ئەم وێنەکێشە، کاریگەری وای دروست کردبوو لە کارەکانیدا، ئەویش بەهۆی گەڕان لە سروشتی عێراقدا دەورێکی باڵای بینیووە لەسەر وێنەکانی، ئەو تابلۆیانە کە بەشداری کرد بریتی بوو لە (مقهی)، (احتضار)، (عائلة الحوذي)، (القصاب).

هونەرمەند (مەحمود عوبێدی) بەشداری کرد بە تابلۆکانی (الفلاح)، (العبید)و (القریة).

(محەمەدی مەهدی) بەشداریکرد بە تابلۆکانی (جبل حمرین)و (الصیف في الطون).

وێنەکێش (نازف محەمەد عەلی) یش بەم تابلۆیانە بەشداریکردووە (رکاب الدرجة الثالثة)، (ذات الوشاح الاخضر) وە ئارەزووی بەلای ڕەنگی شین و خۆڵەمێشی بووە زیاتر.

هەروەها هونەرمەند (سنان سەعید) بەچەند تابلۆیەکی زەیتی بەشداریکرد لەوانە (أمي)، (حدیقة ام الربیعین)، (الصباغات)، (الصباغ الصغیر).

هاشم ئیسماعیل بەشداری کردبوو بە تابلۆی (القریة العراقیة)، (منارة الحدباء في اللیل)، (الخیام).

لە ساڵی (١٩٥٧) دا پێشانگای یازدەهەم و دوانزەهەمیان لە بینای (المعهد الثقافي الامریکي) لە کەرکوك بە بەشداری ئەم هونەرمەندانە کردەوە: مەحمود ئەلعوبەیدی، سدیق ئەلسەندوق، ناتق محەمەد عەلی، هاشم ئیسماعیل، تاریق ئەحمەد عەلی قەنبەر ئوزدەمیر.

لە ڕۆژی (٢٨)ی شوباتی ١٩٥٨ پێشانگایەکی گەورەیان کردووە لە کتێبخانەی گشتی کەرکوك بە بەشداری هەموو هونەرمەندان.

لە ساڵی (١٩٥٩)دا، موئەید ڕاوی و ئەنوەر محمود سامی، خێزانی (سادق ئەلئەعرەجی)یش پەیوەندیان پێوە دەکەن و پێشانگای سێزدەهەم و چواردەهەم بەناوی پێشانگای (الثورة) لەبینایە تازەکەی (کتێبخانەی گشتی کەرکوك) دەکەنەوە، پاشان لە ساڵی ١٩٦٠ ئەم هونەرمەندە تازانە دەبنە ئەندام، سەلاح بکری، زینولعابدین دامرچی، موەفەق ئەنتوان ئەلوەکیل و پێشانگای پانزەهەم لە هەمان بینایە دەکەنەوە هەروەها (جماعة فناني کرکوك) چەندین پێشانگای دیکەیان لە دەرەوەی کەرکوك بەتایبەتی لەبەغداو تورکیا کردووەتەوە.

مەحمود ئەلعوبەیدی کاتێك لە ساڵی ١٩٦٠ دەبێتە سەرپەرشتیاری چالاکییە هونەرییەکان لە شاری کەرکوك ئەم هونەرمەندانە دێنە ناو گرووپەکەیەوە: خالید ڕەمەزان، محەمەد عیزەت، ئایدن حوسێن، کەماڵ تاهیر، عەباس حوسێن، ئاین شاکر، ئەکرەم سابیر، فەخری جەلال، عەبدولڕەزاق شێخلەر، نورەددین عیزەت، سەلاح شێخلەر، سوعاد عیزەت، سەمیرە بەهیە، پۆڵس عیسا، نەجمەددین محەمەد عەلی، عەلی ئەلنەجاڕ، فریال ئەلمودەڕیس، عەباس ئەرەنای، نەوزاد کەدەك، د. ئەنوەر عەلی).

لە (٢٧)ی نیسانی ساڵی ١٩٦٤ گرووپی هونەرمەندانی کەرکوك لەگەڵ فیستیڤاڵی هونەری ساڵانەی پەروەردەی کەرکوکدا پێشانگایەکی شێوەکارییان کردووەتەوە کە وەزیری پەروەردەی ئەوسای عیراق (ئیسماعیل ئەلعارف) سەرپەرشتی ئەو پێشانگایەی کردووە.

لە ساڵی ١٩٦٧ هونەرمەندی شێوەکاری (ئایدن شاکر ئەلعراقی) یەکەم پێشانگای تایبەتی خۆی لە هۆڵێك لە شەقامی (ئەتڵەس)دا کردووەتەوە.

لە (٢٥)ی ئابی ساڵی ١٩٦٩ گرووپی هونەرمەندانی کەرکوك لە یەکەم هەنگاوی هاوبەشدا لە شاری بەغدا پێشانگایەکیان لە هۆڵی (کولبنکیان) کردەوە ئەم هونەرمەندانە بەشدارییان کرد: (مەحموود ئەلعوبەیدی، فەخری جەلال، فریال ئەلمودەڕیس، نورەددین عیزەت، پۆلس عیسا، خالید ڕەمەزان، عەبدولڕەزاق شێخلەر، عەلی ئەلنەجاڕ، عەباس ئەرەنای، ئایدن شاکر ئەلعراقی، ئەکرەم سابیر، کەمال تاهیر، نەوزاد کەدەك).

لە بەرواری (٧-٩)ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٧٠ ژمارەیەك لە هونەرمەندانی کەرکوك پێشانگایەکی هاوبەشیان بە ناوی (پێشانگای هونەرمەندانی تورکمان) کردەوە کە ئەم هونەرمەندانەی لای خوارەوە بوو: (عەباس ئەرەنای، خالید ڕەمەزان، سەعید عیسا، محەمەد عیزەت خەتات، ئایدن ئەلعراقی، نوەردین عیزەت، نەوزاد کەدەك، کەماڵ تایر، محەمەد مەهدی، فریال ئەلمودەڕیس، ئەکرەم سابیر کەرکوکلی، فەخری جەلال، عەبدلڕەزاق شێخلەر، سەلاح پەری، د.ئەنوەر عەلی).

لە ساڵی ١٩٧٠ هونەرمەندانی کەرکوك لە دەرەوەی عیراق و لە ئەنقەرەی تورکیا پێشانگای هاوبەشی خۆیان کردەوە: (ئایدن شاکر ئەلعراقی، خالید محەمەد ڕەمەزان، عەباس حوسێن ئەرەنای، عەبدولڕەزاق شێخلەر).

*** تێبینییەکانی د.فەرهاد پیربال دەربارەی (گرووپی هونەرمەندانی کەرکوك):-**

١. هەندێك لەو هونەرمەندانەی کەرکوك بۆ نموونە عیزەددین ئەلسەندوق بە شایەدیی (شاکر حەسەن ئال سەعید) لە دەستەی (جماعة أصدقاء الفن) بوونەو لە ساڵی ١٩٤٨ بەشدارییان لە پێشانگاکانیان کردووە.

٢. دوو ئەندامی (جماعة فناني کرکوك) محەمەد ئەلعوبەیدی و سدیق ئەحمەد عاشور لە ساڵی ١٩٥٥ بە ئەندامی (جمعیة الفنانین العراقیین) لە بەغدا وەردەگیرێن.

٣. (جماعة فناني کرکوك) لە ساڵی ١٩٥٢ تاکو شەستەکان ساڵانە پێشانگایان کردووەتەوە، ئەم سێ هونەرمەندەش لەلایەن پارێزگاری کەرکوکەوە خەڵات کراون: مەحمود

ئەلعوبەیدی، سدیق ئەحمەد عاشورو محەمەد مەهدی.

٤. مەحمود ئەلعوبەدی کە هونەرمەندێکی پەیکەرتاش‌و ڕەسامی عەرەب بووەو هاوڕێی نزیکی ئازاد شەوقی بووە، چەندین سوپاسنامەو خەڵاتی وەرگرتووە بۆ ئەو کتێبانەی لە بارەی ڕەسم نووسیویەتی‌و بۆ ئەو هەموو پەیکەرانەی لە شاری کەرکوك دروستی کردووە.

٥. (جماعة فناني كركوك) چەندان پێشانگایان لە دەرەوەی کەرکوك لە بەغداو تورکیا کردووەتەوە؟

*** ئەم هونەرمەندانەی خوارەوە بەشداری ئەو ماوە مێژوویەی شێوەکارییان کردووە لە کەرکوك:-**

– (سدیق ئەحمەد عاشوور)، (محەمەد مەهدی)، (د. عەبدوڵڵا ئەمین)، (عەتا سەبری)، (نوری مستەفا بەهجەت)، (مەحمود محەمەد عوبێدی)، (بەدیع باباجان)، (عەدنان باباجان)، (فەخری جەلال)، (عەبدولڕەزاق شێخلەر)، (سەلاح شێخلەر)، (سالم حەبیب محەمەد داغستانی – سالم داغستانی)، (هاشم ئیسماعیل)، (عەباس حوسێن ئەرەنای)، (نورەددین عیزەت)، (نەجات شوکر کەوسەر ئۆغلۆ)، (محەمەد عیزەت خەتات)، (نازم ناسر)، (نورەددین ناسر).

*** گەشەکردنی هونەری شێوەکاری لەنێوان ساڵانی حەفتاکان تا ناوەڕاستی هەشتاکان:-**

سەرەتای حەفتاکان قۆناغێکی زۆر گرنگ بوو لە پەرەسەندن‌و پێشخستنی هونەرو ئەدەب چ لە شاری کەرکوك یان لە شارەکانی دیکەی کوردستان... بێگومان بەهۆی ئەو بزوتنەوە هونەرییەی لە ساڵانی چل‌و پەنجاکاندا لە کەرکوك هەبووە، بووەتە هۆی ئەوەی زۆر بەباشی لە حەفتاکاندا هونەر لە کەرکوك گەشە بسێنێت‌و پێشکەوتنێکی بەرچاو بەخۆیەوە ببینێ، چەندین پێشانگای شێوەکاری کرایەوە هەروەك پێشانگای هونەرمەند (ئەحمەد کاکە سوور) کە تەنیا ئەو پێشانگایەی لەسەرەتای حەفتاکان کردەوە ناوی نەما، بەڵام لەدوای پرۆسەی ئازادی لە هەندەران هاتەوەو پێشانگایەکی تری کردەوەو دووبارە گەڕایەوە.

هەموو دەزانین چالاکی قوتابخانەکان لە زۆربەی شارەکانی کوردستان ڕۆڵی باشی بینیوە، زۆربەی پێشانگاکان ئەوان ڕێکیان خستووە، بۆیە لە کەرکوك لە سەرەتای حەفتاکان زۆر پێشانگای باش کراوەتەوە کە چالاکی قوتابخانەکان ئامادەی کردووە بەرهەمی بەپێزی تیا بووە، ئەبێ کارتێکردنی (کۆمەڵەی کەرکوك) مان بیر نەچێت کە لە سەرەتای پەنجاکاندا لە کەرکوك دامەزراوەو ڕۆڵێکی باشیان بینیوە لە پێشخستنی هونەرو ئەدەب، بەراستی ئەو قۆناغە دەوڵەمەند بوو لەپێشکەش کردنی کاری هونەری چاك‌و کاریگەر.هەروەها دەبێت ئەوەشمان بیر نەچێت کە لە فیستیڤاڵی یەکەمی هونەری کوردی لە بەغدا چەندین هونەرمەندی شێوەکار لە کەرکوکەوە بەشداریان کردبوو لەو فیستیڤاڵەدا.

بەڵام بەداخەوە ئەو بزوتنەوە هونەری‌و ئەدەبییەی لە کەرکوك پەرەی سەندبوو بەسترابوو بەباری سیاسی ئەو سەردەمەوەو لەدوای (١٩٧٥)ەوە سستییەکی تێکەوتبوو وەکو جاران نەتوانرا کۆمەڵ بەیەکەوە کۆببنەوەو کاری هونەری پێشکەش بکەن، چونکە قۆناغی شۆڕشێکی نوێ کە دەستی پێکرد دڕەندەیی ڕژێمی بەعسیش لە شارەکەدا بە تەعریب‌و تەبعیس زیاتر دەستی پێکرد... بۆیە زۆربەی هونەرمەندان ڕوویان کردە شارەکانی دیکەو لە تیپ‌و گرووپی ئەو شارانەدا بەشداریان دەکرد... بەڵام لەبەر ئەوەی چالاکی شێوەکاری تۆزێك زیاتر بواری بۆ ڕەخساوە چونکە چالاکییەکی تاکە کەسییەو توانرا تا ناوەڕاستی هەشتاکانیش بەشێوەیەکی پچڕپچڕ چالاکییان بەردەوام بێت‌و پێشانگا بکەنەوە.

لە ناوەڕاستی حەفتاکان بەدواوە، تەواوی چالاکی‌و بزاڤە هونەری‌و ڕۆشنبیرییەکان بەغەیری عەرەبی قەدەغە کرا، نە کوردو نە تورکمان‌و نە ئاسووری کە خەڵکی ڕەسەنی کەرکوك‌و کوردستانن مافی ئەوەیان نەما کۆڕو پێشانگاو سیمینار بەزمانی زگماکی خۆیان جێبەجێ بکەن.

بەپێی ئەوەی هونەردۆستانی ئەوسای کەرکوك لێی ئاگادارن، وەك بزاڤی هونەرو ڕۆشنبیری لەنێو شاری کەرکوکدا تەنیا شێوەکاری ئامادەبوونی هەبوو، ئەو نیگارکێش‌و هونەرمەندانەی ئەو ماوەیە شۆڕە سواری گۆڕەپانە هونەرییەکە بوونە، هیچ جۆرە بزاڤو چالاکییەکی ڕۆشنبیری بەدی نەدەکراو هونەری شێوەکاری ئا لەم دە ساڵەی شاری کەرکوکدا مۆرك‌و خەسڵەتێکی تایبەتی بەخۆوە گرت، شێوەکاران هەوڵی پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە گەورەیەیان دەدا کە لەنێو دنیای ڕۆشنبیریی شارو لەئاکامی ئامادە نەبوونی توخم‌و ڕەگەزەکانی دیکەی هونەرو ئەدەب لە پانتایی کلتووری شاردا دروست بووبوو.

لەم هەوڵەدا کە وەك ئەرکێکی سەخت‌و دژوارو حەتمی‌و پڕ لە مەترسیدا بوو، شێوەکارانی کورد کەوتنە بەر ئەرکێکی قورسی نەتەوەیی‌و هونەری شێوەکاری کەوتە بن باری ئەرك‌و خەباتێکی سەخت‌و دژوار بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هێرشێکی بەربلاوی هەمە لایەنەی حکومەتی عێراق بۆ سڕینەوەی سیما کوردستانییەکەی کەرکوك‌و پاکتاوکردنی کوردان لە شاری کەرکوك‌و تێکڕای پارێزگاکەدا.

وەك گەواهی دانێك بۆ مێژوو شێوەکارانی کوردی ئەو شارە زۆر دلێرانە هەڵویستیان نواند بە تابلۆکانیان ڕاگواستنی کوردانیان ڕیسوا کرد، شاڵاوەکانی ئەنفالیان بەڕەنگ‌و هێڵ ڕیسوا کردو شەڕی داسەپاوی (عێراق-ئێران)یان ڕیسوا کرد، بەم جۆرە لە ماوەی پتر لە (١٠) ساڵ هونەری شێوەکاری کوردی لە کەرکوك، تاکە سەنگەری دژ بە هێرشی بەربلاوی حکومەتی عێراقی گرتبوو، ئەم قۆناغەی شێوەکاری لە کەرکوك سەروەرییەکی زۆر گەورەیە کە بۆ مێژووی هونەرو خەبات‌و بەرخودانی کوردانەی کەرکوکییەکان بە شانازییەوە تۆمار دەکرێت چونکە ئەگەر هەندێ مەسەلەی پەنامەکی‌و مەسەلەی لەیەك نزیك کردنەوەی دۆزی کوردو دۆزی فەلەستینییەکان نەبووایە، بۆی هەبوو چارەنووسی هەر

شێوەکارێکی کە پێشانگایەکی دەکردەوە لە چارەنووسی پێشمەرگەیەکی بەدیل گیراو چاکتر نەدەبوو.

هەر بۆیە دەبینین لەو ماوەیەدا شێوەکارانی کەرکوك کەوتنە بەر کاریگەری ڕەنگ‌و هێڵ‌و دابەشکردنی بەجۆرێکی وا کە بتوانێت زیاتر دەربڕ بێت لەو ئاوەزو پانتاییەی کە شێوەکار دەیویست دەریبڕێت‌و بتوانێت ئەو ڕەنگانە هەڵبژێرێت کە گوزارشت لە نەهامەتی‌و دەربەدەری‌و ئەنفال‌و ڕاگواستن بکات‌و ئەو هێڵانە دیاری ڕەنگەکان بکات کە دەربڕی ئەو خواستانە بێت‌و بۆ ئەوەی سەرنجی بینەر ڕابکێشێت.

پێویستە ئاماژە بەوەش بکەین کە سازدانی پێشانگایەکی شێوەکاری کارێکی ئاسان نەبوو، جگە لەوەی ئەرك‌و ماندوو بوون‌و خەرجییەکی زۆری دەویست، سەرکێشی‌و جورئەتێکی گەورەشی گەرەك بوو کەوا پیشان بدەیت کە هونەرمەندی‌و کەسێکی بەشێوەیەکی جوان‌و ئیستاتیکاییانە بیر دەکەیتەوە، هاوکات خۆ نزیککردنەوە لەو دەزگا حکومییانە کە مۆڵەت‌و ئاسانکاری سازدانی پێشانگایان بەدەست بوو.

سڵەمینەوەی زۆری دەویست‌و ئەوانیش ئامادە نەبوون بە ئاسانی ڕێی بدەن جموجوولێکی ئەوتۆ هەبێت، کە بۆی هەیە مەزەندەی ئەوەی لێ بکرێت لە بەرژەوەندی ئەواندا نەبێت.

*** ناوی ئەو شێوەکارانەی کەرکوك کە لەو قۆناغەدا ڕۆڵیان هەبووە:-**

(ئەحمەد کاکە سوور، غازی محەمەد، گارا ڕەسوڵ-تەیب حەسەن، ئەیوب شەریف، عیرفان محەمەد عەلی، حەمید دەروێش، میدحەت محەمەد عەلی کاکەیی، هیمەت کاکەیی، خالید ستار، ئەروان میدحەت-ئەریوان میدحەت، محەمەد ساڵەیی، ئیبراهیم عەلی ئەحمەد، خەلیل محەمەد حوسێن-خەلیل کاکەیی، سوعاد ستار عومەر، سەلام جاسم، سەلاح محەمەد میرزا، عادل عەلی، فاروق فایق، تانی سانی، فاتیمە بەیرەقدار، حوسامەدین حەکیم محەمەد قادر، ئاشتی مەهدی محەمەد-ئاشتی گەرمیانی، ئازاد مستەفا-ئازادە ڕەش، فەلاح عومەر، حەمید جاف، فایق عومەر ڕەسوڵ، فوئاد ئەلکنجی، نورەددین جاف، هیوا کەریم-دۆمان، ئەحمەد ئەسوەد ئەحمەد، سەدرەدین عارف، عەلی کەریم مەحمود، عەونی ئەقاش، عادل کازم موسا، سەردار سابیر عەبدوڵلا، شەفیق عومەر، خالید محەمەد مەهدی، جەماڵ ئیبراهیم مەدەد، ئەیاد چەلەبی، شێرزاد باخەوان-شێرزاد ئەمین فەرەج، ئازاد ئەنوەر سالح ڕەسوڵ، سامان ئەبو بەکر، تالیب ئەلماس حوسێن کاکەیی، سەلاح حەمە ئەمین، عەلی سدیق).

*** هەروەها بێجگە لەم شێوەکارانە ئەمانەی خوارەوەش ڕۆڵیان هەبووە لە بزاڤی هونەری شێوەکاری لە کەرکوك:-**

(یونس گەلو ئەلعەزاوی، جەلال فەتاح پۆلات، عەباس شەکەرچی، نازم فەرهود، سەمیرە ئەلخەیات، غازی ئەلدلێمی، ئەحمەد فایق، عەلی یوسف، خالید حوسێن نەجم، سەنا جاسم، جەمیل شەمعون، عەلی محەمەد ڕەحیم، ئومێد عومەر، نیهاد خالید شوانی، مەحمود عەبدولڕەحمان، جەمال ئیبراهمی مەدەد، عەبدوللەتیف ئەلواستی، غەسان ناجی ئال سەعید، سامی عەزیز، غازی ئەلوەنداوی، حوسێن عەلی مەراح، هاشم ڕەفعەت، حوسێن دامرچی، سوعاد ئەرسەلان، سەردار سابیر عەبدوڵلا، عابدین دامرچی، عادل تالیب، عەبدولڕەزاق نوری، موعتەسەم ساڵەیی، کامیل شەمعون، عەباس عەلی، ئەنوەر عەبدولڕەحمان، حوسێن عەلی ڕەشید، ئەحمەد حوسێن ڕۆستەم، سەلاحەددین ڕەشید (شوان زەنگنە)، عەبدولڕەحمان جۆلا، جەمیل نەسرەت، نەجات حەمید سەلمان، محەمەد جیهاد ئەلنعێمی، موفەق جۆمەرد، عادل عەبدوڵلا ئەلقەساب، عەبدولڕەحمان عەبوود، سەمەر عوسمان عەتار، سەعدوڵلا ئەلتکریتی، تارق میخائیل، نەجمەددین محەمەد عەلی، ئیسماعیل ئەحمەد محەمەد، حەمید شەریف، محەمەد موکری).

*** شێوەکارانی کەرکوك لەنێوان ساڵانی ناوەڕاستی هەشتاکان تا نەوەدەکان:-**

مێژووی هونەری شێوە کاری قۆناغێکی گەلێك گەورەی بڕیوە لە کەرکوکداو بەگەلێك ئاستەنگدا ڕۆیشتووە، تا سەردەمانێك خاوەنی گەلێك کەڵە شێوەکار بووە لەسەر ئاستی کوردستان‌و جێگەو پێگەی خۆی هەبووە لەبەرەو پێشچوونی ڕەوتی هونەری شێوەکاری.

قۆناغەکانی هونەری شێوەکاری هاوپەیوەستی بارە سیاسییەکەی کەرکوك بووەو لەو چوارچێوەیەدا تووشی بەرزبوونەوەو نزمبوونەوەی ئاستی هونەری بووەو لە گەلێك باردا ئەو ڕەنگدانەوەیە بەزەقی ڕەنگی دابووەوە ئەویش لەوەدا بەدەردەکەوێت لە کۆچکردنی ژمارەیەکی زۆری شێوەکارەکان‌و یان ڕەنگدانەوەی ئاستی هونەری لەڕووی تابلۆکاندا، یان کاریگەری بابەتی شێوەکاری لەڕووی تابلۆکان‌و توانەوەی ئەو بارە ناجێگیرە لە چوارچێوەی ناوەڕۆکی تابلۆکاندا .

لەبەر ئەو دەبینین زمانی ئەم هونەرە زیاتر ڕەنگ‌و هێڵ بووە لە دەربڕینی خواستەکانی هونەرمەندێکی شێوەکارو زیاتر لە پانتاییەکی ڕەمزیدا خۆی بینیوەتەوە.

بمانەوێت‌و نەمانەوێت لەگەلێك باردا بەرهەمی کرچ‌و کاڵ‌و لاوازی پێگەیاندووەو بووەتە دەربڕی ئەو واقیعەی کە تێیدا دەستەمۆ بووە .

بەڵام ئەوانەی لە دەرەوەی کەرکوك (کوردستان یان هەندەران) بایەخیان بەهونەرکەیاندا گەشەیان کرد و لەو

چوارچێوەیە چوونە دەرەوە کە لەوەوپێشدا دەستەمۆ بوون، لەو بوارەدا گەلێك شێوەکاری بەتوانامان سەری هەڵداو تەنانەت هەندێکیان ئاستێکی جیهانیشیان پەیدا کرد لە ڕووی بابەتو ناوەڕۆکدا ئاستێکی هونەری بەرزیان بەدەستهێنا، هەندێکیان تاماوەیەك پەلوپۆیان هاویشتو هەندێکی تریان بەردەوام بوونو بەشێکیان گەشەکردنەکەیان لەسەر توانایەکی دیاریکراو نەبوو، بۆیە پێویستمان بە ئاماژەو هەڵسەنگاندن هەیە بۆ دواڕۆژی ئەم شێوەکارانە.

* کاریگەری بارە سیاسییەکەی کەرکوك:-

ئەو بارە سیاسییەی هەشتاکانو نەوەتەکانی کەرکوك لە هەڵچوونێکی زۆر گەورە دا بوو کە گۆڕانێکی زۆر گەورەی دروستکرد لەسەر ئاستی دەرەوەو ناوەوەی کەرکوكو لە نەوەتەکاندا کەرکوك لەڕووی بەڕێوەبەریو کارگێڕییەوە بووە دوو لەتو گەلێك لەو شێوەکارانە ئاوارەی پارچەکانی تری کوردستان بوون، کە ئەمیش ناجێگیرییەکی گەورەی لە خودی هونەرمەندی شێوەکاردا دروستکرد کە لەگەڵ خۆیدا هونەری شێوەکاریشی ئالۆزکا بەو بارە سیاسییەو بووە دەرهاویشتەی بەرهەمی بێ هێز لە ناوەڕۆكو بابەتداو ڕەمز بووە باڵادەستی لە تابلۆکاندا، بەڵام ئەوانەی دەرەوەی کەرکوك بابەتە سیاسییەکەی کەرکوکیان قۆستەوەو ڕەنگدانەوەی بەدەرکەوت لەسەر تابلۆکان.

هەروەها ڕێگەنەدانی هونەرمەندی شێوەکار بەکردنەوەی پێشانگاو ئاستەنگ دروستکردن لەبەردەمیدا، شێوەکاری تووشی نووچدانو خواردنەوەی دەروونی کرد لەبەرامبەر دەربڕی بابەتەکاندا.

* لاساییکردنەوەی هونەری شێوەکاری بیانی:-

ئەگەر سەرنج بدەین لە بەشێك لە شێوەکارانی ئەو قۆناغە دەبینین لە گەلێك بۆنەدا لاساییکردنەوەی کوێرانەی تابلۆ جیهانییەکان ڕەنگی داوەتەوە لە بەرهەمەکانیاندا ئەویش یان باری سیاسی دەوری بینیووە یان نەبوونی ئاوەزی شێوەکارەکە بووە بۆ بابەتی هونەری چوار دەورەکەی یان لەژێر کاریگەری قوتابخانە جیهانییەکاندا دەستی بە تابلۆ کردووەو هەر لەو چوارچێوەیدا دەستی بە هونەر کردووە

* ڕەمزو هێڵو ڕەنگ لە تابلۆکاندا:-

ئەویش یەکێکە لەو دیاردانەی شێوەکارەکانی ئەو ماوەیەو ڕەنگدانەوەی ڕەمز لەتابلۆکانداو بەکار هێنانی هێڵو ڕەنگ بۆ دەربڕی ئەو ڕەمزانە ئەویش لەو چوارچێوەیەدا خۆی دەبینێتەوە کە گوایە بۆ خۆشاردنەوەیەك لە دەستی ڕژێمو هەوڵدان بۆ تەعبیرکردن لەو بابەتە لەو چوارچێوەیە کە لە هەندێك جاردا ڕەمزەکەی لاساییکردنەوەی تابلۆیەکی جیهانی پێوە بووە تابۆ ئەوەی لەو لایەنەوە لێپرسینەوەی لێنەکرێت.

هەروەها هێڵ دەورێکی کاریگەری بینیووە لە تابلۆکاندا زیاتریش هێڵی ڕەشو تەماویو تێکهەڵکێشی یەکتریو بێهێزی لەگەڵێك کاتدا لە بەکارهێنانی هێڵەکاندا، ئەویش لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە لە هەندێك کاتدا نەزانی لە بەکارهێنانی هێڵو ڕەنگیش لاوازی دەدات بەناوەڕۆکی بابەتەکە.

"کەرکوك تایبەتمەندییەتی خۆیی هەیە لە ڕووی پێکهاتەی شارەکەو کەش و هەواوە ڕاستەوخۆ ڕەنگی داوەتەوە لەناو تابلۆی شێوەکارانی شارەکە، ئەگەر بڕوانینە تابلۆی هونەرمەندەکان ڕەنگی قاوەیی ڕەنگێکە زۆرترین پانتاییەکانی ناو تابلۆی شێوەکارەکانی داگیرکردووە بەو پێیەی شارەکە شارێکی گەرمەو لەڕووی بینینو هەستکردنەوە ئەوە هەست پێدەکرێت کە بە پێچەوانەی شارەکانی دهۆكو سلێمانی کە پێکهاتەکەیان ڕەنگینە، هەر بۆیە زۆربەی تابلۆی شێوەکارانی ئەم دوو شارە زۆرترین ڕەنگ بەکاردێنن، لە هەمانکاتدا لەپاڵ ئەو ڕەنگەدا هێڵی ناو تابلۆکانی شێوەکارانی ئەم شارە بەردەوام بەئەندازەیەکی زۆر باریك پێکهاتەی تابلۆکانیان لێ بنیادناوە"[1].

* کەمی بەرهەمو پچڕ پچڕی:-

دەبینین لەم ماوەیەدا شێوەکار کەمی بەرهەمەکەی زۆر بەزەقی ڕەنگی داوەتەوە، یان بەردەوام نەبوونی لە کارەکانیدا پچڕپچڕی پێوە دیارە، ئەویش بەوەی هەیانە تەنها چەند تابلۆیەکی هەیەو ڕاوەستاوە لە کاری هونەریداو یان توانای هونەری نەماوەو لە هەموو پێشانگاکاکانیدا هیچ تازەگەرییەکی پێوە دیار نییە.

* زۆری هونەرمەندو کەمی بەرهەم:-

ئەوەی لەم ماوەیدا بەرچاو دەکەوێت هونەرمەندێکی زۆرمان هەیە کە لە هەموو قۆناغەکانی تر زیاترە، بەڵام ئەگەر لەسەر ئاستی هونەرییەوە سەیری بکەین دەبینین کە بەرهەمێکە کەم بەرچاو دەکەوێتو بەردەوام نەبوون لە کارەکانیاندا بووەتە دیاردەیەکی باوو تێکهەڵکێشی گەلێك قوتابخانەی جیهانی.

بەڵام ئەوەی جێی ئاماژەیە کە لە دوای پرۆسەی ڕزگارکردنی عێراقەوە هونەری شێوەکاری لە کەرکوکیش کەوتووەتە ژێر کاریگەری گۆڕانە سیاسییەکانی عێراقو هەنگاوەکانی بەرەو پێشچوونی هونەری شێوەکاری لەسەر ئاستی عێراق، بۆیە لە دوای پرۆسەوە کۆمەڵێك هونەرمەندی لاو سەریان هەڵداوە کە تا ڕادەیەك تایبەتمەندی قۆناغەکەی پێوە دیارەو ئەوەی ئەسەلمێنێت کە هاوسەنگی گۆڕانەکانی سەر گۆڕەپانی عێراقە.

*** کۆمەڵێك لە شێوەکارانی ئەم قۆناغە بریتی بوون لە:-**

مەحمود سیامەنسووری، عەلی دەروێش، مان ئەحمەد حەمید، سەدرەددین کاکەیی، فەلەکەدین ئەمین کاکەیی، عیماد چۆبان، نەدا عەسکەر، نازدار ئەحمەد، دلێر عوبێد، کامەران ئەحمەد میرزا، ستار ئەحمەد شەریف، حەیدەر کەمال گۆزەچی، دلێر محەمەد شەریف، گرفتار کاکەیی، فەریدون هاوار، هوشیار ئەحمەد جەباری، فازڵ شەوکەت کاکەی، خەدیجە یاسین تاها، ناسر کەریم، خەدیجە عەلی موراد، عەدنان سەعید کاکەیی، محەمەد شەریف نادر، شەهلە تەها، تارا خەلیل، شەرمین ئەحمەد ئەسوەد، نەرمین ئەحمەد ئەسوەد، ئاوات ئەحمەد ئەسوەد، خەیروڵڵا محەمەد عەلی، سەربەست ئەفەندی، پەروەر، عامر عوبێدی، دیلان عابدین، ڕووپاك عەسکەر، کنار عباس عەسکەر، نەسرین محەمەد مەهدی، سدیق نازم فەرهود، ئومێد بەهائەدین شاکر، شەهلە ئەحمەد، سۆلاف ساڵەیی، پشتیوان عەسکەر، محەمەد حەبیب، نیهاد خالید، وەهیبە خالید، نەشوە حەمید، ئارنۆ عەبدولقادر، سەلاحەدین ڕەشید، فەرمان ئەحمەد، گۆران نازم، پەخشان کەریم، شکۆفە محەمەد، حوسێن عەلی ڕەشید، دڵشاد حوسێن جۆلا، ئیبراهیم عەلی عەزیز، چالاك نوری بازرگان، نەشئەت حەسەن محەمەد، ئالان نەجدەت عەبدلرەحمان، موزر حارس حوسێن، مەحمود خالید شوانی، شلێر سیامەنسوری، ئەحمەد تاقانە، ڕەئوف حوسێن شەریف، عەبدولرەحمان حوسێن مەحمود، سەمیرە ساڵح، عەبدوڵڵا سەراج، خالید کاکی، نورەددین ئەمین، حوسامەددین کاکەیی، کامیل کەرکوکی، هیوا عەبدوڵڵا جەواد، مەریوان ساڵح عومەر شوانی، ئاری محەمەد نوری، ئاری فارس ئاوشوانی، عەبدولستار جەباری، ئاری خەتات، عەتائەڵڵا ئەحمەد خەلیف، مەریوان خەتات، ئازاد ئازری، جوان سەلاحەددین.

*** گرووپی (ئەستێرەکان) بۆ گرافیت:-**

"گرووپی ئەستێرەکانی سەنتەری چالاکی گەنجانی شاری کەرکوك بە نەخشاندنی وێنەو تابلۆی هەمەجۆرو هێنانی هونەری (گرافیتی Graffiti) لە وڵاتانی ئەوروپا و ئەمریکاوە شەقام و شۆستەکانی شاری کەرکوك دەڕازێننەوە.

گرووپی ئەستێرەکانی چالاکی گەنجانی شاری کەرکوك لە سەرەتای ساڵی (٢٠٠٩)وە کاری گرافیتی لە کەرکوك ئەنجام دەدەن بە سوود وەرگرتن لە کارە ئەورووپییەکان، دواتریش لە ساڵی (٢٠١٢)دا دەستیان کردووە بە کاری شەقام و شۆستە ڕازاندنەوەو لە چەند شەقام و شۆستەیەکی سەرەکی کاریان کردووە.

(نەکارۆس موعین) یەکێکە لەو کەسانەی دەستەی دامەزرێنەی ئەو گرووپەیە، ئەڵێت: (ئێمە چەند گەنجێکی خۆبەخشی شاری کەرکوك مەبەستمان لەم کارە ئەوەیە کە دیواری قوتابخانەو شۆستەکانی شاری کەرکوك بە شێوەیەکی هونەری بەرزی مۆدرێن بنەخشێنین و تاکو شوێنەواری ئەو پیسییە نەهێڵین کە لەسەری دروستکراوە).

سەبارەت بە پێشخستنی ئەو بوارە لەنێو کەرکوك (نەکارۆس) ئاژماەی بەوەدا کە لە داهاتوودا کار لەسەر ئەوە دەکەن زیاتر بایەخ و پەرە بەم کارە بدەن و چەند خولێکی تایبەت بە هونەری گرافیتی بۆ گەنجانی کەرکوك بکەنەوە.

لە وڵاتانی ئەورووپا و ئەمریکا هونەری گرافیتی بەشێوەیەکی زۆر بڵاوەو وەکو پیشەیەکی ڕۆژانە تەماشا دەکرێت، بەڵام لە شاری کەرکوك تاکو ئێستا بۆ مەبەستی جوانکاری و خزمەتکردنێکی هونەرییانە تەماشا دەکرێت، (نەکارۆس موعین) بەرپرسی ئەو گرووپەش ئاماژەی بۆ ئەوە کرد: (ئێمە وەکو خۆبەخش کار دەکەین و ئەوەش تەنها وەکو خزمەتکردنێکە کە دیواری قوتابخانەو شوێنە گشتییەکان بڕازێنینەوە بە شێوەیەکی هونەری بەرز)"[٢].

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

*** پەراوێزەکان:**

١. بەختیار سەعید، لە کاتی پێداچوونەوەی بابەتەکەدا ڕاووبۆچوونی خۆی خستۆتە ڕوو.

٢. ڕۆژنامەی (هەواڵ)، ژمارە (٥٨٩)، ساڵی چوارەم، (٢٥)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠١٤)، لاپەڕە (١٦)، بابەتێکە بە ناونیشانی:

(هونەری (Graffiti) لە کەرکوك زیندوو دەکرێتەوە).

*** سەرچاوە:**

١. گۆڤاری (نەوشەفەق)، ژمارە ٢، لاپەڕە ٧٠، ساڵی ٢٠٠٣، (بەرکوتێکی مێژوویی هونەری شێوەکاری لە شاری کەرکوك)، د. فەرهاد پیرباڵ.

٢. (هونەری نیگارکێشانی مێژووی لە کورداو لە جیهاندا تەکنۆلۆجیا، تەکنیك)، وەهبی ڕەسوڵ، چاپی یەکەم، ٢٠٠٦.

٣. گۆڤاری (الصوت الآخر)، ژمارە ١٨٤، ساڵی ٢٠٠٨، (هؤلاء هم جماعة فناني كركوك)، ئەحمەد محەمەد کەرکوکلی.

٤. دۆسێی هەموو شێوەکارانی تایبەت بەم نووسینە.

ئاری بابان و  فەخری جەلال

ئەم وێنەیە لە ساڵی ١٩٧٥ لە ئەکادیمیای هونەرە جوانەکانی بەغدا گیراوە لە ڕاستەوە: موحسین عەبدولقادر و عادل عەلی و تانی عەبدولقادر و ئاری بابان و موعتەسەم ساڵەیی

*** فایەق ڕەسووڵ (تابلۆ ئایکۆنی هاوچەرخ)**

**وەهبی ڕەسووڵ**

گێڕانەوەکانی بیرەوەریی، گێڕانەوەیەکن لە ڕابردووەوە دێن، هاوکات بە ئاگاهێنانەوەی ئەو وردەکاریی و ڕاستی و چیرۆکانەیە کە لەگەڵماندا لەدایکبوون و خۆیان لە ئامادەیی ئەو سەربوردانەدا دەنوێنن کە هاوشانی منداڵێتی و هەندێ لە ساتەوەختە هەستیارەکانی تەمەنیان بوون، لەتەکیاندا گەورەبووین تا لێیانەوە فێربین، ئەو زەمەن و ساتەوەختانەی تێیاندا نیشتەجێین و تێماندا نیشتەجێن، وەك زێدوماڵەکانمان، سێبەرو ساوێری خۆیان خستووەتە سەر بوون و پێکهاتەمان، ئەمە ئەو ساتەوەختە زەمەنیانەن کە هونەرمەند خولیایەکی وەهای لە تەکیاندا دروستکردووە، لەنێو ئەندێشەو دەست و پەنجەکانیدا کردوونییەتە کەرەستەیەك بۆ داهێنان و لەم پێناوەشدا خوێندنەوەیەکی وردو ئارام بۆ پیتەکانی دەکات، تا بگاتە جۆری بیرکردنەوەو ڕوانگەی کارکردن، ئەو لەم میانەدا ڕەوەندێکە و لە گەشتدایە لە کارێکی هونەرییەوە بۆ یەکێکی تر، توێشووەکەی خستنەسەری ئەو هێماو ڕەنگ و گزۆڤانەیە کە هەڵگری تواناییگەلێکن لەسەر کرانەوەو فرە واتایی، وەك بڵێیت هونەرمەند هۆگر بووە بە وەرچەرخانەکانی هێما لەپێناو ئەوەی وەك نوێگەرێك ببینێت و کار بکات؛ ئەمەش ئەوەیە کە تێبینی لە خوێندنەوەماندا بۆ ئەزموونی کارە هونەرییەکانی هونەرمەند فایەق ڕەسووڵ دەکەین.

ئەمە ئەزموونێکە ئازاد لە ئەمێستابوونی خودی هونەرمەند، ئەمێستابوونێکی شوێنکاتی، چوون ئەو وەها دەگەڕێتەوە بۆ ڕابوردوو تا نیگاری دوارۆژێك بکێشێت، بەم گەڕانەوەیەشی بۆ بیرەوەری جێگە (وەك چەمکی شوێن) و ڕابردووی خۆی (وەك چەمکی کات) ئەزموونێکی ناوازەی لەسەر ڕووتەختێکی گریمانەکراو بۆ دیوار ئەفراندووە،

دیوارێك بووەتە ڕوویەکی گەیەنەر بۆ وەرگێڕانی بیرکردنەوەو بیرۆکەکانی.

بەرهەمە بەدیهاتووەکانی هونەرمەند، ئاسەوارگەلێکی هونەریی وەهان کە لێرەدا ڕێگە بەخۆم دەدەم بە بنبادنراوێکی بیناسازیی هزریی ناوزەدیان بکەم، چوون لێکدانێکی بەرزو تایبەتە لەنێوان نیگارو بیناسازیو پەیکەرسازی، لە یەك ساتدا.

رامێنەری ئەم کارانە هەست بە ئامانجێکی بنیادنانی بیناسازی دەکات بە تەکنیکێکی ڕیلیڤی لە بەرگی تابلۆدا، ئەمانە هەمووی لە پێناو خستنەڕووی بیرکردنەوەیەکی هاوچەرخانەی هونەریدا، بیرکردنەوەیەك بە پەرەمووچەکەی نیگاری دەکێشێت، تا چنراوێکی لە ڕوحی خۆی لێ بەرهەم بهێنێت لە ڕێی ئەو هێماو نیشانانەوە کە زادەی بیرەوەرییەکانیەتیو پەخشی ئەو ڕەنگە گوزارشتگەرایانەی پێدەکات، کە بە هێزو راستگویی خود بارگاوین.

هونەرمەند لە کایەی ئەم کارانەیدا، هێوریو هاوسەنگییەکی بەدیهێناوە لەنێوان هەستیاریی خاکەی بەکارهاتوو و ڕاستگویی ڕەنگو ئەو هێمایانەی وەك چەندان مۆناد (Monades)ی تایبەت بەخۆی، هێزی شاردراوەی خۆیان لە ژیانو بیرەوەرییەکانی خودی هونەرمەند وەرگرتووەو پێکهێناوە، بەمەش توانیویەتی وێنەیەکی زیندوو پێچەوانە بکاتەوە، لە ڕابودووی منداڵیو بیرەوەرییەکانی نێو ژینگەو ئەو دەوروبەرەی زێدی منداڵیی تا کامڵ بوونی کەسایەتی ئەو دروست دەکات.

هێماکانی ئەو، خەونەکانییەتی کە تا ئێستای تەمەنی، هەر بە پاراوی ماونەتەوەو کارایی خۆیان لە ئاپۆرەی ژیان لە ڕۆژئاوادا، ون نەکردووە. لەپێناو گوزارشتکردن لەو خەونانە کە گوزارشتکردنە لە هونەرمەند خۆی، پەنای بۆ بەرجەستەکردنیان بردووە، ئەمەش لەبەرئەوەی هونەر تەنیا زمانێکی زیندووی ئەوە کە بۆی مابێتەوەو نەیتوانیبێت لەبیری بکات، مامەڵەیەکی هەمەچەشنەیی لەتەکدا کردوون، چوون گەڕانەوە بۆ ڕابردووو سەرلەنوێ بەرهەم هێنانەوەی، وەك میشێل فووکۆ دەڵێت: (دەرکەوتنەوەو خستنەڕووی بیرەوەری، ئاسەوارگەلێکن لە ڕابردوو). ئەمە گەڕانەوەیەکە پڕ لە وریاییو زیرەکی کە تێیدا هاوشانییەکی دروست کردووە لە ئەمێستاو ڕابردوو و ڕوحی جێگەی بەو ناسنامە مێژووییانەوە بەئاگاهێناوەتەوە کە نوێنەرایەتی دەکەن، چوون ڕاوکردنو گرتنی ڕابوردوو، لێرەو لەوێ، بەهۆی کەرەستەو هێماو گرۆڤە پەخشکەرەکانەوە، مانایەك لەخۆدەگرن، ئەویش مانای پەسەندکردنو وەرگرتنییەتی وەك وزەیەکی داهێنەر، وزەیەك کە لە مێژووی کۆنی خۆیدا توانیویەتی چەندان وردەکاری وەها دابمەزرێنێت کە خاوەن گرۆڤەیەکی سۆزداریی ئەمێستاییو هەردەم ئامادەبن، ئامادەییەك تێیدا توانیویەتی ڕابردووو بەها پیرۆزییەکانی بخاتە نێو ناسنامەیەکەوە کە بوونو ئامادەیی خۆی لەڕێی سەربوردەیەکی شێوەکارییەوە بخاتەڕوو، خستنەڕوویەکی وەها کە خاوەن توانایيەك بێت لە گرتنی شتە ئاشنا و ناسراوەکانو بەخودکردنیان، هەر لەبەر ئەمەیە، دڵی ئەم کەشفە شێوەکارییانە، بەو هێزە گوزارشتگەراییەوە کە خاوەنییەتی، بە توانایی وێناکردنو بۆچوونەکانی هونەرمەند لێ دەدات، زۆری هێماو نیشانەکان بەسایەتییەکی بەخشیوە بە ئاشکرا کردنو ڕوونکردنەوەی کەشفە ڕامانگەراییەکان، لە ئەزموونێکی هونەریدا کە بە پەرتی هەمەچەشنەییەکی کولتووریو ناسنامەیی ژیاوە، سەرباری ئەم خەسڵەتانە لە دووتوێی ئەم ئەزموونەدا، بەڵام بیرەوەرییە بەراییەکانی هێشتا بەئاگا ماوەنەتەوەو خاوەن وزەیەکی ناردنەوەن بۆ هەر شتێك کە بیەوێت بیانخاتەڕووو دەبڕینیان بۆ بکات، وەك بڵێی ئەم ژێدەرە کارایە، کەسێکی وەهای دۆزیبێتەوە کە بتوانێت، خۆ تەرخانییەکیان بۆ بکات لە دوو توێی شێوازێکی گوزارشتگەرای ئەبستراکتییەوە کە هەڵگری وردەکارییەکی تایبەت بێت، لەم ڕێگەیەوە قایل بوونێکمان تێدا بنیاد بنێت بە هاوتەریبی کردن لەتەك هونەری بیناسازیو پەیکەرسازی، بە بوێریی ئەزموونێك لە دەستکاری کردنی کیمیایی ڕەنگو دەرچوون لە بەرەنجامە ئاشناو مەئلووفەکانی کەرەستە.

جەستەی ئەم بەدیهاتووە هونەرییە ئازادە هاوچەرخە، کە قووڵ بە کولتووری کەسێتی هونەرمەنددا ڕۆچووە، دواجار هەڵگری سیماگەلێکە لە جێگەیەکی گریمانەیی کە بژاردەیەکی مرۆڤی هاوچەرخە بۆ خستنەڕووو ئاشکراکردنی نهێنی بوونی خۆی، هەموو ئەمانە ئەمێستا بوونێکیان بەدیهێناوە کە چرە بە هێماو ئاماژەگەلێکی گوزارشتکەر لە هاوچەرخ بوون، بەڵام بەس نەبوونو نین، بۆ بزربوونی کولتوورێکی بۆماوە لە سیماکانی جەستەی جێگەیەکی کۆندا، ئەمانە کارهایەکی هونەرین کە دێرینی ڕابردوویەکیان لە خۆگرتووە، لەڕێی خستنەڕوویەکی ڕووکەشی هێماو نیشانەگەراییەوە، بەڵام لەناوجەرگەی پرۆسێسێکی هاوچەرخ لە هونەردا، لێرەدایە هاوکێشە هونەرییە شاراوەکەی فایەق ڕەسووڵ، کە چەند ڕێگەی نوێی بڕیوە، بەهەمان ئەو وزە نهێنییە داهێنگەرانەوە کە لە ڕوحی ڕابردوودا نیشتەجێن.

هێنانەدی ئەم بەرهەمە هونەرییانە گەیشتنە بە نێوەندێك کە هونەرمەند تێیدا لە هاوکێشە هونەرییەکەی خۆیدا، بە هاوسەنگییەکی تایبەتی گەیشتووە، ئەویش هاوسەنگیی نێوان دوو ئاراستەی (هەستییبوونو هزریبوون)ە لە ڕوانگەی کارکردنی هونەریدا، ئەم دووانەییە کە بوونی دنیای ڕووکەشەکان بەلایەكو دنیای نۆمینۆن (Noumenon) کە دنیای شتەکان لە خودی خۆیاندا بەریەکی تر پێکدەهێنێت، ئەوە نێوەندێکیان پێویستە کە بە یەکتریان بگەیەنێت، بەمەش جوانییەکی نموونەیی بەرجەستە دەبێت کە بوونی خۆی لە لێکدانو پەیوەستکردنەوەی دووانەیی ئەم دوو دنیایە بەدەست دێنێت، (Arnheim. Ruodolf: Visual. Thinking p 101).

هونەرمەند بە بەدیهێنانی ئەم نێوەندە، توانیویەتی ڕاگەیاندنێك بۆ ئەمێستاو جێگە ئەندێشەکراوەکەی خۆی بکات، جێگەیەك کە ڕاستەقینە نییە، بەڵام ئەو وەك زەوییەکی بەڵێن پێدراو بۆ ژیانو خەونەکانی خۆی نیگاری کێشاوە، هەر بۆیە لەمخ دیواری تابلۆو تابلۆ دیوارییانەدا، پەخشی

